# فەلسەفەی سۆفیگەری

# لای



مەولانای رۆمی　　　بن عەرەبی　　　ئیمامی غەزالی

کوردستان – هەولێر-2013

**ناوی کتێب : فەلسەفەی سۆفیگەری لای ئیمامی غەزالی**

**و بن عەرەبی وجەلالەدینی رۆمی**

**نووسینی : محەمەد وەسمان**

**تیراژ:1000 دانە**

**نەخشەسازی:زانکۆ محەمەد**

**تایپ: زریان سابیر و ئاری رەمەزان**

**چاپخانە:**

لەبەرێوە بەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە سپاردنی (228)ی سالی2013 ی پێدراوە.

# فەلسەفەی سۆفیگەری

# لای

**ئەبوحامید محەمەد کوڕی محەمەدی غەزالی**
**( 450ک 505 - ک1058 / ز1111 – ز)**

**و**

**محیّدین محمد کوڕی عەلی بن عەرەبی**
**560کۆچی-638 کۆچی**
**1165 ز- 1240ز**

**و**

**مەولانای رۆمی**
**جەلالەدین محەمەدی بەلخی**
**1207ز-1273 ز**

**کوردستان –هەولێر 2013**

**پێشکەشە بە :**

**ئاشقانی حەق، (ئەوانەی بەتایبەتی ڕێگەی خوایان گرتووەو ژیاننامەیان باشترین ژیاننامەیە، ڕێگەکەیان ڕاستترین ڕێگەیەو ئاکاریان پاکترین ئاکارە).**

غەزالی - (المنقذ) ل 153

**پێشەکی**

- لەم توێژینەوەیەدا سەرەتا باس لەفەلسەفەی یۆنانی کۆن دەکەین بۆئاماژەکردن بەکاریگەرییەکانی لەسەر بیروبۆچوونی بیرمەندان وهزری مرۆیی ،تابە ئەمڕۆش رادەگا.

دواتر دێینەسەر باسی سۆفیگەری وبنچ وبنەوانی وبۆئاماژە کردن بەکاریگەری رێچکەیەکی فەلسەفەی یۆنانی کۆن بەسەر رێچکەیەکی سۆفیگەری ودیدوبۆچوونەکانی .

ئانجا دێینەسەر بەسەرکردنەوەی سێ چرای جیهانی سۆفیگەری ئەبوحامید محەمەد کوڕی محەمەد غەزالی ( 350ك – 505ك ) (1058-1111 ز)و بن عەرەبی (560کۆچی-638 کۆچی 1165م-1240م), وجەلالەدین محەمەدی بەلخی ناسراو بەمەولانای رۆمی( 1207-1273 ز)

وخوێندنەوەی فەلسەفە لای ئەم کەڵە سۆفیگەرانە.

لەدواکایە ئاوڕێك لەئەدەبی سۆفیگەری دەدەینەوە.

- بابپرسین فەلسەفەچییە ؟ سۆفیگەری چییە؟ پەیوەندی نێونیان چییە؟ سۆفیگەری لەسەر چ بنەمایەك دامەزراوە، ئایا بنچینەکەی فاکتێکی زانستییە،ماددییە،بەرهەستە،یا لەسەر گریمانەیەك دامەزراوە،گریمانەیەکی هزری،زەینی ،بنیاتەکەی گریمانەییە، بەگۆڕینی گریمانەکە سەرجەم بنیاتەکە دەگۆڕێت وبنیاتێکی دیکە دروست دەبێت، ئایە بنچینە ی سۆفیگەری کامەیانە؟

بەرنامەی لەبار بۆ لێکۆڵینەوەلەم بابەتە, بەرنامەی مێژوویی شیکاری بەراوردکاریە لەگەڵ رەخنەگرتن لەهەندێ بیروبۆچوون.
ئەم توێژینەوەیە هەوڵدەدات ئەم دوو چەمکی سۆفیگەری و فەلسەفە بخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی رەگ وریشەکانی , ئەو تیۆرییانەی لەسەری بنیاتنراون شیکاتەوەو فەلسەفەی سۆفیزم بەرەسەن بناسێت.
گرفتەکان:
گرفتەکانی ئەم توێژینەوەیە لەم چەند خاڵە چڕکراونەتەوە:
- نەبوونی سەرچاوەی پێویست تایبەت بەماوەی تێخزانی فەلسەفەی یۆنانی کۆن و ناوەندییەوە بۆنێو ئەوگرووپەی بەسۆفییەکان ناسراون.
- ئەم سێ چرای دنیای سۆفیگەری زاناو سۆفی و عارفی گەورەن سەدانساڵە باس دەکرێن, بەلاّم وەك دەریای بێ بن هەمیشە دوڕ و گەوهەریان لەبن نایەن و ئەم گۆشەیەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بایەخی پێدەدات بازنەو سنوورەکانی باس کردنی ئەم مەزنانەی تەسك کردۆتەوە بۆ بەرچاوخستنی گۆشیەکی دیاریکراو کەفەلسەفەی سۆفیگەرییە لەژیانیاندا.
- نەبوون و دەگمەنی زاراوەکانی سۆفیگەری بەزمانی کوردی, ناچار دەبووین لەنوێوە زاراوەی بۆ داڕێژین –دیارە بەپێی رێساکانی زاراوە سازی کۆڕو ئەکادیمیاکانی زانستی .

**پرۆگرامی توێژینەوە:**

**ئەم كارە لەپێشەكی و چوار تەوەر و ئەنجام وبیبیلۆگرافیای سەرچاوەكان پێكدێت. پێشەكییەكە, پێناسەیەكی چڕی بابەتەكەیە لەمەڕ ناونیشانی بابەتەكەو گیروگرفتەكان وئەو پڕۆگرامەی بۆ لێكۆڵێنەوەكە ەرخانكراوە.**

**دەرووی یەكەم سەبارەت فەلسەفەیە .**

**دەرووی دووەم سەبارەت بەسەرهەڵدان ورەهەندەكانی سۆفیگەرییە.**

**دەرووی سێیەم سەبارەت بەژیان و فەلسەفەی سۆفیگەرییەلای سێ گەورەسۆفییە لەجیهانی ئیسلامیدا.دوا دەروو سەبارەت ئەدەب و سۆفیگەرییە , وەك نموونەی چلە پۆپەی رەنگدانەوەی فەلسەفەلە سۆفیگەریدا.لەم لێكۆڵینەوەیەدا سوودم لەسەرچاوەكانی عەرەبی وكوردی و فارسی وەرگرتووە كەسەرچاوەی رەسەنن,(بەوەرگێڕانی دەقی پەیوەنددار) هاوكات لەو سەرچاوانەی بەگشتی باس لەمێژووی سۆفیزم و فەلسەفە دەكەن.**

**بەو هیوایەی ئەم ئەزموونە هزرو بیرو رۆشنبیری و ئەدەبی كوردی دەوڵەمەندتر بكات بەئاشنابوون بەبەرهەمەكانی ئەم سۆفی و فەیلەسوف و شاعیرە مەزنانە.**

**لەكۆتاییدا بەپێویستی دەزانم. ئاماژە بەوە بكەم كەوا ئەم تۆژینەوەیە لەوپرۆژانەبوو لە وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان ، لە سندووقی كۆمەكی داهێنەران سوودمەند بوو .**

**محەمەد وەسمان**

## دەرووی یەکەم:

### لەبارەی فەلسەفە:

دەگێڕنەوە دەڵێن ئەرستۆ وتوویەتی: دەبێ فەلسەفە هەبێت, هەتا ئەگەر هیچ شتێك نەبوو پێویستی بە فەلسەفە هەبێت, لەبەر ئەوەی پێویستە فەلسەفەمان هەبێت تا بەخەڵك بسەلمێنین کە فەلسەفە پێویست نییە .

فەلسەفە بە واتا باوەکەی واتە رامانو هەڵسەنگاندنی رووداوەکانو قووڵ بوونەوە لە بابەتە هزرییەکان , ئاخاوتن سەبارەت بەبنەماکانی ژیانو رەوشت, گەردوون, باوەڕ, دیاردەکان و چارەنووسی مرۆڤ . . هتد.

گەر سەرنجی ژیانی رۆژانەمان بدەین دەبینین ئاستێکی پێزانین هەیە، مرۆڤ راستەوخۆ لەگەڵ کارکردن بە کەرەستەو بابەتەکانی ژیانی پێیدەگات , کەسانێکی دیکەهەن زیاتر لەم دیاردانە ورد دەبنەوە پەیوەندی نێوان دیاردەکانو هۆکارەکانیان دیاردەخەن بەدوای یاساکاندا دەگەڕێن ،ئەوانەیش زاناکانن.

لەدوای ئەمانەش کەسانێك هەن لەوبنەما هزریانە و یاسا زانستیانە دەکۆڵنەوە ((بیرلە بیری ئەوانەدا دەکەنەوە))، ئەو کەسانەش فەیلەسوفانن ،کە بیر لە بیردەکەنەوە.

کەواتە فەلسەفە بیرکردنەوەیە لەبیر. فەیلەسوفان هەوڵدەدەن ئەم چەمكو بیرو بۆ چونانە پۆلین بکەن لە نێوان گشت وتایبەتدا, لە بنچو بناوانی بگەڕێن, سەرچاوەی پەیدا بوونیان بزانن.

**فەیلەسوفە دەیەوێت بزانێت سەرچاوەی پەیدابوونیان, ئایا گریمانەن, لە خۆڕا, دانراون یاخود سەرچاوەکانیان پێزانینی هەستین, لەرێگای هەستەکانەوە پێزانراون، هەوڵدەدات ئامرازو رێبازی پێزانینیان بزانێت . کەواتە فەلسەفە هەڵکۆڵینە لەو بیروباوەڕو بوچوون‌و زاراوانەی لە نێو خەڵکدا باون بەهەردوو ئاستییەوە، ئاستی ساکارو ئاستی زانستی, دەیانکاتە بابەتی بیرکردنەوەی خۆی , بۆ ئەوەی بنج‌و بناوانی ئەم جیهانبینییە رۆبنێت کە لەسەر زانیاریی زانستیی دروست‌و ئەزموونەکییەوە رۆنراوەو ئامرازێکە بۆ هۆشپەسندایەتی, کە پێوەری شارستانیەتییە, بەڵکو دەکرێ بڵێین بنچینەی رۆنانی ژیارییە. کەواتە فەلسەفە گرنگە, پڕبایەخە ،نابێت فەراموۆش بکرێت. وەك فەراموۆشمان کردووە ودەبێت بەخۆماندا بچینەوە.**

**فەلسەفە لەرابردوودا پێنج بابەتی لە خۆ دەگرت: ژیربێژی (لوجیك- Logic ), ئاکار, رامیاری, میتافیزیك ، ژیر بێژی ئەو زانیاریانەی لەبارەی رێبازی دروست بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەی دەگرتەخۆ , ئاکار لێکۆلینەوە بوو لە رەوشتی تەواوو بەرتکاو زانستی چاکەو خراپە. زانستی پەندیاری (فەلسەفە) وەك سوکرات دەڵێت ((بالأترین زانستە)). رامیاری لێکۆڵینەوە لە هونەری خزمەتکردنی کۆمەڵە بە بالأترین شێوە. میتافیزیك: زانستی بوون‌و چیەتی گیان‌و مایەو پێزانین دەگرێتەوە. ئەمڕۆ فەسلەفە چەندان رەهەندو دوورایی دیکەی بەخۆوە گرتوووەو کاریگەری بەرنامەی زانستی لەسەر فەلسەفە رەنگی داوەتەوە .**

سەبارەت بە روانینی فەلسەفەی دروست, هەندێك دەڵێن: روانینی نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) یە , واتە وەك لای چەند فەیلەسوف ێك وایە بیری پوخت (رەها) لە پێشترە لە ئەزموونی هەستەكان, واتە بەرایی دەدەن بە بیری رەها.

هەندێكی دیكە دەڵێن ـ روانینی بوونخوازییە, بەو واتایەی كەوا: مرۆڤ ئازدی بڕیاردانی بۆدابینكراوەو لەبەر ئەو هۆیە, لەرووی ئاكارییەوە بەر پرسە. مرۆڤ هۆكارەكانی دەرەوەی دروستی ناكەن, ئەوەندەی بە خۆی خۆی دروست دەكات. بەو بڕیارانەی – بە ویستی ئازادی خۆی- لە هەڵوێستە جیا جیاكانی ژیان دەیدات .

هەندێكی دیكەش بۆ ئەوەی دەچن كەوا روانینی فەلسەفیانەی دروست ــ ئەو روانینەیەكە زانیاری زانستی دەكاتە بابەتی سەرەكی خۆی , گەواهی هەستەكان دەكاتە یەكەم پێوەری بڕیاردان, بەڕاستو دروست بوون یا بەهەڵبوونیان .

بەم شێوەیە دەبینین راڕەوە فەلسەفیەكانی هەر سەردەمێك , بە وردترین شێوە راستەقینەی ئەو رۆژگارە دەنوێنن, لەم رووەوەكە لە قووڵاییەكان دەڕوانن.

راڕەوە فەلسەفیەرۆژئاواییەكان , وامرۆڤ پێشاندەدەن كەوا لێرەدا (لەجیهاندا) دەست پێدەكاتو لێرەشدا كۆتایی دێت .

پێش پەیدابوونی نەبووەو , دووای نەمانی هیچی نامێنێت . فەلسەفەی ئەم سەردەمەمان دوو رووكارو ئاراستەی بنجیی تێدایە یەكێكیان ئەو یدیكەیان تەواو دەكات.

یەكێكیان بایەخ بە ((زانست)) دەدات لە بنیاتو بەرنامەدا , دووەمیان بایەخ بە ژیانی مرۆڤ دەدات , مرۆڤ وەك تاكێكی بەر پرس , مرۆڤ وەك ئەندام لە كۆمەڵگەیەكی خاوەن مێژوو : هەردوو رووكار ــ وەك دەبینین ــ بوار بۆ ژیانێكی دیكە لەو دیو ژیانی دنیا نادەن, بە مێژووی رابردووی‌و زانستی ئیستایەوە بایەخ بەوە نادات پێش پەیدابوونی ژیان چی بووە , یان دوای لەناو چوونی ژیان چی روودەدات . ئەوەی لەسەر شانۆ لەبەردەمدایە هەموو شانۆنامەكەیە لەدەستپێكەوە تاكۆتایی.

ئەم روانینە فەلسەفیە لەئاكامی زانیاری زانستی لەمەڕ دیاردەكان هاتۆتە دی ,راستە لە كۆڵنانی گرانە , بەڵام راستییەكە ناچارەكییە. لەم ناوەدا كاریگەری بۆ چوون‌و رای كۆن لە ئەفسانەكانەوە وەربگرە تا زانیاری دیكەی نازانستی لە دەروونی زۆراندا كاریگەری ماوەو دەبێتە هۆی پەیدابوونی نائارامی لەبەر ئەوەی لەبری پرسیاری چۆن ؟

كە پرساری زانستە دەپرسن: دواتر چی ؟ كە پرسیارەكەیان بێ وەڵام دەمێنێتەوە لەبەر ئەوەی زانست وەڵامی چۆن ؟ دەداتەوەو چۆنیەتی دیاردەكان دەخاتە روو.

ئەوا ئەم كەسانە هەست بەنائارامی‌و نامۆبووندەكەن ئامانج- ئەو ئامانجەی لە بۆ چوونەكان‌و رایەكان دروست بووە - تووشی نامۆ بوونیان دەكات , وەك ئەوەی لە خۆ دابڕابن . بۆ وەڵام دانەوەی پرسیاری بۆ كاردەكەم ؟ بۆ كێ كاردەكەم ؟ بە بۆ چوونی زانستی ئەوا دەبێ بوترێت بۆ هێنانەدی‌ئاسوودەیی و ئەم بەختەوەرییە ئامانج چی بێت , ئامانج

لێرەدا واتە ئەو مرۆڤە خۆی بەشێکە لەم ئامانجەو وەڵامێکی پوختە بۆ دوو پرسیارەکەو ئەم نامۆبوون‌و نائارامیە دەڕەوێتەوە .
لەبەر ئەوەی مرۆڤ کاردەکات بۆ هێنانەدی بەختەوەری بۆخۆی‌و بۆ مرۆڤایەتی ئەوەش هەمووی وەڵامی ئەو دوو پرسیارەن؛ بۆ کاردەکات ؟ بۆکێ کاردەکات ؟ لەپەراوێزی ئەم پرسیارانە بانگەشەی رووکردنە شارستانیەتی رۆژ ئاوا دەکرێت . ئەم سەردەمە بەهۆکاری نائارامی‌و نامۆبوون دادەنێت‌و ئایین دەکاتە جێگرەوە .
شارستانیەتی رۆژئاوا لە زانست‌و ئامێرەکانی ،لە تەکنۆلۆژیا جیاناکرێتەوە , گەر زانست هەنگاوێك چوە پێش واتە نەکنۆلۆژیا هەنگاوێك چووە پێش , پێچەوانەش راستە . کەدەوترێت زانست پێشکەوت , باش بزانە واتای وایە مرۆڤ هەنگاوێك چووە پێش‌و سوودمەندبوو لە خزمەتگوزاریەکان‌و هەنگاوێکی هاوێشت بەرەو بەختەوەری , کەدەکاتە ئەوەی بڵێیت مرۆڤ پلەیەك بەزر بووەوە ودەوڵەمەندتربوو لە بیرکردنەوەو زانین لەبارەی دیاردەکانی ئاسمان‌و زەوی , ژیان پڕ دەکات بە بەرهەمەکانی هۆشی مرۆڤ لە زانست‌و ئامێرو تەکنۆلۆجیاو هەموو بەرهەمەکانی ویژدانی لەهونەرو ئەدەب .
ئەو بیرمەندەی رۆژ ئاوایی کە رەخنەلە شارستانیەتی رۆژ ئاوا دەگرێت لەبەر هۆکارە نا لەبارەکانیەتی نەك لەبەر زانست‌و تەکنۆلۆژیا , لەبەر خراپ بەکارهێنانیەتی نەك لەبەر خودی زانست‌و تە کنۆلۆژیا , ئەم بیرمەندە دەزانێت زۆر بە ئاسانی دەکرێ راست بێت‌و هەوڵی هێنانەدی بەختەوەری مرۆڤ بدات‌و بەرهەمەکان لەخزمەت مرۆڤایەتیدا بێت

هەڵەی هەرە گەورە لەوە دایە ئەم بانگەشەیە لەولا تێکدا بکرێت کە ئەلف‌و بێی زانست‌و پیشەسازی نازانێت , گومانکردن لەشارستانیەتی زانست‌و سازکاری کە شارستانیەتی ئەم سەردەمەمانە واتای وایە بانگیان دەکەیت بۆ وشکە باوەڕی‌و گەڕانەوە بۆ دواوە , واتای وایە سەردەمی بێ زانستی ساکاری‌و بێ دەزگاو ئامێریان بۆ پەسند دەکەیت واتە دەیانخەیتە هەڵوێستێك یەکجارەکی پێویستیان بە رۆژ ئاوابێت واتە تووشی نەزانی ئاوێتە دەبن, ئامێرو تەکنۆلۆجیا دوورایی رەهەندی دیکە بە مرۆڤ دەبەخشن , چاوی مرۆڤ بە نموونە تارادەیەك توانای بینینیان هەیە , بەلأم بەزانست‌و ئامێری زانستی دوورابیەکان تارادەی پێشکەوتنی ئامێری زانستی دەڕواو بڕ دەکات ... ئەم دوو بۆ چوونە دوو بنیاتی هزری لێك جودان‌و بەیەك ناگەن , بانگەشەی گومانکردن لە بەهای زانست‌و نەکتەلۆژیا بانگەشەیەکە بۆ وێرانکردنی بەهاکانی شارستانیەتی نوێ ,ولأتە تازە پێگەیشتووەکان لە ئامرازەکانی شارستانی‌و پێشکەوتنیان بێ بەش دەکات . بنیاتی ئەم رێبازە هزرییە فەلسەفیەی کە بانگەوازی بۆ دەدەم , لەدنیای هزردا , بە هەموو سادەیەکەوە ئەمەیە :

گەر لە بواری زانستی دابوویت بە ئاخاوتن‌و باس‌و توێژینەوە ئەوا پێویستە ئەو ئاخاوتنەی دیکەیت لە پراکێزەکردندا لە دنیای هەڵکەوتدا (لەوا قیعدا) شتێك هەبێت قسەکە ئاماژەی بۆ بکات, واتە لەو جۆرە بێت کە دەکرێ ئەزموونی راستاندن - بە راست زانینی - لەسەر بکرێت, کە لەبەر نامەکانی توێژینەوەی زانستدا هەیە . بوارەکانی دیکەی هزری‌و

وێژدانی کە لە زانستەکاندا نییە هەر بوارێك پێوەری تایبەتی خۆی هەیە.

کە دێین ئەم پێوەرە زانستیە لە هەندێ بوارەکانی ئاخاوتن لە جیهانی فەلسەفەدا پراکتیزە دەکەین دەبینین لە جیهانی فەلسەفەدا لکێك هەیە ناوی ((میتا فزیکا))یە یان ((ئەودیو سروشت)) ئەم ناونانەش بەرێکەوت هات , پێکارانی فەیلەسوفی, یۆنانی ئەرستۆ-کەویستیان - دانراو - نووسراو - ەکانی دوای ئەو رێك بخەن‌و بابەتیان بکەن , لەنێو کتێبەکانیدا کتێبێك هەبوو بە ناوی ((سروشت))و چەندان بابەتی دیکەیان بینیەوە کە بەروونی دیار نەبوو سەر بەچ سەرباسێکن , هەر بەرێکەوت ناویان نا ((دوای کتێبی سروشت)) -(میتافیزیك)- بەو ناوە ناوبانگی دەرکردو واتای وشەی (میتافیزیکا) لەوەوە هاتووە.

وەك زاراوە ئەم ناوە بەو تۆژینەوە هۆشپەسندیانە دەوترێت کە خاوەنەکەی دەیەوێت بەدوای بابەتێکدا بگەرێت‌و بەدوایدا بچێت بەرەو سەرچاوە شاراوەکانی کە لەبەر چاو دانین . بۆ نموونە گەر بەدوای ((ئاکار))دا بچین بەرەو رەگەسەرەتاییەکانی کەلەوانەو ە, ئەو شتە پەیدابووە کە بە (ئاکار) ناسراوە, گەر بەدوای زانستەکاندا بچین بۆ ئەو بنەمایانەی لە پیشتیەوەن لە بنچ‌و بناوانی کەلەوانەوە ئەم زانستانەی کەدەیان بینین سەریان هەڵداوە ئەوا تۆژینەوەیەکی میتافیزیکای زانستەکانە .......... هتد, لەتەك ئەم تۆژینەوە میتافیزیکیانە دەشێ فەیلەسوفێك هەوڵ بدات گەردوون هەمووی راڤەبکات , مەبەست لە راڤەکردن لێرەدا ئەوەیە فەیلەسوف ەکە بۆخۆی ((بیرۆکەیێك)) یان

((بنەمایەك)) بەگریمانە دادەنێت , بۆئەوەی دەچێت کەلەبەر رۆشنایی ئەوەوە هەموو لایەنەکانی بوون راڤەبکات , لە خۆشەویستی دۆستایەتیو ئازایەتی , رژێمەکان فەرمان رەوایی , ... بەرەو بالاّ چوون تا بزووتنەوەی ئەستێرە وتەنە ئاسمانیەکان وژیان ومردنو نەمری , ئەم جۆرە هەوڵە ((میتافیزیکا))یە. واتە بۆ ئەوەی دەچێت کەوا ((بنەما))کەی کە گریمانەی کردووە دەتوانێت هەموو شتێك راڤە بکات.
لێرەدا مەسەلەیەکی دیکە دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە, فەیلەسوفێکی دیکە ئەویش بۆی هویە بنەماییێکی دیکە گریمانە بکاتو بەسەرەتای دابنێتو لەبنەمای هاورێکەی بەباشتر بزانێت لە راڤەکردنی گەردوونو بوون , وبنیاتێکی فەلسەفی گەورە لەسەر بنەماییێکی دیکە رۆدەنێت.
جێی ئاماژە پێکردنە ئەم بنیاتە فەلسەفییەی کە فەیلە سوفێك لە بنەمایێکی دیاریکراوەوە رۆیدەنێت, هاو تاو جمکی ئەو بنیاتە بیرکارییەیە کەوا زانای بیرکاری وەك ئیقلیدس لە زانستی ئەندازە دار بنیاتی دەنێت لە هەر دوو حاڵەتدا : بنیاتی میتافیزیکی , وبنیاتی بیرکاری , لەبارەیانەوە دەڵێین دروستن, گەر بینیمان ئاکامەکانی بە دروستی (ئەنجامگری) بەڵگەگری کراون لەو ((بنەما)) یەوە کە لەسەری دامەزراوە لە باری میتافیزیکادا - ولە - بەڵگە نەویستەکان - لەباری بیرکارییەوە - واتە هەربنیاتێك لەم دوو جۆرە دروستییەکەی ناوەستێتە سەر ئەوەی کە یەکچینو دروستە لەگەڵ هەڵکەوتی سروشتی , واتە لەگەڵ واقیعدا, بەڵکو ئەوەندە بەسە کەلە ئەنجامگر ییەکەیدا نەسازی نەبێت. بەلاّم گەر هاتوو

فەیلەسوفەکە وتی بنیاتە میتافیزییەکەی وەسفی گەردوون دەکات لە راستیدا هەیە وەك لە سروشتدا هەیە, لەوەدا بەرهەڵستی دەکەین .
 وەك چۆن زانای بیرکاری بەرهەڵستی دەکرێت گەر بڵێت تیۆرییە بیرکارییەکانی لەوەوە سەرچاوەی دەگرێت کە یەکچینە لەگەڵ هەڵکەوتی سروشتیدا, کەواتە فەیلەسوفی کە بنیاتی میتافیزیکییکەی رۆدەنێت, ئەوا لەسەر بنەما یێك رۆیدەنێت کە لە خۆیەوە کردوویە بە بنەمای بنیاتەکەی, هەر فەیلەسوفێکی دیکە بۆی هویە بنیاتێکی دیکە لە خۆوە رۆبنێت. بەم شێوە بنیاتە فەلسەفیەکان فرە جۆردەبن بەپێی ئەو بنەمایەی کە فەیلەسوفە کە هەڵی دەبژێریتو بەپێی  فەیلەسوف   ەکان دەگۆرێت . لێرە واچاکە ئاماژە بەباری ئایین بکەن ئایین بنیاتێکە لەسەر گریمانەیێك رۆنراوە ئەویش دەڵێت ـ ئەم نووسراوە ـ ئەم قسانە , ئەم ئاخاوتنانە,سرووشێکن لەخوداوە نێردراون بۆ پێغەمبەرەکان (د.خ).
بنیاتی ئایینی وەك دەبینین فرە جۆرن بەفرە جۆری ئایینەکان ,ئایین وەك سیستەمێکی باوەرو دەستوورو پەرستنو بنەما سەرچاوەکانی ئەودەقەو روانینی ئەو پێغەمبەرە دیاریکراوە یە بەرامبەر گەردوونو ژیان,مرۆڤ یا وەریدەگرێ و باوەری پێدینیت یان گومانی لێدەکاتو باوەری پێ ناهێنێت . کەواتە بنیاتێکی گریمانە ییە بەگۆرینی (بنەما) کەی هەموو بنیاتەکە دەگۆرێت .
بنیاتی میتافیزیکیش , بنیاتێکی هزرییە چاك چنراوە, وەك بنیاتی بیرکاری گەر فەیلەسوفی میتافیزیکی بنیاتە هزریەکەی وەك وێناییێکی هۆشەکی بخاتە روو, مەرجی ئەوە دانە نێت کەوا راستەقینەی گەردوون

دەنوێنێت ئەوا هیچ بەر پەرچێکی کارکەیمان نییە, ئەوەی تریان خۆی لە خۆیدا هەمان هەڵوێستە بەرامبەر زانستە بیرکارییەکانو راستی ودروستی پابەندە بە پەیوەندییە ئەنجامگرییەکان (بەڵگە هێنانەوە) کەلە نێوان بەشەکانیدا هەن, بەلاّم هیچ پێویستو ناچارەکی نییەکەوا رێك بێت لەگەڵ هەڵکەوتی دەرەوە ,لەگەڵ ماددەی سروشتدا.

کەواتە فەلسەفە لەسەر بنیاتی روانینو رامانێکی مرۆڤێك رۆنراوە یان ئەوەتا راستو دروستەو سوود بەخشە , یان پوو چو بیّ سوودە . لە فەلسەفەدا وەرگتنو راز یبوون یان رەتکردنەوەو هەموارکردن پابەندە بە پێدا چوونەوە بە ئامانجگریو بەڵگە هێنانەوە ژیربێژیانە (لۆجیکی) کە فەیلەسوف لە بەشێکی بنیاتە کەیدا دەچێتە بەشەکەی دیکەی , دواتر پابەندە بە توانستی ئەوەی فەیلەسوف ەکە دەیدات لە راڤەکردنی گەردوونو بوونە وەرەکانی .

فەلسەفە لەوکاتەدا لە کاردایە کە کۆمەڵگە پێکهاتەکانی رۆشبیری بنیات دەنێت بۆ ئەوەی لەچوار چێوەدا خاوەن هزری فەلسەفی بێتو بەدوای هەر پێکهاتەییێکی ئەو بنیاتە دابچێت بەرەو بنجە شاراوەکانی ناخیەوە , یان دەشیّ فەیلەسوف ەکە ئەوەندە ئاسۆ فرەوان بێت هەموو ئەوەی دەوروبەری لەیەك کێشەدا باسی بکات , بۆ ئەوەی بیگێرێتەوە بۆ یەك بنجی هابەشی . بەدەستەواژەییێکی دیکە دەکشێن : فەلسەفە کاریگەریو کارایی خۆی ئاراستەی دیار دە ییێکی دیاریکراو دەکات بۆ ئەوەی سەرەتا سروشتەکەی دەسنیشان بکات , دواتر پەیوەندی بەدیار دەکانی دیکە دیار بکات , کەواتە ــ بەپەیوەست دەبێت دوای پەیدابوونی دیاردەکەوەبێت .

فەلسەفە وسۆفیگەری دوودیاردەی هزریی کۆمەڵایەتین ،بەناوەرۆك وبەرێبازەو میتۆدەوە لەیەك جیاوازن . ئەم دووبابەتە سەرگەرمی دووراستین لەسەر بنەمای لێك جیاواز رۆنراون .
ئینجا ،فەلسەفەی سۆفیگەری ،ئاراستە کردنی توانای فەلسەفییە بۆ بنەماو بنچینەکانی سۆفیگەری ،بۆئەوەی بزانین ئایا لە سەر چی بنەمایەك دامەزراوە ،ئایا فاکتی زانستییە،مایەکییە،لەمایەوە دەست پێدەکات ،یا لە گریمانەوە دەست پێدەکات و بنیاتە هزرییەکەی لەسەر دادەمەزرێنێت . گەر گریمانەکە بگۆری یا لایبەیت و نەیهێڵیت ،هەموو بنیاتەکە ،دەگۆڕێت یا هەرەس دێنێت.
بەهەمان شێوە فەلسەفەی زانست ـ بەنموونە ـ بەپێویست دەبێت زانست لە پێشدا هەبێت , تا فەلسەفەی زانست هەبێت . فەلسەفەی مێژووش بەهەمان شێوە پێویستە مێژوو هەبێت بۆ ئەوە روانگەکەی ئاراستە بکات, بۆفەلسەفەی زمان پێویستە زمان هەبێت بۆ ئەوەی کارابیەکەی ئاراستە بکات , فەلسەفەی بوون پێویستە بوون هەبێت بۆ ئەوەی کارایی ئاراستە بکات , بۆ نموونە بەراوردێك لە نێوان ئەو رستە یە بکە کەواکەسێك دەڵێت لەیلا خۆشی دەوێت , لەگەڵ بیرمەندێك حاڵەتی ئەم کەسە دڵدارە دەکاتە مەبەستی تۆژینەوەو بەدواداچوون بۆ دۆزینەوەی سەرەتای پێکهاتنیو چۆن پەیدا بووە , دەبینیت جیاوازە یان وەك جیاوازی نێوان ئەو دووکەسەیە کە پەرستکارێکی باوەڕدارەو لەژیانی ئایینییەکەیدا دەژییتو فەیلەسوف ێك کەلەبنەماکانو پێکهاتەکانی ئەم ژیانە دەکۆڵێتەوەو رادەمێنێت بۆ ئەوەی ناوەرۆکە شاراوەکەی بخاتەروو ,

دیاردەی ئایینی دەخاتە بەر روانگەو رامانی خۆی بۆ ئەوەی پێکهاتەکەی
لە بنەماو بنچینەو ئامانجەکانی بدۆزێتەوەو بیانخاتە روو .

فەلسەفە چییە :

بەگەڕانەوە بۆ فەرهەنگەکان بۆ بنجی وشەکە واتای (پەند خۆش ویستن)
دێت یاخود (پەندیاری).

فیساگۆرس (582-500 پ. ز)یەکەم کەس بووە کەناوی فەیلەسوف
(Philosophy) ی لەخۆی ناوە واتە (پەندیار) لە باتی نازناوی
(sophon) کە پێی دەوترا , لەبەر ئەوەی -بەلێکدانەوەی ئەو -ئەم
وشەی دوایی فیزو لە خۆبایی بوونی تیایە ,و تەنیا شایانی ئەو خودا
وەندانەیە(الالهە) کە دەیانپەرستن .

ئەوە لە رووی بێژەییەوە لەرووی واتاوە : فەلسەفە تۆژینەوەو گەڕانە
بەدوای بنەما بنچینەییەکانو هەوڵ دانە بۆ دۆزینەوەی چیەتی شتانو
بنـج و هۆو بنۆسەکانیانو پەیوەندی هەندێکیان بەوانی تر . ئەوەی
مرۆڤی هاندا بۆ فەلسەفە وەك ئەرستۆ دەڵێت حەپەسان بوو, مرۆڤ خۆی
لەم بوونەدا بینیەوە , لە دنیایەکی سەیری پڕ گرێو ئاڵۆز . زەوی ,
ئاسمان , ئەستێرەکان ,تەندرووستیو نەخۆشی , بوونو مردن , ئەم
هەموو دیاردانە وای لێ کرد بپرسێت بۆ ؟ چۆن ؟ لەکوێ ؟ بۆکوێ ؟
بەوەش لە گەڕان بەدوای زانین فەلسەفە پەیدا بوو.

**چەمکی فەلسەفە**

**(رەچەڵەکی وشەی فەلسەفە Philosophy گریکییە .لەدوو وشەی گریکی پێکهاتووە (فیلۆ) (philo) (خۆش ویستن , سەرسوڕمان) بەواتای خۆشەویستی یا ئارەزووکردن یا ورووژاندن و وشەی سۆفیا (sophy)بەواتای پەند و حیکمەت،بەواتا خۆشەویستی حیکمەت یا پەندیاری )1 سۆکرات (469-399 پ.ز) (یەکەمین کەسە هەردوو وشەی فەلسەفەو فەیلەسوفی بەکارهێناوە).**

**بنچینەی فەلسەفە:**

**دووشۆرش رێگەیان خۆشکرد بۆ پێکهێنانی چەمکی فەلسەفە بەشێوازی ئەفلاتوون(428-348 پ.ز) و (ئەرستۆ ) (384 – 322 پ.ز ):**

1. **وەرچەرخانی بیر لە خەیاڵی ئەفسانەییەوە بۆ زانستی.**
2. **کاری سۆفستاییەکان یا وەرچەرخانی بیر بۆ بایەخدان بە مرۆڤ.( )**

**ئەفلاتوون(428-348 پ.ز) دەڵێت: فەلسەفە گەڕانە بەدوای راستی بوونەکان و سیستەمە جوانەکەی بۆناسینی داهێنەری یەکەم ،شانازی سەرۆکایەتی کردنی هەموو زانستەکانی هەیە.)( )**

---

[1] 1- فتحی التریکی ، فلسفە التنوع ،دار التنویر ، بیروت – 2009 ،ل25)

[2] 2- مصطفى حسيبة ،المعجم الفلسفي ،ط1 ، داراسامة ،عمان- الاردن ،2009. ل 470.

(ئەرستۆ ) (384 – 322 پ.ز )دەڵێت: فەلسەفە زانستێکی گشتییە و تێیدا بابەتی هەموو زانستە کانی دیکە هەن.([3]) بەگشتی دوو تەوەر یا تیۆر لەفەلسەفەدا هەیە: 1-تیۆری ماتریالی . 2-تیۆری ئایدیالی .([4])

لۆجیك:بە گریکی لۆگیا  واتە تێگەیشتن و قسە و لۆگۆس بەکارهێنان ،واتە (المنگق) لەعەرەبی و ژیر بێژی لەکوردیدا .([5])

لۆجیك لە ئەرستۆوە دەست پێدەکات و سێ بابەتی سەرەکی بۆ دیار کردووە:

1- وێناکردن .
2- بڕیاردان.
3- بەڵگە هێنانەوە.
4-  ئیستدلال .

جۆرەکانی لۆجیك:

1- لۆجیکی بەڵگە هێنانەوە- پێوانەیی (ئیستدلالی): کۆنترین جۆرەو لە ئەرستۆوە دەست پێدەکات.([6])
2- لۆجیکی لێگەڕانەکی (ئیستقرائی).

---

[3] 1–هەمانسەرچاوە، ل 56 ).

[4] د.ابراهيم محمد تركي،ماالفلسفة؟،ط1 ،دارالوفاء ،الاسكندرية –مصر،2007 . ل 19).

[5] (هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 20 ).

[6] 4-د. مهدي فضل الله ،مدخل الى علم المنطق ،ط2 ،دار الطليعة ،بيروت،1979 .)

3- لۆجیکی بیرکاری .

هەرچەند شارستانیەتەکۆنەکانی وەك میزۆپۆتامیاو دۆڵی نیل یاخود شارستانیەتی چینو هندستان لە رێگای ئایینەوە (هیندوسی , بودی , یانی , سیخی) لە هندستانو کونفوشیوسی لە چین , چ لە رێگای ئەزموون یا بیرکردنەوەی فەلسەفی رێکخراو لەم بابەتە دواون, ئەمەی دوایی سەرەتا لە ولأتی یۆنانی لەدوو سەدەی (شەشەمو پێنجەمی —پ. ز) دەستی پێ کرد . - فێرگەی ئایۆنی) (lonian school), یەکەم هەوڵدان بوو بۆ راڤەکردنی جیهان بە زمانی مایەو هێزی سروشتی؛

- تالیس وتی ئاو سەرچاوەی هەموو بوونەوەرانە .
- ئەناکسیمینیس وتی هەوا , نەك ئاو پێکهێنەری هەموو شتانە.
- هیرکلیتسی وتی نەخێر ئاگر یەکەم جەوهەرە گەردوون لەوەوە پێك هاتووە .

- پاشان فێرگەی فیساگوریەتی (phythagoreanism) کە بۆ ئەوە کەوا راستی لە بنجدا بیرکارییە mathematical , ژمارە بنجی هەموو شتێکە , دواتر فێرگەی ئەیلی Eeatic School دەرکەوت کەوتی بوون یەکەو گومانی لە جووڵە یان گۆڕان پەیداکرد تێوری ئەتۆمی( Atomic theory) دەرکەوت , کە بۆ ئەوە گونجاو پێك دێت , گونجاو لەسروشتدا, بەلأم جیاواز لە شێوەو بارستو کێش. فەلسەفە لەگەڵ

سوكرات وئەفلاتوون و ئەرستوو گەیشتە چاخی زێڕینی كە درەوشاوەترین ئەستێرەكانی جیهانی فەلسەفە بوون .( [7] )

پاش ئەرستۆ , ئاشیانەكیەتی (الرواقیە Stoicism)و ئەپیكوریەتی Epicureanism دەركەوتن دواتر لە ئەسكەندەریە , لە میسر لەنیوەی یەكەمی سەدەی سێیەمی زانین ، فەلسەفەی ئەفلاتوونیەتی نوێ Neoplatonism، دەركەوت كە زۆر كاریگەری هەبوو لەسەر بیری ئایینیی چاخەكانی ناوەند (476-1953ز) وسەرهەڵدانی فەلسەفەی مەسیحایەتی لەرۆژئاواو پاشان لەسەر هەڵدانی فەلسەفەی ئیسلامی لە رۆژهەڵات .

ئەوەیش لە ئاكامی گوازتنەوەو وەرگێڕانی بیری فەلسەفی یۆنانیو پێبەست بەبارودۆخی مێژوویی و شارستانی ئەو سەردەمی بەتایبەتی فارابی (950زایین كۆچی دوایی كرد). و ئیبن سینــا (865-925 زاین)و ئیبن روشد (1126-1198), بەتایبەتی كیندی (809-873 زاین كۆچی دوایی كرد), پاشان لەئەوروپا چاخی فەلسەفی نوێ دەستی پێكرد هەر لەسەدەی حەڤدەمەوە تا ئەمڕۆ , ئەم رەوتە بە فەیلەسوفە هۆشپەسندكارانە دەستی پێكرد ئەوانەی هۆش دەكەنە پێوەرو ناوبژیوان .... و كاروانی فەلسەفەبەردەوامە.

---

[7] (د.سەنگەر قادر شێخ محمد ،فەلسەفەی شیعر و شیعری فەلسەفی ،چ.رۆژهەڵات،هەولێر،2012 ،ل 93 ).

**لە نێوان فەلسەفەو زانستدا:**

**فەلسەفە شیکردنەوەی هزری مرۆڤایەتیە , وەك لە دەستەواژەو زاراوەکانو چەمکە کانیان دەردەکەوێت ئەم دەستەواژانەی لەژیانی رۆژانەو لەبوارەجیاجیاکانی زانیندا دەردەکەون . واتە ئەرکی فەیلەسوف ئەوەیە چەمکەکان شیکاتەوەو واتا دیارییکاتو بەدوای بنەماکایاندا بچێت تادوا کایە , بۆ ئەوەی بزانێت لە دوا کایە ئەم چەمكو زاراوانە ئایا لەسەر چاوەدا لەسەر بنچینەی گریمانەیەکی هزری دامەزراون یان لەسەر بنەمایەکی پەیوەست بە هەڵکەوتی ماددیو بابەتەکی ؟ لەم قۆناغەدا دەگاتە ئەوەی بزانێت کە ئایا ئەم قووچەکە هزرییە بنیات نراوە بنچینەیەکی گریمانەیی هەیە یان بابەتی , گەر گریمانەیی بێت ئەوا بەگۆڕینی گریمانە کە سەجەرم بنیاتە هزر ییەکە دەگۆڕێتو قووچەکێکی دیکەی هزری ڕۆدەنرێت جیا لەوەی پێشوو .**

**گەر لەسەر بنچینەیەکی بابەتی ڕۆنرابێت ئەوا لێتۆژینەوە دەکەوێتە ئەستۆی زانایانی ئەم بوارەو فەلسەفە هیچ رایەك لەم بارەیەوە دەرنابڕێت . لەبەر ئەوەی لەم مەیدانەدا (را) رای زانایانە , ئەوان ئامرازی تۆژینەوە یان هویە لە پێنۆڕو ورد بینو زموونگەو کارگەو .... کە فەیلەسوف نیەتی کەواتە فەیلەسوفەکە زاراوەیەك هەڵدەبژێرێت یان دەستەواژەیەك یان چەمکێك یان بێژەیەکی تەوەرەیی بنچینەییو تیشکی دەخاتە سەرو بەدوای بنچینەکانی بەرایی ئەم چەمکە دەگەرێت بۆ ئەوەی بزانێت لەسەر چی دامەزراوە , لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ کەدەپرسێت ئایا بۆچی زانایان ئەم ئەرکە ناخەنە ئەستۆی خۆیان ,**

**وەلامەکەی ئەوەیە , بەڵی زۆر جاران ئێستا زانایانی بوارە جیاجیاکان ئەم ئەرکە دەخەنە ئەستۆی خۆیان وجگە لە لایەنی تایبەتمەندی کارەکەی وەك زانا , چەمکەکان شیدەکاتەوەو زاراوەو دەستەواژەکانی زانستەکەی شیدەکاتەوەو بیر لەبنەڕەت و ڕۆنانیان دەکاتەوە ،ئەوا لەم کاتەدا زاناکە کاری فەیلەسوف دەکاتو فەلسەفەی زانستی دەخاتە روو نەك کاری زانستەکەو فەیلەسوفی ئەم زانستەیە نەك بەتەنیا زاناکەی. زانایان کەدەکەونە شیکردنەوەی زانستەکەیان (چەمكو دەستەواژەو زاراوە تەوەرییەکان زانستەکەیان) لەم رووگەیەدا ئەوان فەیلەسوفن , فەیلەسوفی ئەو زانستانەن . جیاوازی نێوان زاناو فەیلەسوف لە رووکاری (ئاراستەی)کاریان دایە گەر هەندێ پێزانینی دیاریکراو بنچینەی زانستێکی دیاریکراو بێت و کەسێك بێت لەسەر ئەم بنچینەیە فووچەکێکی هزری هەڵنێت یان فووچەکێکی ئەزموونی زانستی هەڵنێت ـ زانایە , بەڵام ئەگەر کەسێك بێتو لەم پێزانینانەوە دەستپێبکات بۆ رووچوون بەناخی ئەم پێزانینانە کەوا لە چی پێکهاتوونو تووخمەکانی کە لەسەری دامەزراون ئەم ئاراستەیە بەرەو ژێرخانی چەمکەکان , پێزانینەکان زاراوەکان , ژیرخانی فووچەکەکان لەبری ئەوەی بەرەو پۆپە بچێت , توخمەبەراییەکان شیکاتەوە کە لێیانەوە پێك هاتووە ئەوەیان فەلسەفەیەو ئەو مرۆڤەش کە ئەم کارەدەکات فەیلەسوفە, لەبواری پێزانینی بەرهەستدا درێژە پێدانی زانستە بەڵام بەرەو خوارەوەو بەرەو بنەماکانیو لەبواری پێزانینی هزری (گریمانەیی) بەرەو دۆزینەوەی گریمانەکانو یەکەم بەردی بناخەی فووچەکە هزرییەکان.**

**فەلسەفەی سۆفیگەری**

**فەلسەفەی یۆنانی**



**فەلسەفە philosophy وشەیەکی یۆنانیە ئەم زاراوەیە لە سەرەتا بەکارهات بۆ واتا ی بلیمەتی و کارامەیی و زانینی بەکارهێنانی ئامێر و بەڕێوەبردنی کاروبار، دواتر بەواتا شارەزاو خاوەن ئەزموون و فرەزان بەکارهات.**

**فیساگۆرس ، یەکەم کەس بوو ئەم زاراوەی بۆ خۆی بەکارهێنا دوای ئەوەی لێیان پرسی تۆ پەندو حیکمەت زانی وتی(نەخێر من پەندم خۆش دەوێت)واتە بە تەوازوعەوە وتی تەنیا کەسێکم پەندم خۆش**

**دەوێت و وتی من پەندیارم، فە یلەسووفم.( )**

**فە یلەسووفان بەوە ناسراون پەندیارییان خۆش دەوێت و بەدوای ڕاستەقینە دەگەڕێین.تایبەتمەندی هەرە بەرچاوی فەلسەفە شیکردنەوەی لۆجیکییە، شیکردنەوەیەکی هۆشمەندیانە .**

**فەلسەفەی پێشی سۆکرات (469-399 پ.ز)**

**ئەو فەیلەسوفانەش کەوا پێش سوکرات، لە تالیسەوە (لەسەدەی شەشی پ.ز) هەتا چورچیاس لە سەدەی چوارەم، ژمارەیان نزیکەی چواردە فەیلەسوف ن: تالیس، ئەنکسیمندریس، وانکسیمانس (فێرگەی میلەتیە)، هێرکلیتس (فێرگەی ئەیونی)، فیساگورس (فێرگەی فیساگۆرسییەکان)، ئەکسانوفان، بارمنیدس، زینون، ملیوس (فێرگەی ئەیلی)، ئەنبادوکلیس و أکسانوفان، بارمنیدس، زینون و ملیوس (فێرگەی ئەپلی)، ئەنکسا گۆراس، بروتاگوراس، گورگیاس..لای یەك خوێندوویانە و فێرگەی هاوشێوەیان پێکهێناوە.**

**ئەوانەی لە ڕۆژهەلأتی جیهانی یۆنانی هاتبوون:**

**لە مەلتیە، ئیفسوس، قولوفون، ساموس، بەرەو ڕاڤەی مادديانە و جیهانی بەرهەست دەچوون.**

**ئەوانە لە ئیلیا لە ڕۆژئاوا هاتبوون زیاتر بایەخیان بەرامان (تأمل) دەدا.**

---

[8] د.عبدالمنعم الحفنی-موسوعه الفلسفه- ل983، بابەتی (الفلسفه).

له دوای ئەم کۆمەڵە فەیلەسوفە سوفستائییەکان و ئەرستۆ رێچکەیەکی دیکەیان بۆفەلسەفە دانا لە بایەخدان بەدەرەوەی مرۆڤ گەڕاندیانەوە بۆ بایەخدان بە ناوەوەی مرۆڤ، لە لێکۆڵینەوە لە سروشت (فەلسەفەی سروشتی) بەرەو لێکۆڵینەوە لە ئاکارو دیالەکتیك (فەلسەفەی زانستی)[9].

نەسازیی لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانی:

چەمکی خودای مەزن لای فەیلەسوفە یۆنانیەکان جیابوو لەچەمکەکە لە ئاینەکاندا، ئەفرێنەری مەزن لای ئەرستۆ و ئەفلاتوون، ئاگاداری هیچ نەبوو، خۆی بۆ مرۆڤان دەرنەخستووە ، لە رێگەی مێژووەوە و گەردوونی دروست نەکردووە، و لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکات کە گەردوون لەناودەچێت، بەڵکو ئەرستۆ دەیوت هزری میسیولۆژی ناگاتە ئاستی فەلسەفە.

لە قۆناخی پێش سوکرات فەلسەفە لێکدانەوە میسیولۆژیەکانی باوی رەت دەکردەوە سەبارەت بەدیاردە سروشتیەکان، پرسیاری گەورە ئەوکات دەیپرسی ئایا ئەو هەموو شتانە لە چی هاتوون؟، ئایا بە بەکارهێنانی یاساکانی بیرکاری سروشت باس بکەین؟

تالیس یەکەم فەیلەسوف بوو رای خۆی هەبوو بۆ لێکدانەوەی ماددی بۆ سروشتی گەردوون و ژیان ,وای لێکدەدایەوە کەوا پەیوەندی بەهێزی

---

[9] الموسوعه الفلسفیه- ل1023.

خوداوەند پێتی سروشت ,خوداوەند پەیدای ناکات بەڵکو بەهۆی ئەوەیە زەوی بە ئاودەورە دراوە....

لەو باوەڕەدابوون سەرەتای شەستەکان بوونێکی بێ کۆتاییە و لەناو ناچێت و بەردەوام نوێ دەبێتەوە.

تالیس (546-624پ.ز) میلەتیە (لەتورکیا), بەوە بەناوبانگە دامەزرێنەری فەلسەفەی یۆنانیە، لەبەر ئەوەی هەوڵیداوە جیهان بەشێوەیەکی هۆشپەسندانە (عقلانی) ڕاڤە بکات، هەموو شتێکی گێڕاوە بۆ ئاو، دەیوت جیهان لە ئاوەوە پەیدابووە و لەسەر ئاو دەژی، واتە ئاو گەوهەری شتانە و بنچی هەموو دیاردە سروشتییەکانە لەوباوەڕەدابوو هەموو شتێك دەروونێکی هەیە، هەتا بەردیش ئەوەتا بەردی موگناتیسی چۆن ئاسن رادەکێشێت کەواتە دەروونی هەیە، بنەمای جووڵە دەروونە، جووڵەش گشتییە کەواتە دەروون گشتییە.

**فەیلەسوفێکی یۆنانی بوو بە ڕاڕەوەکەی سەبارەت بە گۆڕان لە ڕێچکەی سروشتەکیی مایەکیەتی (المادیە - Materialism ) بۆ نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) دەستی پێکرد، لە ئەسینا ژیاو خوێندی لە نێو شاگردە زۆرەکانی ئەفلاتوون‌و ئەنتیسشینۆن‌و ئەریستیبۆس‌و ئەقلیدیسی میگاری بوون. سوکرات هیچی نەنووسی، بەڵام بیرو باوەڕەکەی لە ڕێی نووسینەکانی ئەفلاتوون‌و ئەرستۆ ناسران. بۆ ئەوە چووبوو کەوا تەیمانەی جیهان‌و سروشتی فیزیایی شتان ناکرێ بناسرێت. ئێمەش تەنیا ئەتوانین خۆمان بناسین سقرات ئەم تێگەیشتنەی بابەتی زانینی لەم دارشتنە دەربڕی: خۆت بناسە. مەبەستی باڵای زانین لایەنیی تیۆریی نییە، بەڵکو لایەنی کردەنی ژیانە زانین لای سوکرات بیرە، بیرۆکەی گشتییە. بیرەکان لە ڕێی پێناسەکان دەردەکەون‌و لە ڕێی هەڵێنجان پێی دەگەین. سوکرات خۆی چەندان نموونەی پێناس‌و هەمەکییەکانی تایبەت بە چەمکانی ئاکارەکی (بۆ نموونە ئازایەتی‌و داد). پێشکەش کرد، پێش پێناسەکردنی چەمکێك لە چەمکان گفتوگۆی لەسەر دەکرێ‌و پرسیارەکان نەسازی نێوان گفتوگۆکاران دیار دەکات. بە ئاشکرابوونی نەسازییەکانی زانین درۆ وەلادەنرێ کەچی باری بێ ئارامی هۆش پاڵ ئەدات بۆ تۆژینەوەی راستی هەڵکەوتەکی. سوکرات بەرنامەکەی خوێندنی بەراوورد دەکرد بە (هونەری ڕووبەڕووبوونەوە). بەرنامەکەی لە گفتوگۆکردندا گریمانەی هەڵوێستەکی رەخنەیی بەرامبەر دووپاتکردنەوەکانی لێبڕاوەکی دەکات بە بەرنامەی (گاڵتەکردن) ناسرا ئاکارناسی لەلای سوکرات**

**زانستێکی هۆشەکی بە کارە خراپەکان تەنیا لە نەزانینییەوە دێتە بەرهەم؛ هیچ مرۆڤێك نییە. کە بە خوازی سەبەرستی خۆی خراپ بێت.**
**مەزنترین فەیلەسوفانی یۆنانییە. لە ئەسینا ژیاوە و لەوێ کۆچی دوایی کردووە. سوکرات هیچی لەدوای جێنەماوە، تەنیا شاگردەکانی شتیان لەسەر نووسیوە ئەرستۆفان لە شانۆنامەی (هەورەکان) باسی دەکات، ئەکسیسنوفون لە (یادگارییەکان) و ((دیالۆگەکان))ی ئەفلاتوون. باوکی بەرد تاش بوو دایکی مامان بوو.**
**سرووتی سەرەکی سوکرات ((خۆت بناسە)) بوو کە لەسەر پەرستگای (دلف) خوێندبوویەوە لاوانی فێری کارامەیی لە ئاخاوتن یان سۆفیا (پەند یاری) دەکرد و فێری گفتوگۆ و بەڵگەزانی دەکردن.**
**تاوانی لەرێ لادانی لاواز و گاڵتەکردن بە(خوداوەند)ەکانی خرایە پاڵ و درایە دادگا و بە ژەهر خواردن بڕیاری لەناو بردنی درا، بایەخی بە ئاکاردەدا، واتە بایەخی بە مرۆڤ دەدا، فەلسەفەی ئاڕاستەی بایەخ دان بەدەروون کرد.**



**پوختە**

فەلسەفە-لە ڕێگای وەرگێڕانی کتێبەکانی یۆنانی، فارسی و هیندی هاتە ناوەوە.  فەیلەسوفانی موسڵمان ڕێچکەی ئەرستۆیان گرت لەزۆربەی بۆچوونەکان.

سەرەڕای ئەوەش فەلسەفە لای موسڵمانان زانستیئاخوتن و بنجەکان (علم الکلام والاصول )و سۆفیگەریشی لە خۆدەگرێت.

سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی را لەسەر چەندان کێشەی ئایینزانی-فقە-رای ئازاد دەربڕین دروست بوو. چەندان فێرگەی جیاجیا دەرکەوتن لەسەر بنچینەی جیاوازی را وەك فێرگەی کوفە، بەسرە، فێرگەی سۆفیگەرییەکانی فەلسەفی لە بەغداو ئەندەلوسی.

دوو را رەوی موعتەزیلە بەسەرۆکایەتی واسل کوڕی عەتا (131ھ مرد)، را ڕەووی (ئەهلی سوننە و جەماعەت)ی لەلایەن ئەبو حەسەنی ئەشعەری (لە 324کۆچی مرد) سەری هەڵدا ، سەرەڕای گرووپە جیاجیاکانی دیکەی وەك :قەدەریەو جوهەمیەو کەرامیەو خەوارج و رەوافیزو قەرامیتەو باتنییەکان زۆربەیان ئاگاداری چەندان لایەنی فەلسەفەی رۆژئاوا بەتایبەتی یۆنانی بوون.

فەلسەفەی ئیسلامی هەوڵدانە بۆ وەرگرتنی ئەوەی لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام دەگونجێت لەفەلسەفەی یۆنانی و رەتکردنەوەی ئەوەی دیکە .

## ئەفلاتوون-Plato



ئەفلاتوون (427-347پ.ز) ناوی راستی، ئەریستوکلیس بوو، ئەفلاتوون نازناویەتی، واتە (تەوێڵ پان)، لە خانەوادەیەکی زانست پەروەر و ئایندار بوو، کە باوکی مرد مێردی دایکی بەخێوی کرد، رووی لە فەلسەفەو دوانکرد، رووی لە نووسینی شانۆنامە کرد، بەڵام کە سوکراتی ناسی شەیدای بوو، هەموو شتێکی جێهێشت و بوو بە شاگردی ئەو.
 فەیلەسوفێکی نموونەیی یۆنانییەو شاگردی سوکراتەو دامەزرێنەری نموونایەتی بابەتیانەیەو دانەری پتر لە سی دەمەتەقەی فەلسەفی یە

(سۆفستایی‌و، بارمنیدس‌و تیتیاتوس و کۆمارو ئیتریش لەو دەمەتەقەیە). ئەفلاتوون بە دیارکردنی روانینی نموونایەتی بۆ جیهان دژی رێنوێنییەکانی مایەکییەتیی وەستاو لەو کاتیدا بەرادەیەکی فرەوان رێنوێنییەکانی سوکرات‌و فیساگۆرییەکان‌و بارمیندس و هیراکلیتسی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی پێوانی راڤەی هەبوون بکات تیۆرییەکی دانا لەبارەی هەبوونی وێنە نەمرەکانی شتان کە ناوی نا (نموونەکان) یان بیرەکان، لەگەڵ هەبووندا یەکی کردن‌و بەرامبەر (نموونەکان) نەبوونی دانا کە لەگەڵ مایەو شوێندا یەکی کردن. بە بیروڕای ئەفلاتوون جیهانی بەرهەست کە بەرهەمی نموونەکان‌و (مایە)یە. شوێنێکی ناونجی هەیە. (نموونەکان) نەمرن (بالآترە لە ئاستی ئاکاری ئاسمانی). کەواتە نەدەزێ‌و نەدەمرێ، هاوگری نییەو لەسەر کات‌و شوێن وەستاوە. ناوەرۆکی جیهانی ئەفلاتوون رێنوێنییەکانی تایبەت بە (جیهانی دەروون)ە کەچی دڵی دەروونناسی لەلای ئەفلاتوون رێنوێنییەکانی تایبەت بە کلێشەگۆڕێ دەروونی کە لە تەندا دەژی دەگرێتەوە. ئەفلاتوون چەشنەکانی زانینی کە لەسەر شتە بەرهەستەکانی جیاواز وەستاوە لەیەك دەکاتەوەو جیاوازییان دەردەخات. زانینی بنجی لە توانادا نییە مەگەر زانینی (نموونەکان)ی بە راستی هەنە چاوگەی ئەم زانینەش یادکردنەوەیە کە دەروونی مرۆڤایەتی نەمر لە جیهانی نموونانی وەبیر دێتەوە کە لێی روانیوە پێش ئەوەی بێتە کلێشەی ئەم تەنە لەناوچووە، زانینی شتە بەرهەستەکان‌و جیهانی دیار دەکەن. نازاندرێ ئەوی هەمانە زانینەکی گوماندارە (شیمانەییە). ئەفلاتوون لە نێوان (نموونەکان)و شتەکانی

بەرهەست بابەتەکانی بیرکاری دانان کە بە زانینی هۆشەکی شی دەکرێتەوە. بەرنامەی زانین (دیالکتیکیە)یە کە ئەفلاتوون بە کردەوەیەکی دوو لاگری تێگەیشت: بێژیاری بەرەو ژوور بە دەرچوون لە چەمکی گشتی بۆ بالآترینیانو بێژیاری بەرەو ژێر دووبارە لە بۆچوونە هەمەکییەکان بۆ چەمکی کە کەمترین هەمەکی هەبێ دابەزێت. لەم کردەوەیەدا هەر (نموونەکان) (بیرەکان)ی تێدایە نەك شتە هەندەکی (جزئی) یەکانی بەرهەست. ئەفلاتوون نوێنەری ئەرستۆکراتییەتی ئەسینی بوو، رێنوێنییەکانی لەبارەی کۆمەڵگە وێنەی دەوڵەتێکی ئەرستۆکراتی نموونەیی ئەکێشێ کە بنکەکەی کاری بەندەییە (گفتوگۆی یاساکان)و دەوڵەت ( فەیلەسوفە – فەرمانداررەکان) فەرمانداری دەکەن، سەربازەکان پاسەوانی دەکەن یان (پاسەوانان) لە پاش ئەوانیش هاوولآتییە ئازادەکان دێن (پیشەوەران)و ئەو دەوڵەتە ئەندێشەییەی ئەفلاتوون نیگاری کێشا بە دەستەواژەی مارکس (1818-1883 ) بەرەنگدانەوەی ئەسینیانەی رژێمی چینەکان داخراوی میسرە، مارکس ئەوەی بەرچاو کەوت کە ئەفلاتوون بە تەواوی لە دەوری دابەشکردنی کار گەیشتووە لە پێکهێنانی شارەدەوڵەت (دولةالمدینة).

رێنوێنییەکانی ئەفلاتوون دەورێکی گرنگیان بینی لە گۆڕانی فەلسەفەی نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) ی پاشە خۆیدا.

گەورەترین شاگردی سوکرات بوو تا کۆچی دوایی کرد لە تەکیدابوو. دواتر لە ئەسینا رۆی.

ئەفلاتوون هەشتا ساڵ ژیا ولاّتی خۆی جێ نەهێشت بۆچەند گەشتێك نەبێت کۆی هەموو شەش ساڵ بوو، سێ ساڵ چووە لای ئقلیدی میگاری-لە میگارا دواتر چووە سراقوسە، ئەفلاتوون لەدەرگای پادشایانی دەدا، بەڵکو یەکێك گوێی لێ رابگرێت سەبارەت بە فەرمانڕوایی دادپەروەرانە.

ئەفلاتوون بوو بە برادەری دیون زاوای پادشا دیونیسیوسی گەورە لە سراقوسە، دیکتاتۆر بوو پادشا لەدیون زویر بوو دووری خستەوە، ئەفلاتوون چووە لای پادشا بۆ چاککاری، پاشا گومانی لێکرد خستیە زیندانەوە، دواتر دایەکەسێك لە ئەجینا وەك بەندە فرۆشتی، بەلاّم یەکێك لە خزمانی پارەکەی دا.

کە گەڕایەوە ئەسینا، لەو ماوەیە زۆربەی جار بیری لە شێوازی فەرمانڕەوایی دەکردەوە.

دواتر دیسان چوەوە سەرا قوسە لەسەردەمی دیونیسیوسی کوڕدا کە لە پاش باوکی بوو بە پادشاو بەدوای گەورە شاعیرو بیرمەندانی دانارد، بایەخی بەجێبەجێکردنی بیرۆکەی ئەفلاتوونی دەدا سەبارەت بە بەڕێوەبردنی دەوڵەت، وەك جاری پێشوو دیسان دژی دیون و ئەفلاتوون کەوتەوە دوژمنکاری.

شەش مانگ دەستبەسەر بوو، دواتر ئەفلاتوون ناچاربوو بەیەکجاری بڕوات. یەکەم قوتابخانەی دایمەزراند ساڵی 370پ.ز بوو. فێرگەکە دەیرِوانییە باخچەو بێستانی ئەکادیموسی پاڵەوان، لەبەر ئەوە ناونرا بە ئەکادیمیا. زەوی و خانووی بۆ بەخشراو شاگردان روویان تێکرد، لەنێوان ئەواندا ئەرستۆ حەڤدە ساڵان بوو رووی لەو فێرگەیە کرد، دوای

دامەزراندنی بەچوار ساڵ، بیست ساڵی تێدا مایەوە، ، خوێندن لە ئەكادیمیا بیست ساڵ دەخایاندیان.
ئەفلاتوون خۆی بۆتەرخانكردوو ژنی نەهێنا، چل ساڵی وانە تێدا وتەوە تامرد.
دوای ئەو قوتابیەكی بەناوی (سیبوسیوس) كە كوڕی خوشكی بوو بوو بە مامۆستای ئەكادیمیا,ئەرستۆ ئەكادیمیای بەجێهێشت.
نووسینەكانی ئەفلاتوون بەپێی تەمەنی جیاواز بوون، سەردەمێك لەژێر كاریگەری سوكرات دا بوو، لەسەر بنچینەی دیالۆگی درامی-ئارەزووە لەپێشینەكەی بۆ شانۆ-دامەزراوە، لەسەر وێناكردنی كەسایەتییەكان بەوردی و بەڕوونی بە سوود وەرگرتن لە تەنزو چیرۆكی سیمبولی وێنە, سوكرات لێرەدا، ئەفلاتوونیانەیە، بەلاَم سەرچاوەیەكە لەسەر چاوەكانی ژیانی سوكرات.
ئەم نووسراوانەی سێزدە دیالۆگن-دیالۆگەكان گەنگەشە و پرسیارن، سوكراتی ئاخێوەر، ئاسایی یەكێك لە سوفستائییەكان، رادەكێشێت بۆدوان، دواتر دەبیات بۆ ئاخاوتنی دیكەی كە لەوەوە پەیدادەبن و دژی ئەون، ئاخێوەر تەنیا ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە، دان بە كۆتاییەكە بێنێت و دان بە نەزانی بێنێت.
بروتا گوارس یەكەم كەس بوو دیالۆگی بۆ گەنگەشە بەكارهێنا لە ئەسینا، بەرنامەی فێری لاوان كرد، بەلاَم سوفتانیەكان بەكاریان هێنا بۆ مەشق كردن لەسەر هونەری بەرهەڵستی و گەنگەشە بەمەبەستی

سەرکەوتن لەسەر نەیاران و دەرخستنی لێهاتوویی و ڕەوانبێژی لەبەر ئەوە دیالۆگەکە دیالەکتیکی بوو.
ئەفلاتوون ئەم دیالۆگەی بەکارهێنا بۆ دەرخستنی واتای دەستەواژەکان و ئەزموونکردنی ڕاستبوونی لەگەڵ خۆی و دیکەش، بەئامانجی گەیشتنە ڕاستی ، لەبەر ئەوە، ناوی نا، بە گفتوگۆی دیالەکتیکی dialectical نەك گەنگەشەیی eristic یان elentic.
لەبەر ئەوەی لەسەر دیالۆگی گریمانە و نەسازییەکان، پلەپلە لەگەڵی دەڕوات، لە گومان، بەرەو زانستی بەڵگەکاری، بەرەو هۆشکاری پوخت، یان پلەکاری لە ئاوێتەوە بۆ سادە، لە ڕواڵەتەوە بۆ گەوهەری، ئاوا تا بەرچاو دەبێت و پێناسە دیاردەکرێت.
چەندان کاری دیکەی لە قۆناخی ناوەندی تەمەنی ئەنجام داون. لەم قۆناخەدا مامۆستا بوو لە ئەکادیمی دا. نووسینەکانی قۆناخی سێیەم، یان بیری کێشەی تایبەتمەند بوون لە لۆجێك، لەبەرنامە، واتا، بوون، لە ئەکادیمی باسیان کرا، تیایدا گەنگەشە ڕێپێدەدرێت و دەخوێندرێت.لەم قۆناخە چەندان بەرهەمی نوسیوە.
گەورەترین لایەنی هزری ئەفلاتوون سەبارەت بە نموونەکان ((تیۆریی نموونەکان theory of from بوو، بە کورتی لە ((خوان)) دەیخاتە ڕوو، دواتر لە (فیدروی) بەوردی باسی دەکات، لە (کۆمار) بەکاری دێنێت و لە ((تیماوس)) بەرگری لێدەکات.
ئەفلاتوون زانین دەگێڕێتەوە بۆ چوار سەرچاوە، یەکەم هەست کردن، زانین هەستەکی هۆیەکییە و پاژەکی و گۆڕاوە، دووهەمیان بڕیاردان

ئەویش بە گومان و تەخمینە، زانینیی گومانەکی دەشێ راست بێت یان درۆ، سێهەم بەڵگە هێنانەوەیی، کە تیایدا وێنە هەستیەکان بەکاردێنێت، نەك وەك بابەتی خۆی .

بەڵکو بەوسیفەتەی ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە واتا گشتییەکان بەرامبەری کە دەیانکاتە بابەتەکانی، بوارەکەی زانستەکانی ژمارەو ئەندازەو ئەستێرەزانی و مۆسیقایە، چوارەم هۆشکارییە، واتە پێزانینی چیەتی پوخت.

بۆ نموونە: کە دەڵێن ((سوکرات فەیلەسوفە))، سوکرات کەسێکی دیاریکراوە لەساڵی 399پ.ز مرد، بەڵام وشەی فەیلەسوف ، سیفەتێکە، دەشێ هەرکەسێك هەیبێت یان نەیبێت- سوکرات هاوبەشی لە فەیلەسوف ایەتی کرد-سیفەتێکی بەردەوامە کاتی نییە، سوکرات نموونەیەك بوو، لەهەموو کەسێکدایە ئەو سیفەتەی هەبێت، لەهەمان کات جیایە لە جەستەکان، واتە چییەتییە (ماهیە)، یان وێنەیە، یان نموونەی فەلسەفەیە (حیکمەت)، کەواتە ئەم (نموونە)یە دەبێت هەبێت بۆ ئەوەی بەکەسێك بڵێین ئەو سیفەتەت هەیە، بەڵام لە جیهانی بەرهەستدانییە، چەمکێکی هزرییە، بەرهەست و بەرجەستەنییە. نموونەش تاکەشتە، لەخۆیدا تەواوەو نەمرە، زانینی نموونەکان فەلسەفەیە، لەبەر ئەوەی زانینی نەگۆڕەکانە.

ئەفلاتوون لەوەوە گەیشتە ئەم ئاکامەی بڵێت:

فەیلەسوفان بەم زانینە (بەزانینی نموونەکان)، بە تایبەتی زانینیی چاکە (نموونەی چاکە یان وێنەی چاکە)، لەهەموو کەس بە تواناترن لە

فەرمانداری کردنی جیهان و ئاڕاستەکردنی بەرەو چاکە، ئەوەی دەزانێت، گەر بەگومانیشەوە بێت، لەوە باشترە کە نازانێت.
ئەو حکوومەتەی فەیلەسوف ان، کە دەزانن، فەرمانداری بکەن (حکوومەتی چاکەخوازی) دەبێت. ئەو حکوومەتەی کەسەکان بە هۆی زیرەکیان هەڵداوێردرێن. بەپێی توانستیان کاریان پێدەسپێردرێت.
تیایدا فەیلەسوف ەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت، لەسەر رەفتارەکانیان، لەبەر ئەوەی تەنیا ئەوانن ئاگاداری جیهانی نموونەکانن (المُثل)، زانینەکەش لەنێو خۆیان ئاڵوگۆڕدەکەن. زانینی زۆربەی خەڵك تەنیا زانینی هەستییە، چینی دوای خەڵکە رەشۆکییەکەش، زانینی بەرگومانە. هەرسێ چینەکە سوپا، گەل، فەرمانداران، تا هەژدە ساڵی بەهەمان شێوە پەروەردە دەکرێت، دواتر جیادەکرێنەوە ئەوانەی جەستەیان بەهێزەو ئامادەگیان هەیە بۆجەنگ، مەشقی سەربازی و وەرزشی جەستەیی دەکەن.
کە دەگەن بە بیست ساڵی هەرە زیرەکە کەیان لێ هەڵدەبژێردرێت بۆ خوێندنی ژمارەو ئەندازەو ئەستێرەزانی و مۆسیقا.
پاسەوانان بەڕێوەبردن و بەرگرییە، نێرومێن بەیەکەوە دەژین و خواردن و خواردنەوەیان بەیەکەوەیە، پێویستمان بە زێڕو زیو نییە خاوەندارەتیان لێ قەدەغەیە، خێزان دروست ناکەن، هاوسەرگیریان کۆبەشییە (مشاع)، منداڵەکانیش دەوڵەت بەخاوەنیان دەکات.

بەرهەمهێنانیش کاری کشتکاران و بازرگانان و پیشەسازانە، خاوەن شت و خاوەن خێزانن، بەلاَم خاوەنداریێتی سنووردارە، باجیان دەخرێتەسەر بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار کەم بکرێتەوە.
کە پاسەوانانەکان دەگەنە سی ساڵی، ئەوانەی چاکەو شکۆداری و بێهێزی هەوەسکاریان جیادەکرێنەوە بۆ ئەوەی فەلسەفە بخوێنن، و بەڕێوەبەرایەتی بکەن. گەر گەیشتن بە پەنجا باشەکانیان بەرز دەکرێنەوە بۆ پایەی پاسەوانی تەواو، ئەوانیش ئەو فەیلەسوف انەن کە لە دیگای هۆشەکیدا بالاَ دەستن، دەتوانن وێنای یاسا دادپەروەرییەکان بکەن بەشێوەیەکی زانستیانە و فەرمانداری لەنێو خۆدا ئاڵوگۆڕ بکەن.
ئەم نموونە بەرزەی (حوکمی دادپەروەری) لەهزرو بیری مرۆڤایەتیدا کاریگەر بوو.
دواتر لە ((یاساکان)) هەندێ لەو بۆچوونانەی هەموارکرد، دانی بەوەنا کەوا (دەستەبژێرەکان) دەکرێ ببنە خاوەن شت و خێزان، چینەکانی خواروو هەندێ دەستەلاَتی سیاسی پێدان و هەندێ مافی بۆدانان.
ئەم چینبەندییەی ئەفلاتوون لەو بۆچوونەوە هاتوو کەوا دەروون دەکاتە سێ هێز: ئاخێوەری، تووڕەیی، هەوەستکاری، سێ چینەکەش بەیەکەوە پێکدێنن وەك دەروونی مرۆڤ.
ئەفلاتوون لەو باوەڕەدابوو دەروون سادەو نەمرە، پێش لەدایك بوون هەیە و دوای مردن دەمێنێت، گیانییەو تەنیا لە جیهانی گیانیدا دەتوانێت لە مادده رزگاری بێت. چاکە خوازی سێ جۆرن بەرامبەر سێ هێزەکانی دەروون.

- پەندیاری (فەلسەفە) چاکەی هۆشە.
- ئازایەتی چاکەی توورەبوونە.
- پاکدامەنی چاکەی هەوەسکارییە.

لەوەشدا هاوسەنگی هەیە، هاوسەنگی دادپەروەرییە، دادپەروەریش حاڵەتێکی چاکەیە لە ئاکامی هاوسەنگی پەندیاری ئازایەتی داوێنپاکی لە تاکدا پەیدادەبێت. ئەم چاکەیەش بڵاودەبێتەوە لە رەفتاری چاکەو خوازداو بە دادپەروەری بەختەوەری دابین دەبێت.

دەروون لە پەیوەندی بەجەستەوە لەگرژییەکی بەردەوام دایە، لەبەر ئەوەی جەستە وەك ئەو کۆت و بەندەوایە کەوا رێدەگرێت لە رەهابوونی بەرەو جیهانی نموونەکان، و ژیانی راستەقینە.

زوهدیش رێگای رەهابوونی دەروونە لە کۆنترۆڵی جەستە. مردنیش بەیەکجاری ئازادوو رزگاری دەکات.

لەبەر ئەوە فەیلەسوف لە ژیاندا هەوڵدەدات خۆی رزگاربکات لە جەستە (بەپێی توانا) و لەگیانگەرایدا بژێیت.

(تێبینی دەکەیت ئەم بۆچوونە ئەمرۆ لەگەڵ سۆفیگەری سەدەکانی دواترنامۆ نییە )پەیامی هونەر چاکەو راستی و جوانی دروست بکات، پەیامی فەلسەفە لە چاکە راستی جوانی دامێنێت. هەموو فەیلەسوفانی موسڵمان کاریگەری ئەفلاتوونیان لەسەرە، تێکەڵ بە کتێبەکانیان بووە، بەرچاوترین کاری ئەفلاتوون دامەزراندنی ئەکادیمیا بوو لەساڵی 387پ.ز وەك سکەیەکی هزری فەلسەفی بیرکاری، تالەلایەن چستنیان لە 529پ.ز داخرا.

ئەرستۆ (384-322پ.ز) هەرچەندە قوتابی ئەفلاتوون بوو، بەڵام رای جیاوازیان هەبوو لە ژیانی و مردنی ئەفلاتوونیش. لە ئەکادیمیا دەرچوو، فێرگەیەکی سەربەخۆی دامەزراند لە (لوقیون)، بایەخی بەزانستی سروشتی دا، دواتر دوو فێرگەی دیکەش پەیدابوون ئاشیانەکییەکان (ریواقیەکان)و ئەپیکۆرییەکان.

ئەرستۆ دوای حەڤدە ساڵی خوێندن لە ئەکادیمیا ئەسینای بەجێهێشت چوو بۆ (ئەسوس) لە تورکیای ئێستا، زۆربەی نووسینەکانی سەبارەت بە ئاژەڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوەیە.

لە نزیکەی 342پ.ز فیلیب پادشای مەکدۆنیا بانگی کرد ببێتە مامۆستا و پەروەدەکاری کوڕەکەی ئەسکەندەری گەورە، سێ ساڵ لەوکارەیدا مایەوە. دواتر پێنج ساڵ لە جێ لەدایکبوونی (ستاگیرا)ی سەرووی یۆنان، مایەوە. لە 335پ.ز هاتەوە ئەسینا.

لە نزیك یاریگەی بە ناوی **lyceum** فێرگەی دانا، هەر بەو ناوەش ناسرا، ئەرستۆ راڕەوێکی  هەبوو لەم فێرگەیەدا وانەکانی تێدا دەوتنەوە، وای لێهات فێرگە ناونرا فێرگەی رۆیاران (المشائین) **peripatetic school** ئەرستۆ و پێکارانی ئەوانەی بە رۆیاران (المشائین) ناسراون **peripateties** .

دوای دەساڵی وانە وتنەوە تا ئەسکەندەری مەقدۆنی مرد، نەیارانی تاوانی خوانەناسیان خستە پاڵ و ویستیان بیکوژن، خێرا لە ئەسینا رایکرد وتی ((پێویست نییە دەرفەت بدەمە ئەسینییەکان تاوان دژی فەلسەفە بکەن)) مەبەستی لەناوبردنی سوکرات بوو.

چووە (خلكیس) لە دورگەی ئوبا، پاش ساڵێك لە تەمەنی (62)ساڵی مرد.
بەگشتی ئەرستۆ: بەسێ قۆناخ دارەتبووە:
یەكەم پێش 347پ.ز بەگەرمی بەرگری لە ئەفلاتوونیەتی دەكرد باوەڕی بە تیۆری نموونەكان هەبوو.
باوەڕی بەتیۆری ئەفلاتوون هەبوو سەبارەت بەگیان.
قۆناخی دووەم: لە 347تا335پ.ز، دژی ئەفلاتوون وەستا، رەخنەی لە تیۆری نموونەكان گرت، كتێبە بەناوبانگەكەی (لەبارەی فەلسەفە)ی سەبارەت بەم مەسەلە نووسی.
قۆناخی سێیەم: دوای 335پ.ز تیایدا رووی لە توێژینەوەی زانستی ئەزموونەكی كرد زانین لای ئەرستۆ، تیۆری و پراكتیكی یە، و بەرهەمەكییە. زانین دابەش سەر فەلسەفە و سرووشت و بیركاری دەكات. زانینی پراكتیكی دابەش سەر ئاكارو سیاسەت و چالاكی دیكە دەكات.
ئەرستۆ لۆجیكی بەئامراز organon دانا بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی، ناوی دانا زانستی شیكاری لۆجێكی analytics زاراوەی لۆجیل logic بەواتای نوێیەكەی لە لایەن ئەسكەندەری ئەفرودیس لە ساڵی 200زاین بەكارهات.

گوتەكانی (مقولات)ی ئەرستۆ (دە)ن:

- كاكل (جوهر) وەك (پیاو).
- چەندەتی (كمیە) وەك (سێ بست).
- چۆنەتی (كیفیە) وەك (سپی).

- خستنەپاڵ (الاضافة) وەك (نیو).
- شوێن (المكان) وەك (بازاڕ).
- كات (الزمان) وەك (دوێنێ).
- بار (الوضع) وەك (دانیشتوو).
- حاڵەت (حال) وەك (بێ چەك).
- كاریگەری یان بەركاریگەری (الفعالیە) وەك (تووڕە).

**ئەرستۆ لە قۆناخی یەكەم هەستێكی ئایینی دایگرتبوو تاو ئەرادەی سەرباری پەسندكردنی ژیانی فەیلەسوف ان، هەست بە نائومێدییێكی لە ژیان تێدابوو دەڵێت: باشترین شت ئەوەیە لە ژیان .([10])**

**دواتر لە چاكە كاری جیهان نائومێد دەبێت، ئەو یەكبوونەی دەروون (گیان) بەجەستە بە ئەشكەنجە دانی دەنێت، وەك چۆن هەندێ رێگرە (ئەترورییەكان) دەیانكرد مردوو و زیندوویەكان لەیەك دەبەستەوە، رووبەڕووی یەك (التمهید، ب10)(هەمان سەرچاوە).**

**ئەرستۆ بە نووسینەكانی سەبارەت بەسروشت رۆڵێكی گرنگ و بنچینەیی هەبوو لە پێكهێنانی هزری رۆژئاوایی ئەمڕۆ. ئەرستۆ بنچینەكانی توێژینەوەی زانستی لەیەك جیادەكاتەوە.**

**سروشت، زانستی بیركاری لەلایەك، زانستە بایلۆژییەكان لەلایەكی دیكە.**

[10] 1- اودامس: الشذرة6 معجم الفلاسفة- جورج طرابيش ل54.

چەند نووسینێکی ئەرستۆ هەر لەسەدەی پێنجەمی زایینیەوە کرانە سریانی، لەم ڕێگایەوە گەیشتنە عەرەب هەر لەسەرەتای سەدەی نۆوە دەستکرا بەوەرگێڕان و وانە، هەتالای یەهوودی یەکانی میسرو فەلەستینیش ئەم بزووتنەوە هەبوە، لە رۆژئاوا لەسەدەی دوازدەوە زانایان دەقەیۆنانیەکانیان بایەخ پێدا و فەشە تۆمای ئەکوینی بەکاری هێنا.

یەکەم کتێبی ئەرستۆی کەوەرگێڕدرابێت ئاسمان و جیهان((السماء والعالم)) بوو لەلایەن (یوحنا البطریق) ساڵی 200ه، حنین کوڕی ئیسحاق لە 260دیسان وەریگێڕایەوە. ئەرستۆ لەسەردەستی حنین و کوڕەکەی ئیسحاق لە 298ه، ناسرا.

ئیبن ناعیمەی حمس لە 220ه (ئەنتولوجیا)ی وەرگێڕا کە دەسکاری کراوە.

ئیبن موقەفەع و کوڕەکەی محەمەد چەند کتێبێکیان وەرگێڕاوە وەك ئورگانونی، کتێبی شیکاری بەرایی و کتێبی لۆجیکی فورفوریوس.

## ئەرِستۆ\ أرسطو
## Aristotle /Aristote



له دەوروبەری (384 – 322) پێش زایین، فەیلەسوف و زانایەکی زانیارستانخواز(موسوعی ) بوو، دامەزرێنەری زانستی ژیربێژی (لوجیك- Logic ) بوو لەگەڵ چەندان لکی دیی تایبەت به زانیاری. مارکس (1883-1818 ) به (فەیلەسوفی چاخه دێرینەکانی)ی ژماردووه، له (ستاگیرا) له (تراکیا) لەدایك بووه.

له فێرگەی ئەفلاتوون له ئەسینا پەروەردە بووه. ( رەخنەی له تیۆری ئەفلاتوون گرت که لەبارەی وێنه جوداوازەکان (نموونەکان) بوو، بەڵام نەیتوانی به تەواوی بەسەر نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) ی ئەفلاتوون زاڵ بێت. له نێوان (نموونایەتیو مایەکییەتی)دا دەهاتو دەچوو) . (لینین بەرگی 38 لاپەڕه 286).

فێرگەی تایبەتیی خۆی لە ئەسینا دامەزراند (لۆکیوم – Lyceum). ئەرستۆ لە فەلسەفەدا چەند لایەنێکی لە یەك جیا کردەوە:

1) لایەنی تیۆریی کە لەبارەی هەبوونو پێکهاتنو بنۆسیو بنجەکانی ئەدوێ.

2) لایەنی کردەنی کە چالاکیی مرۆڤ دەگرێتەوە.

3) لایەنی هۆنراوەیی کە داهێنان دەگرێتەوە.

لای ئەرستۆ بابەتی زانست گشتییە، کە دەتوانین لە رێی هۆش پێیگەین. لەگەڵ ئەوەشدا گشتی نییە هەر لە هەندەکی (جزئی) یدا نەبێت بە رێبازێکی هەستەکیی پێیدەزانینو هەر لە رێی هەندەکی (جزئی) یدا نەبێت ناناسرێ، مەرجی زانینی گشتیی هەمەکییکردنی لێگەڕانەتییە کە بەبێ پێزانینی هەستەکی ناکرێت.

ئەرستۆ جیاوازیی نێوان چوار بنۆسی سەرەتایی دەرخست:

1) مایە: واتە شیانەتیی نەرێی بوونەتی.

2) وێنە: (چییەتی، چییەتیی هەبوون) ئەوەش هاتنەجێی ئەوەیە کە شیانەکییە لە مایەدا.

3) سەرەتای بزووتنەوە.

4) ئامانج: ئەرستۆ هەموو سروشتی دانا بە دۆخگۆڕانی یەك لەدوا یەك لە (مایە) بۆ (وێنە)و بە پێچەوانەش.

بەڵام ئەرستۆ لە مایەدا تەنیا بنەمای بەرکاریی بینیو هەموو کارێکیشی خستەپاڵ وێنە کە سەرەتای بزووتنەوەو ئامانجی بۆ

گەڕاندۆتەوە، سەرچاوەی هەموو بزووتنەوەیەك خوایە، (بزوێنەری یەكەمی كە نابزوێ). لەگەڵ ئەوەشدا تیۆری نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) ی ئەرستۆ لەبارەی (وێنە) – لە زۆر لاوە – (بابەتی ترە لە نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) ی ئەفلاتوون)، ماوەی دوورترەو متمانەی پترە، كەواتە لە فەلسەفەی سروشت بە زۆری مایەكیەتی (المادیه - Materialism ) ی پترە . (لینین بەرگی 38 لاپەڕە 282).

(ئەرستۆ زۆر لە مایەخوازی نزیك دەبێتەوە)

(سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە 287).

ژیربێژیی وێنەیی لە لای ئەرستۆ پێبەستە بە تیۆری هەبوون‌و تیۆری زانیارو تیۆری راستەقینە، چونكە ئەرستۆ شێوە ژیربێژییەكان لە هەمان كات بە شێوەی هەبوون ئەزانێت ئەرستۆ متمانەی ئاشكراو متمانەی‌شیانەكیی لە یەك جیا دەكاتەوە (سەلماندنی متمانەیی) كە دەچێتە بەر (گومان) لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو شێوەیەی زانین لە رێی زمان بەیەكەوە دەبەستێت . لای ئەرستۆ ئەزموون قۆناغی دوایی نییە لە كردەوەی راستاندنی (گومان) راستیی سەلمێنەكارییە باڵاكانی زانست یەكسەر لە رێی هۆش دووپات دەكرێتەوە نەك لە رێی هەستەكان. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەنەویستە باڵاكان بەر زانین لە رێی دامان لە هۆشماندا نەشاردراونەتەوە بەڵكو پێویستی بە چالاكییە: كۆ كردنەوەی رووداوان ئاراستەكردنی بیر بەرەو رووداوان، ....... هتد. ئەوپەڕی ئامانجی زانست پێناسكردنی بابەتە، مەرجی ئەمەش كۆكردنەوەی نێوان هەڵێنجان (Traduction)و لێگەڕاان (Induction)ە. لەبەر ئەوەی هیچ

بۆچوونێك نییە كە بشێ و هەموو بۆچوونەكانی تری بخرێتە سەر كەواتە ناشێ بۆچوونەكانی جیاواز هەمەكی بكرێن لە یەك دەستەی هاوبەشدا، بەڵام ئەرستۆ گوتەكانی بۆ ئێمە روون كردەوە، واتە گروپە باڵاكانی كە هەموو دەستەكانی دی ئەخرێتە پاڵ ئەو شتانەی هەبوونەكی راستەقینەیان هەیە. لە زانستی گەردوونناسیی (كۆزمۆلۆژیا) ئەرستۆ تیۆری فیساگۆرسییەكانی رەتكردەوە. بانگەوازی راڕەوی (زەوی چەقی گەردوونە) ی ڕاهێنشت. ئەو راڕەوەش هەموو هۆشێكی داگیر كرد هەتا رۆژانی كۆپەرنیك خاوەنی تیۆریی بنەیی خۆر بۆ گەردوون. لە بواری فەلسەفەی ئاكاردا، ئەرستۆ رامانی بە بەرزترین شێوەی چالاكی هۆشەكی دانا ئەم جیاكردنەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ جیاكردنەوەی تەنكاریی كە كۆیلەكان دەیكەن ، لە كاتی بەتاڵا كە كاری بیرەكی تێدا دەكرا لە لایەن مرۆڤی ئازاددا، ئەم جیاكردنەوەش كە شەقڵی دەوڵەتی یۆنانیی بوو كە لەسەر رژێمی خاوەنداریی بەندەكان دامەزرابوو. بەرزترین نموونەی باڵاش بۆ ئاكار لەدیدی ئەرستۆ (خوداوەندە ) تەواوترین فەیلەسوفە، چونكە هۆشێكە لە خۆی دەگات، ئەرستۆ لە تیۆریكەیدا لەبارەی كۆمەڵگە روونی كردەوە كە رەگی بەندایەتی لە سروشتدایە، باڵاترین شێوەكانی دەستەڵاتی دەوڵەت ئەم شێوانەیە كە بەكارهێنانی خۆویستانەی هێز قەدەغە دەكات، ئەم شێوانەی كە دەسەڵاتەكان خزمەتی هەموو كۆمەڵگە دەكات هەڵگێڕو وەرگێڕی ئەرستۆ لە فەلسەفەدا ئەو دوو لا گرایەتیەی دەردەخات كە لە دواییدا شەقڵی كاركردنەكەی بوو، رووكارەكانی مایەخوازیی رۆڵێكی توندیان هەبوو لە پەرەسەندنی بیرە

پێشکەوتنخوازەکان لە فەلسەفەی کۆمەڵگەی دەربەگایەتیدا، بەڵام توخمە نموونایەتی (المثالية ـ Idealism ) یەکان لە چاخەکانی ناوەڕاست لەسەر دەستی پیاوانی کەنیسە فرەوان کران، کە تیۆری ئەرستۆیان کردە (ڕێچکەیەکی فێرگەیی مردوو ئەویش بە رەتکردنەوەی هەموو توێژینەوەکانو هەڵرۆڵانو دارۆڵانەکانو شێوازەکانی دارِشتنی پرسیارەکان) (لینین بەرگی 38 لاپەڕە 368 – 369).

لینین کتێبی (ئەودیو سروشت)ی خوێندەوە (کە بە کتێبی بنچینەیی ئەرستۆ دەژمێردرێت) (زۆر بە چاکی باسی ئەو تۆیە زیندووەی بیژیاریی‌و توێژینەوەکانی سەر بەوی کرد...) هەروەها ئەم باوەڕ ساکارەی بە (هێزی هۆش‌و، هێزی زانیاری‌و توانست‌و راستیی بابەتەکیەتیی) بە چاکە باس کرد (سەرچاوەکانی پێشوو).

ئەفلاتوونیەتی نوێ

## Neoplatonism




**سەبارەت رێبازی ئەفلا توونیزمی نوێ (فیلۆن 20 پ.ز – 50ز)و ئەفلۆتین 205 ز- 270ز) د.حەمید عەزیز دەنووسێت:**

**(هەندێك جار چەند رووداوێكی گرنگی مێژوویی ،چەند ئەنجامێكیان لێ دەكەوێتەوە،كە بەهیچ جۆرێك بەشێك نەبوون لە ئامانج ونیازی رووداوەكان ) .([11])**

---

[11] د.حەمید عەزیز ، فەلسەفەی سەدەكانی ناوەراست لە ئەوروپا ،چ.رۆژهەلأت هەولێر ،2013 .

هێرشە سەرکەوتووەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆسەر ئێران بە تایبەتی و رۆژهەڵاتی کۆن بەگشتی ،ئەسکەندەر لەسەرچاوەفارسییەکاندا بە خاوەن دووشاخ (ذوالقرنین) و لەسەرچاوە ئەوروپییەکانەوەبە مەزن بەناوبانگە .بەدەساڵ (لەنێوان334- 324 پ.ز )ناوچەکانی ئاسیای بچووك و سوریا وولاّتی فارس وبابل وسەمەرقەندوبوخارا وپێنجاب ودۆڵی نیل (میسر)ی داگیرکرد.

ئەم هێرشە بووەتە هۆی ئەوەی هزرو فەلسەفەی یۆنان لەگەڵ ئایین و ئەفسانە وداستان و دەروێشیی رۆژهەلاّت تێکەڵ بێت.

لۆرد رەسل دەڵێت:بابل بەتایبەتی میسۆپۆتامیا (نێوان دووروباری دیجلەو فورات)تاکو هاتنی ئیسلام دەستبەرداری کولتوورو زمانی یۆنانی نە بوون.([12])

یەکێك لەدەرئەنجامەکانی هێر شە سەرکەوتووەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی دروست کردنی شارو فێرگەو ئەکادیمیای جیاجیا لە ئەسکەندەرییەو رەها و نوسەیبین و جوندیساپوربوو کە بوونە سەرچاوەی کرانەوە لەبەردەم کولتوورو فەلسەفەی یۆنانی و قۆناخی هیلنستی دروست کرد.

---

[12] یوسف کرم: تاریخ الفلسفه الاوروبیه فی العصر الوسیگ ،مکتبه الدراسات الفلسفیه ،دارالمعارف بمصر ،1957 ل 2

دەرئەنجامێكی تری هێرشە سەركەوتووەكانی ئەسكەندەری مەكدۆنی و مردنە لەناكاوەكەی وپارچە پارچە بوونی ولاٌتەكەی ،دەرفەت رەخسا بۆ بلاٌوبوونەوەی ئایینی مەسیحی وبنكە وقوتابخانەو ناوەندی ئایینی دروست كران كە دواتر دەبنە ناوەندی وەرگێڕانی كەلەپووری یۆنانی.

**قوتابخانەی ئەسكەندەرییەو(فیلون)**

قوتابخانەی ئەسكەندەرییەكە (لە 30 پ.ز )دروست كراوە ، بەناوەندی رێبازی ئەفلا توونیزمی نویٚ (فیلۆن 20 پ.ز – 50ز)و ئەفلۆتین 205 ز- 270ز) دەژمێردرێت.

ئەنجامێكی ئەوەش بلاٌوبوونەوەی فەلسەفەی یۆنانیی بوو لە ولاٌتەكانی دەوروبەری دەریای ناوەراست.

قوتابخانەی ئەسكەندەرییەكە بەچالاٌكییە فەلسەفییە كەیەوە،قۆناخێكی ناوەڕاستی فەلسەفەی یۆنانی سەدەكانی ناوەڕاستە بەپێشەنگەكانی كایەی فەلسەفی فیلون ،ئەمۆنیوس ،ئەفلۆتین ،فورفۆریوس و بەهەرسیٚ بەشەكەیەوە:

1- فەلسەفەی یەهوودێتی (موسای مەیموون ( 1135 -1204 ز).
2- فەلسەفەی مەسیحی .
3- فەلسەفەی ئیسلامی .

لەم قوتابخانەیەدا فەلسەفەی یۆنانی لەگەلٌ ئایین وئەفسانەو داستانی رۆژهەلاٌتی وبابەتی دەروێشی وئاینی یەهوودی تێكەلٌ و ئاوێتەبوون وپێكهاتەیەكیان دروست كرد لەفەلسەفەی ئەفلۆتیندا رەنگرێژ كراوە.1

فیلۆنی یەهوودی (25 پ.ز-40 ز) بەفیلۆنی ئەسکەندەری ناسراوە هەوڵی گونجاندنی فەلسەفەی یۆنانی داوە لەگەڵ دەقە ئایینیە کانی تەورات .ئەم هەوڵەی دەبێ بە بنەمای گونجاندنی ئایینی مەسیحی و ئیسلام لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانی لەلایەن فەیلەسوفانی ئەم دوو ئاینە .

فیلۆن فەیلە سووفێکی یەهوودییە باوەڕی تەواوی بەتەورات هەبوو ،هاوکات باوەری وابوو فەیلەسوفانی یۆنان بەتایبەتی ئەفلاتوون وئەرستۆ تالیس وئاشیانەکییەکان( ریواقییەکان) گەیشتوونەتە راستی .هەروەها باوەڕی وابووخوداوەند ی موسا لەناخی مرۆڤدا باوەردروست دەکات ولەرێگەی گەوهەرێکی تایبەت پەیوەندی نێوان خوداوەند ی خوداوەند و ماددەی فرەرەنگ دروست دەبێت کە وشەی لۆگۆس( LOGOS ) ە ئەم وشەیە لە مەسیحییەتدا بو(پەری ،فریشتە و گیانی پاك ) و هەڵگرو گەیەنەری پەیام وپەیوەندی نێوان هەردوولا و خوداوەند وستی خۆی پێیان جێبەجێ دەکات.([13])

[13] د.حەمید عەزیز ، فەلسەفەی سەدەکانی ناوەراست لە ئەوروپا ،چ.رۆژهەلآت هەولێر،2013 .

ئەم وشەیەی لۆگۆس(وشە- الكلمة ) لای ریواقییەكان كلیلی كۆنترۆڵكردنی دنیابووە ، كەلەكەرەستەیەكی كۆنەوە بووەو لۆگۆس ئەو ئامێرو ئامرازەبووە ئەم فەرمایشت و خواستەی جێبەجێ كردووە . مادده لەخۆیدا بنەمای بەدكارییە سەرچاوەی شەرە لەش وجەستەی مرۆڤیش گۆڕی گیانە. مرۆڤی ژیریش ئەو كەسەیە گیانی لە ئاسەواری مادده و جەستەی دووردەخاتەوەو بەیارمەتی لۆگۆس لەگەڵ خوداوەند یەك دەگرێتەوە.ئەم بەختەوەرییەش كە یەك بوونە لە گەڵ خوداوەند بە بەهرەیەكی خوداوەند یی پێی دەبەخشرێت .

ئەم لێكدانەوەیەی فیلۆن بۆ پایەی مرۆڤ وپەیوەندی بە خوداوە وشێوازی گەڕانەوەبۆ خودا لای ئەفلۆتین وهەردوو فەلسەفەی مەسیحی و ئیسلامی دەبێت بە مەسەلە سەرەكی فەلسەفە كەخۆی لەم خالآنە دەنواند:

1- كۆنی یانوێیی ئەم كەرەسەیەی جیهانی لێ دا هێنراوە.
2- بوون خۆی چۆن داهێنراوە.
3- لەمەسیحییەتدا خەسڵەتەكانی خودا ، ولەئیسلامدا (سیفەتەكانی خودا).

**ئەفلوتین** (250-270م)( **پلۆتینۆس) افلوطين**

***Plotinus***




**ئەفلاتوونیەتی نوێ ,فەلسەفەی ئەفلوتین و لاگرەکانیەتی لە ئەفلاتوونییەکانی پەیڕەوی بۆچوونەکانی ئەویان دەکرد. ئەفلۆتین دامەزرێنەری ئەفلاتوونیەتی نوێیە، لە شارۆچکەی لیکوبوریس لە میسر لەدایك بووە، لەبیست و هەشتساڵی روویکردە خوێندنی فەلسەفە، دواتر**

**چووه ئەسكەندەریەو یازدەساڵ لای ئەموینوس ساكای خوێندی. دواتر هاوبەشی هەڵمەتی گوردیانووس كرد دژی فورس.**

**دواتر چوو بۆ رۆما، دەستی بە نووسین و وانە وتنەوەكرد، فەلسەفەكەی لەشێوەی یادەوەری دەوتەوە، تا گالینوس و خێزانەكەی بوون بە قوتابی ئەو. كە گالینوس مرد ئەفلوتین بزربوو.**

**فەیلەسوفێكی نموونەیی یۆنانییە دامەزرێنەری ئەفلاتوونیەتیی تازەیە كە سۆفیگەریەتی رێنوێنییەكانی ئەفلاتوونی زیاد كرد، گۆڕانی جیهان لە گۆشەنیگای پلۆتینۆس بە خوداوەند یی دەست پێدەكات كە ناكرێ بزاندرێو دەربڕدرێ (یەك)ێك هەیە كە چاوگەی ناوەوەی هەموو هەبوونە لە سەرەتادا ئەو هەڵدەقوڵێ، وەك هۆشێكی گشتی پاشان وەك خۆی خواو پاشان وەك گیانی هەندەكی، كە مایەش دەگرێتەوە، پلۆتینۆس بە (ناهەبوون)ی دادەنێو بابەتی ژیانی مرۆڤایەتی لەلای پلوتینۆس بەرزبوونەوەیە بۆ ئەم (خوداوەند )یە ئەوەش دەكرێ بە بەندكردنی ئارەزووەكانی لەشو باڵابوونی هێزەكانی گیانی هێزی پێزانینی لەگەڵداو بەدیهێنانی نەفس لەوپەڕی باری سۆزی سۆفیگەری لە كاتی بەرزبوونەوە یەكگرتن لەگەڵ خوا، رێنوێنییەكانی پلۆتینۆس بێژیاری سۆفیگەریەتی پەرە پێدا، بنەمای دژەكانو یەكیبوونیشیانی روونكردەوە،كە رێكیو جوانی ،خراپەو ناشرینی لە جیهاندا دیار دەخات. ئەفلۆتین لەژیانیدا پەنجا وچوار وتاری نووسیوە ،دوای مردنی ئەفلوتین شاگردێكی بە ناوی (فۆرفوریوس) نامەكانی كۆكردەوە و بابەت بابەتی**

**کردن لەشەش بەشی نۆوتاریدا، ناوی نان نۆنۆیی (نۆیانە) (التاسوعات ) لەبەرئەوەی نۆنامەیان تێدابوو.( [14] )**

**ئەم بەرهەمەی ئەفلوتین لەسەردەمی عەباسییەکاندا( عبد المسیح ابن عبدالله ابن ناعمة الحمصي ) کردوویەبە عەرەبی ،هەڵەیەکی لە ناوونیشانەکەی کردووە ونووسیویەتی (ئەتولوجیای ئەرستوتالیس)لاهووتی ئەرستوتالیس . ئەم هەڵە گەورەیە بەسەر زۆربەی فەیلەسوفە کانی ئیسلام رەت بووە ،کندی وفارابی نەك هەستیان بەم هەڵەیە نەکردووە،بگرە فارابی لەهەوڵکی گرنگی فەلسەفی**

---

[14] د.حسام الالوسی ، مدخل الی الفلسفه ،گ . المؤسسه العربیه للدراسات،بیروت ،2005 ،ل 58 .

بەناوی (پێکەوەگونجاندنی بیروڕای هەردوو دانا..)(الجمع بين رايى الحكيمين) ئەم بەرهەمەی بە هی ئەرستۆتالیس داناوە و لەگەڵ بیرو بۆ چوونی ئەفلاتوون بەراوردی کردووە بۆئەوەی نەبوونی جیاوازی نێوانیان بسەلمێنێ .دەکرێ ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە ی ئەفلۆتین بە مجۆرە پوخت بکرێتەوە:

نۆنۆی یەکەم: بریتیەلە قسەکردن لەبارەی مرۆڤ وئاکار .

نۆنۆی دووەم و سێیەم :باسی جیهانی بەهەشت وبەهرەی پەروەردگار دەکات

نۆنۆی چوارەم:دەربارەی نەفسەو کراوە بەنۆبەش-نۆیەم بەش سەبارەت ئەمەیە کەوا ئایا هەموو نەفسەکان تاکە نەفسێك پێکدێنن؟

لەم بەشەدا ئەفلۆتین باسی لەبزووتنەوە (گەشتی)نەفس دەکات بەئاراستەی بەرەو ژێرلە بنەمای یەکەمەوەو بەماددە کۆتایی دێت ئەوەشیان لایەنی میتافیزیکییە.

دواتر بزووتنەوەی سەربەرەو ژوور باس دەکات واتە نەفس و چوونەوەی بۆئەو بنج و سەرچاوەیە کەلێوەی پەیدابووە، گەشتێکە لە جیهانی ماددەوە دەست پێدەکات و بەرەو جیهانی بنەمای یەکەم:ئەمەشیان لایەنی سۆفیگەرییە لە هزری ئەفلۆتیند.

نۆنۆی پێنجەم:دەربارەی پەروەردگارە کەبنەمای نەفسی هەمەکییە.

**نۆنۆی شەشەم:دەربارەی بوونی هەمیشەیی یاجیهانی سەرو سروشت و خوداوەند ی چاکەکارە.**

**تیۆری لێکەوتنەوە (دارِژانەکی)(فیض )**

**بابەتێکی سەرەکی فەلسە فەی ئەفلۆتین ئەم تیۆریەبوو کە وشەی(emanation)ی بۆبەکارهێنا . کەپێوەندی نێوان دنیای سەرووی سروشت و سروشت پێشان دەدات لەڕووی بوونەوە.**

**لەمڕووەوە ئەفلۆتین پێی لەسەر بوونی هەڵکەوت (واقیع )ی گیانی داگرتووە.واتە گرنگی بەپەیوەندی جیهانی ماددەو بەرهەست لەگەڵ جیهانی سەروو سروشتەوەی دەدا.ئەمدید و جیهانیینییەی ئەفلۆتین بووە بە بناخەی بنەمای ئایینی مەسیحی و لاهووتی کاتۆلیکی سەدەکانی ناوەڕاست .([15])تیۆری لێکەوتنەوە (دارِژانەکی)(فیض ) واتە کەوتنەوەی جیهانی سروشتی و ماددی لە بنەمای یەکەم و سەرووی سروشتەوە وەك کەوتنەوەی تیشك لە خۆرەوە بە ویست دانەهێندراوە. ،ئەم لایەنە میتافیزیکییەیە کەلاهووتی مەسیحی لەسەر دامەزراوە ،بەتایبەتی سێ رەگەزەکەی؛(خوداوەند ،هۆش (عقل )،ناوس nous ،نەفس )ئەم گوتانە بوون بە (پەروەردگار و رۆڵەو گیانی پاك) ی مەسیحی .**

**هەمان تیۆری لێکەوتنەوە (دارِژانەکی)(فیض)ی فارابی وبوعەلی سینا گونجاندنی جیهانبینی میتافیزیکی ئەفلۆتینە لەگەڵ ئاینی ئیسلام.**

---

[15] د.کریم متی : الفلسفة الحدیثة ،ط1،دارالکتاب الجدید ،بیروت ،2001 ص 13 .

**تیۆری لێکەوتنەوە (دارِژانەکی)(فیض)ی ئەفلۆتین دەستنیشانی یەکێك لە رێگانی رزگاربوونی دەروون دەکات لەم کۆتوبەندەی تێیکەوتووە، گەرِانەوەیە بۆ سەرچاوەی پەیدابوونی ،سەرکەوتنە بەسەر پلەکانی پەیژەی پەیدابوونی جیهانی بەرهەست وبەرجەستە. لەرێگەی پاك کردنەوەی نەفس ودەروون و دوورکەوتنەوە لە وروژێنەرەکانی هەست و ئارەزوو بۆ ئەوەی بتوانێ وئامادەبێ پلە پلە بەرزبێتەوەو بگەرِێتەوە بۆ باوەشی جیهانی یەکەم و لەگەڵ یەکەم سەرچاوەی بوونی خۆی ئاوێتە بێتەوە و یەك بگرێت، ئەوەشیان رێبازێکی میتا فیزیکی سۆفیگەرییە.**

**لەم رێبازەدا میتافیزیکی سۆفیگەرییە ئەفلۆتینە دا چەند خاڵێك دەست نیشان دەکرێت:**

**1- خوداوەند (خوداوەند ،پەروەردگار.. ) هەمووبوونێکی لێکەوتۆتەوە،بەبێ هیچ ویست و زۆرکارییەك.**

**2- لەرێگای سەرەوژووردا ،کەنەفس دەیگرێتەبەر بۆ ئەوەی لەخوداوەند بچێت خۆی لێ نزیك بکاتەوە .زانینی ژیرەکی ویەیرِەوی دیدی سۆفیگەری ئامانجی بەرزبوونەوەیە و تێپەرِاندنی سنووری سروشتەبەرەو سەروو.**

**3- مادە بەرانبەر فۆرم دادەندرێت بۆیە دەکرێ بوونەوەرێکی سەربەخۆ نەبێت.**

**ئەو بەرهەمە فەلسەفیانەی وەرگێرِدراون بۆ زمانی عەرەبی زۆربەیان بەرهەمەکانی ئەفلۆتین بوون بەتایبەتی مەنتیقییەکان ،وەك :**

ئیزاگۆگی (ئیساغۆجی)ی فورفوریوس وکتێبە چەمکەکان و شیکردنەوەکانی ئەرستۆ بوون .

زۆربەیان بەکاردەهاتن وەك :

1- بایەخ دان بە پێنج هەمەکییەکە (الکلیات الخمس )،وەك بەشێك لە تیۆری زانین.

2- بەکارهێنانی مەنتیق بۆچارەکردنی کێشە لاهووتییەکان.

ئەفلۆتین رابەری ئەفلۆتینیزمی نوێی قوتابخانەی ئەسکەندەرییەیە وقوتابی ئەمۆنیۆس و مامۆستای فۆرفوریوس بوو.

بنچینەی فەلسەفەی لەسەر پەرەدان بەچەمکی چاکەیان خوداوەند ی ئەفلاتوون بوو، ئەو بنەما یان بنۆسی یەکەمە، لەبەرئەوەی بنەمای هەمووشتێکە، جیایە لەهەموو شتێك، هەمووشتێکی لەوەوە هەڵدەرێژرێن (یفیض) کە بەواتای سادەو گونجاوەو گەوهەرە.

لەسەرووی بوونە لەبەرئەوە، شتێکی دیکەی ناخرێتەسەر، لەبەرئەوەی هەرخراوەسەرێك دەخرێتە سەر بوونێك ، خوداوەند  بالآترو لەهەموو بوونێك رەت بووە، هەڵبژاردنی ئەزەلییە، لەوەوە دەردەچن یان لەوەوە ترووسکە دەدەن، دەدرەوشێنەوە، پەرت دەبن و زۆر دەبن لە پەیژەیەکی روو بەرەو خوار بۆ بوون.

بەهۆشی نابەرهەست دەست پێدەکات، دەڕوات بەرەو بەرهەست وکات و شوێن. هەرچەند پێشکەوێت پەرت دەبێت، رووناکی لە خۆرەوەچۆن بڵاودەبێتەوەو پەرت دەبێت تا نامێنێت.

ئەوەشیان نەبوونە، نەبوون دەری بەرهەستە، بەم بزاوتەو جووڵە رووڵەپێشەوە، جووڵەیەکی دیکەو بزاوتنێکی دیکەهەیە بوونەوەران بەرەودوا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو بنەمایە باڵایەی لەوەوە هەڵڕژاوە.
ئاکار ئەم ڕێسایە فێری مرۆڤ دەکات چۆن ئەم ئارەزووە بۆسەرچاوەو ژێدەر تێر بکات. ئەوەشیان زانستێکی دەوێت جیابێت لەزانستی ئاسایی بۆئەوەی بگونجێت لەگەڵ ئامانجەکەی، مرۆڤ دوای پەرت بوون خۆی کۆدەکاتەوە، بۆئەوەی بتوانێت رووبەڕووی پێویست ببێت، لەبەرئەوەی ملکەچ بوون خراپە، پێویستە خۆی بناسێت، بەم زانینەو خۆناسینە، بەشەکانی کۆدەکاتەوە، بەسەر دەروونی زاڵ دەبێت، پەیوەست دەبێت بەیەکی تاك و تەنیا.
لەبەر ئەوەی یەکێکە دیارنەکراوە، بابەتی پێزانین نییە، کەم لە خاوەن دڵەکانی پڕلە رووناکی پێیدەگەن بە توانەوەی هەست لەهەڵڕژانی نەستی خوداوەند یی، یان بە سۆزی سۆفیاتی.
ئەفلۆتین سەرەتای قۆناخێکی دیکەیە کە تێکەڵبوونی ئایین و بیری فەلسەفە یەو کاڵبوونەوەی سنووری نێوان بیری فەلسەفەو ئایین وبابەتە کانی ئەفسانەو داستانە .
دوای مردنی ئەفلوتین، ئەفلاتوونیەتی نوێ ڕێچکەی وی گرت و سۆفیگەریانە بوو.
(نۆیەکان) کرانە لاتینی، هەر لەسەدەی چوارەمەوە سەرچاوەیەکی سەرەکی بوو بۆ بیری سۆفیگەری بۆ کۆمەڵەی ناسراو بە ئەفلاتونییەکانی کیمبردج.

**بەمجۆرە ، بەرهەمەکانی جگەلەوەی لەبارەی فەلسەفەی میتا فیزیکییە (دەکرێ بە پوختەو گەوهەرو کاکڵی سۆفیزم دابندرێت .) ([16])**
**فەلسەفەی ئەفلوتین، هەوڵێك بوو بۆ گونجاندنی نێوان ئەفلاتوون، لە دیالۆگەکانی لەگەڵ ئەرستۆ و فیساگۆرییەکان و ئەرستۆییەکان, ئامانجی رێبەری کردنی خەڵك بوو بۆ رێگای خوداوەند ی کەبوونی پێبەخشیون و هاندەری گەڕانەوەی پێداون و یەکبوون لەگەڵیدا.**
**رۆژهەلاتناسی ئینگلیزی بەناوبانگ نیکلسون کە بایەخی بەجەلالەددینی رۆمی داوەو کتێبە بەناوبانگەکەی ((مەسنەوی)) وەرگێڕاوە و بۆ ماوەی سی ساڵ خەریکی بووە مستر نیکلسون ([17])**
**لەکامبریدج ساڵی 1898 هەڵبژاردە لە هۆنراوەی دیوانی شەمسی تەبریزی کردە ئینگلیزی.**
**لەپێشەکی ئەم وەرگێڕانەیدا ئاماژەبەوەدەکات کەوا( پەیوەندی هەیە لەنێوان (سۆفیە موسڵمانەکان) و(ئەفلاتوونیەتی نوێ) لەئەسکەندەریە.**

---

[16] د.حەمید عەزیز ، فەلسەفەی سەدەکانی ناوەراست لە ئەوروپا ،چ.رۆژهەلات هەولێر ،2013 . ل 22.

[17] R.A.Nicholsen-from the Drani shass-i- Tebriz, cam bridge 1898

و(ذو النون المصری) بەگەوی پەیوەندی دادەنێت بۆئەم کارە. واتە ئەڵقەی پەیوەندی سۆفیگەریە بە فێرگەی فەلسەفە لەئەسکەندەریە. ([18])کەواتە رۆڵی فەلسەفی ئەفلۆتین کۆکردنەوەی بیرو بۆچوونی رۆم و فەلسەفەو زانستی یۆنان و ئایین و ئەفسانەی رۆژهەلأت لە نێو دەفری رێبازێکی گونجاولەگەڵ هەل ومەرجی سەردەمی خۆی ودایڕشتنەوە.

ئەزموونی سۆفیانەی ئەفلوتین:

ئەفلوتین دەڵێت:

(بێگومان پێویستە لەسەرمان لەبارەی بینین نەدوێین ,بەڵکو لەبری ئەوەی لەبارەی بینین و بینەر بدوێین ,دەبی لە بارەی یەکیەتیەکی سادە بدوێین...)

" لاشك أنه ينبغي علينااان لانتحدث عن الرؤى، وانما نتحدث، بدل الرؤية والرائي، عن وحدة بسيطة. لاننا في هذه الرؤية لانميز بين شيئين، وليس هناك شيئان. اذ يندمج الانسان مع الموجود الاعلى ويمتد به.

ففي الانفضال وحدة توجد الثنائية. وهذا هو مايجعل الرؤية تربك الأنباء اذ كيف يمكن للمرء أن يستعيد أنباء الموجود الاعلى كموجود منفصل بينما قدرآه وهو متحد به مع ذاته.. فقد أصبح الرائى واحداً مع المرئى..

اصبحت وحدة لا اختلاف فيما بينه وبين اى شئ آخر وأصبح العقل معقلا

[18] ادوارد جرانڤيل براون: تاريخ الادب في ايران من الفردوس الى السعدي, ترجمة: د.ابراهيم امين الشواربي, مطبعة السعادة بمصر-1373ك-1954م.

مؤقتا وكذلك التفكير، وحتى الذات نفسها عليها الله، فاصبحت في سكوت مطبق وهكذا هدأ الوجود بأسره تلك هي حياة الألهة، او مايشبه الالهة، والرجال المباركين التحرر من كل ماهو غريب يزعجنا هنا-حياة لا تجد أية متعة في الاشياء الارضية. انهما فرار المتوحد الى المتوحد.([19])

ئەم پەرەگرافە بەناوبانگە نموونەیەکی تەواوی ئەزموونی سۆفییانەیەنەك تەنیا لای ئەفلۆتین بەڵکو لای گشت سۆفیگەران :

کە بنچینەی ئەزموونی سۆفیگەری فەلسەفییە لای سۆفیە ئیسلامیەکان-بەشێوەیەکی سەرەکی رەتبوون لە خودو بابەتی خەسڵەتی سەرەکی ئەم ئەزموونەیە، هاوکات جیاکردنەوەی خودی تاك و یەك، خوداوەند ، بەلأم ئەفلوتین دەڵێت: (لیس لدیه ای اختلاف لا فی علاقته بڑاته، ولابأی شیء ئاخر)

ئەوەشیان نەمانی هەر جۆرە جیاوازیەکی ناوەرۆکی ئەزموونەکی وشیاری-ئاگایی دەگەیەنێت, وەسف کردنی ئەزموونەکە سەختە (فهی تربك الانباء ). هۆی ئەوەش لای ئەفلوتین ئەوەنیە بلێ " ئەزموونێکی سەرسورهێنەری وایە ناکرێ لەبارەیەوە بدوێین"

وەك ئەوەی دەکەوێتە خۆشەویستییەوە یان هەر ئەزموونێکی سۆزی دیکە.(ص 135-امام عبدالفتاح امام)

[19] افلوگين- مجموعه مؤلفاته-ترجمه-ستيفن ماكينا- التاسعيه السادسه، والتاسعه.

**هۆكاره لۆجيكييەكان:**

**"گەيشتن بەشتێك واتە لەبەردەمت بابەتێك دەبينيت و دەيپشكنى تايبەتمەندييەكانى دەبينى. ئەم مەرجە لە ئەزموونى (خوداوەند )يى نايەتەدى، لەبەر ئەوەى خاوەن ئەزموون لەگەڵ خوداوەند دا يەكبوون، بێ جيابوونەوە كەواتە گەر وەسف نەكرێت لەوەدايە جۆرە سەختى و دژوارى لۆجيكى هەيە لەوەسفكردنەكەدا.پەيوەست نييە بە توندى سۆزو تاوگيرى,توخمەكانى ديكەى شادى بۆ خاوەن ئەزموونەكەدێنێت دوور لە لێكدانەوە( [20] )**

---

[20] 1- (ص 136-امام عبدالفتاح امام)

**عیرفان (گنۆسیزم Gnosicisme - الغنوسیه)**

**گنۆسیزم لەوشەی گنوسیس gnosis ی گریکی یەوە هاتووە، واتە زانین (عیرفان)یاچاکزانی، بزووتنەوەو ڕێبازێکی فەلسەفی نیمچە لاهووتیی – ئاینییە لەرووی فەلسەفییەوە بیرو بۆچوونەکانی ئەفلاتوون و ئەفلاتوونیزمی نوێ و فیساگۆرس و فیساگۆرسییەتی نوێی تێدایە .**

**بەگشتی سێ جۆر گنوسیس هەن:**

1- **گنوسیسی جوولەکەیی .**
2- **گنوسیسی مەسیحی .**
3- **گنوسیسی بێ ئاینەکان.**
4- **گنوسیەتی دووالیزمی.**

**گنوسیس فەلسەفەیەکی سۆفیگەرییە، نازناوێکە بۆ ئەو ڕاڕەوانەی بانگەواز بۆ ئاینی خوداوەند دەدەن لەرێگای هزربینی (الحدس) نەك لەرێگای هۆش و ئاوەز، بە رێگای دڵ بەڵگە هێنانەوە.**

**رەگی گنۆسێتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسانەکانی هیندی و فارسی لە رۆژهەڵاتدا، لەرۆژئاواش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەفلوتین و ئەفلاتونیەتی نوێ.**

**لە رۆژهەڵات کیومەرسی باوەڕی بەیەزدان و ئەهریمەن هەبوو، دواتر زروانییەکان واتە رۆژگار پەرستان، زروان واتە رۆژگار، دوای ئەوان زەردەشتێتی دواتر دیسانیەتی و مانییەتی (مانی کوڕی فاتك) گروپی**

گنووسی بوون. مانەوییێتی لەسەدەی سێیەمی پ.ز هەتا سەدەی سێزدەم لە بلاوبوونەوەدابوو بنکەی سەرەکی بابل بوو لەو باوەڕەدابوو بنچینەکان سێن: ئاو و ئاگر و زەوی. مەزدەك لە 523م کوژرا.

کە موسڵمانەکان گەیشتنە عێراق لە خوارووی کوفە رووبەڕووی مەندائیەکان بوونەوە، باوەڕی جیاوازیان هەبوو، سابیئەو یەهودیەتیش گنوسێتی هەبوو لەناو جوولەکە بە (قباله) بەناوبانگ بوو لەرێگای (فیلون ی یەهوودی) تێکەڵ بە فەلسەفەی یۆنانی بوو.

زۆر کاریگەری لەسەر یۆحنای ئینجیلی هەبوو مەسیحیش بەپێی گێڕانەوەی خودی ئینجیل یۆحنایی بوو واتە گنووسی بوو.

بەپێی (پولس رەسول) گنووسی تەنیا بۆ مەسیح بوو، لەوکاتەی گنووس زانستێکی خوداوەندییە دەڕژێتە دڵی مرۆڤ ورووناك دەبێتەوە.

گنووسیەتی تێکەڵ زۆر تیم و گروپی جیابوو بوو لەوانە شیعەی ئیمامی و ئیسماعیلییەکان.

مقفع مەزدەکی بوو کتێبی (دبستاو)ی مەزدەکی کردە عەرەبی. لە (کلیلەو دمنە) دەرووی برزەوەی رەخنەی گرت لە بنجی ئایینەکان، سەرەڕای ئەوەش خورەمی، کیسانی، راوەندی، چەندان گروپی دیکە پەیدابوون کە واگنووسێتی رەگێکی پتەوی تیایاندا هەبوو. زانستی ئاخاوتن (علم الكلام) بۆ رەتدانەوەی ئەم گروپانە پەیدابوو.

(گنووسیزمی دوانەتی (دوالیزم)ی: گنووسی کەوتە فەلسەفەی سۆفیگەری یەکێك لە بۆچوونەکانیان (حەقیقەتی (مرۆیی) ...)یە بۆئەوەی دەچوون وگریمانەی ئەوەیان دەکرد کە هۆشی یەکەمە، لەوەوە (نوس) یان

(دەروون) پەیدابوو، دواتر لوگوس یان وشەی لێ پەیدابووە، دواتر ئەنترو بوس یان مرۆڤی تەواو (الانسان الكامل) پەیدابوو دواتر ئایۆنەكان یان بوونەوەرە گیانییەكان پەیدابوون، تا دەگەینە ماددە، بنجی خراپە لە جیهاندا.

حەلاج، سوهرەوەردی، عەین و لقوزاتی هەمەدانی، ئیبن سەبعین، توشتەری، محیێدین بن عەرەبی، لە قوربانیانی گنووسیزم بوون، هەتا بن عەرەبی دەی وت گیانی .... خزاوەتیێ([21])

بەم جۆرە سۆفیگەری دووهێڵی سەرەكی لێكەوتەوە :

1-سۆفیگەری زاهیدانە لەسەر بنچینەی زوهدو قورئانی پیرۆزو سونەت دامەزراوە.

2-سۆفیگەری فەلسەفی بەهەردوو هێڵەوە عیرفانی (گنووسیەتی)رۆژهەلاتی و گنووسیەتی رۆژئاوایی كە رێچكەی لەسەر ئەفلاتوونیەتی نوێ دامەزراوە.

---

[21] د. عبدالمنعم الحفنی-موسوعه الفلسفه-.. ل934-936.

**فەلسەفە لەچاخەکانی ناوەڕاست:**

چاخەکانی ناوەند لە فەلسەفەدا دەکەوێتە نێوان سەدەی نۆیەم و سەدەی چواردەم. لەم چاخانەدا باوەڕبوون بە ئایین باو بوو.

ئامانجی فەلسەفە پتەوکردنی لایەنی باوەڕداری بوو لای مرۆڤ.

وەك لە ئەوروپا بەهەمان شێوەو لە وڵاتانی ئیسلامیدا ئەم کارە هەبوو، هەوڵەکانی گونجاندن لەنێوان ئایین و فەلسەفە لەئارادابوو.

لەهەردوو لادا فەلسەفەی یۆنانی دەخوێند، ئەوروپا بایەخی بەراڤەو لێکدانەوەی موسڵمانان دەدا سەبارەت بە ئەرستۆ، لەپێشەوەی هەموان ئیبن روشد.

لەو بابەتانەی فەلسەفە لەوکاتیدا داڕشتنەوەی فەلسەفە ئەقلییەکان بوو بەشێوەیەك دژی ئایین نەبێت. ئبن روشد لە رۆژهەڵات و قەشە تۆمای ئەکوینی لە رۆژئاوا نیشانەی ئەم چاخەبوون.

لە رۆژهەڵات موعتەزیلییەکان هەبوون لە رۆژئاوا فێرگەی تور، لەلایەن ئەلقونیسی (860مرد) دامەزرا.

چاخی ناوەڕاست چاخی وەرگێڕانی نووسراو یۆنانیەکان بوو.

هەر لەم چاخەدا سۆفیگەری باوبوو لە رۆژهەڵات و لە رۆژئاوا.

هەر لەم چاخەدا رێچکەی زانستی ئەزموونگەری دامەزرا لەسەر دەستی ئوکامی، کە بنچنەی پەرەسەندنی زانستی دانا.



### کیندی، *Al-Kindi*، الکندی



کندی-یەعقوب کوڕی ئیسحاق کندی (805-873ز) فەیلەسوف ێك و ئەستێرەزان و بیرکاریزان و فیزیازان بوو، دامەزرێنەری فەلسەفەی ئەرستۆیی ئیسلامی بوو، نازناوی ( فەیلەسوفی ئیسلام)ی لێنرا. کیندی چەندان راڤەی نووسییەوە بۆ کارەکانی ئەرستۆ (ئۆرگانون و ئیتریشی) لەگەڵ چەندین توێژینەوەی دی لەبارەی (میتا فیزیکا)، روانینی گشتی کیندی بۆ جیهان لەسەر بیرۆکەی تێکبەستنی هۆیەکی گشتیی دامەزراوە

**که به پێی ئەم روانینە هەموو شتێك بە تەواوی – ئەگەر بە تەواوی تێیبگەین – جیهان رەنگ دەداتەوە (وەك چۆن لە ئاوێنەدا رووئەدات. لە نووسراوە زۆرەکانی تەنیا چەند وردە نووسینی ماوەتەوە.**

**یەکەم موسڵمان بوو هەوڵیدا بەرنامەی لۆجیکی بەکار بێنێت لە لێکۆڵینەوە لە قورئان.کندی لەبەسرە پەروەردە بوو لە بەغدا جێگیر بوو بایەخی بە بیرکاری و زانست و فەلسەفە دەدا، لەگەڵ ئایین.بایەخی بە لێکۆڵینەوە، لەهەموو ئایینێك و شارستانییەك دەدا.کندی فەلسەفەی یۆنانی خوێند بیرۆکەی ئەرستۆی بەکارهێنا سەبارەت بە جووڵە. رەخنەی لەهرمزیەتی و ئەفلاتوونیەتی نوێی گرت. کتێبی (الردعلی المشائیة والمثنویة)ی دانا، تیۆری هەڵرژان (فیضی)ی رەتکردەوە لە پەیوەندی بەخوداوەند وەن.کندی زیاتر لە (24) کتێب و نامەی نووسیوە.**

**دوای کندی نەوەیەکی دیکەی فەیلەسوفانی موسڵمان پەیدابوون رادیکالی تر بوون لەپێشەوەی ئەوانەش: ئەبوبەکری رازی (864-932ز)بوو.**

## ئەبوبەکری رازی (864-932ز).




ئەبوبەکر کوڕی زەکەریای رازی، لەرەی لەدایك بوو، لە 712ه/864م، هەر لە دیمەشق کۆچی دوای کرد لە (776ه/932م) لە پزیشکیدا ناوبانگی دەرکرد، نوێنەرێکی بە توانای هۆشگەرایی بوو لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، خاوەن پێلێکی هزری بوو، بانگەوازی بۆئەوە دەدا کەوا فەلسەفە تێکەڵ بە کاروباری ئایین نەکرێت، لەهەمان کات دیدگای

ئەرستۆی پەسند کرد سەبارەت بە میتافیزیکا و هزرێکی عارفانەی هەبوو.. لەو باوەڕەدا بوو شیکردنەوەی هۆشەکی و لۆجیکی تاکە ڕێگای دروستە بۆ گەیشتنە زانین.

**فەلسەفەی رازی**

بەناوبانگترینی ئەوانەبوو لە سەدەی هەشتەمی کۆچی لە مەنتیق وفەلسەفە نووسیویانە.

لا لێ کردنەوەی راستەقینە لە فەلسەفە وەك لە شارستانیەتی و ژیاری یۆنانیدایە لەسەرەستی رازی هاتەدی.

رازی پزیشك بوو، بەڕێوەبەری نەخۆشخانە بوو لە رەی لە ئێران. زیاتر لە 232 کتێب و نامەی داناوە. ( شرح الحاوی) لە پەندیاری ناسراوە بە (الجامع لصناعة الطب)، وەرگێڕادراوەتە سەر لاتینی. ( [22])راڕەوی رازی لەسەر پێنج بنەما دامەزرابوو، خوداوەند ، دەروونە گشتییەکان، هیولی، شوێنی رەها کاتی رەها، لەهەمان کات باوەڕی وا بوو: خالقێك هەیە، رووناکییەکی (نور) گیانی سادەی لێ هەڵدەڕژێ (یفیض)، کە هیولی یە، یان رووناکییە هەڵڕژاوەکەیە لە رووناکی (نور)ی خوداوەند ، لەوەوە دەروونە ببێژەکان (الناطقة) هەڵدەڕژێن، سێبەرێکی لە دواوەیە لەوەوە دەروونە ئاژەڵییەکان دروست بوونە. بەڵام هەمیشە هەر لەسەردەمی

[22] موسوعه الفلسفه-.... ج1،ص630.

رووناکی یە گیانییە سادەکەو، ئاوێتەیەکی دیکە هەیە، لە سێبەری ئەودا چوار سروشتە کە دروست بوونە، گەرم، سارد، وشك، تەڕ.
هەموو تەنە باڵاییەکان و ژێرییەکان لەم چوار توخمە دروست دەبن.
بەگشتی لەو باوەڕەدابوو زانستی راستەقینە ئەو زانستەیە روو لە کاروباری سروشتی و زانستەکانی فەلسەفە و یاساکانی لۆجیك دەکات. لەو باوەڕەدابوو فەیلەسوف نابێت پشت بە بۆچوونە ئاینییەکان ببەستێت. رەخنەی هەرە گەورە لە فەلسەفەی رازی ئەوە بوو کەوا گەر فەلسەفە تاکە رێبێت بۆ گەیشتنی راستی ئایا خەڵکی سادەی نەشارەزا لە فەلسەفە چی بکات؟
هەر لەم خاڵەوە فەیلەسوفێکی دیکە دەستی پێکردووە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەویش فارابیە.

**فارابی، ئەبونەسر محەمەد، *Al-Farabi***

**الفارابی، أبو نصر محمد**(873 – 953ز)




**فارابی، ئەبونەسر محەمەد کوڕی محەمەد بن ترخانی فارابی، لەوسیج لە ناوچەی فاراب لە خواروی تورکستان لەدایك بووە، لە بەغدا خوێندوویەتی لای یوحنا کوڕی حیلانی مەسیحی. دواتر لۆجیك و**

فەلسەفە و زانستەکان و بیرکاری و مۆسیقای خوێند. چووە حەلەب لەلای سەیفی دەولە جێگیر بوو لە (330ك/941ز) لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد لە 339ك/950زاینی لە تەمەنی (80)ساڵی.نازناوی (المعلم الثانی) لێندرا (المعلم الاول) بە ئەرستۆ دەوترا.

بە مەزنترین فەیلەسوف ەکانی موسڵمان دەژمێردرێت، بیرکاریو مۆسیقا شارەزابوو، لە دانراوەکانی (کۆکردنەوەی رای دووپەندیار- الجمع بین رایی الحکیمین)، لەم نووسراوەیدا هەوڵی گونجاندنی نێوان دوو فەیلەسوفی یۆنانی داوە کە ئەفلاتوونو ئەرستۆن لەوەشدا بەهەڵەچووە ، بە گشتی هەوڵدانی سەرەکی بۆ گونجاندنی رێنوێنییەکانی ئیسلام بوو، لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوونو ئەرستۆ، ئەویش تەنیا بە یاریدەی بەرنامەی هۆشیاریەتیی.

لە نووسراوە سەرەکییەکانی (نامە مرواریەکانی فەرمانرەوایی)و، (رامیاری شارستانیەتی)و، (کتێبی گەورەی مۆسیقا)و، (بیروباوەڕەکانی خەڵکی چاکترین شار). کە بیروڕاکانی وی تێدابوو لە بارەی کۆمەڵگەی چاك وەك ئەفلاتوون لە کتێبی (کۆمار)دا ئەنجامی دابوو.

رۆڵی فارابی لە فەلسەفەدا:

ئەفلۆتین زۆرکاری تێکرد، وەك ئەو لەو باوەڕەدابوو بەپێی تۆڕی (یەك و زۆربوون) لەیەکەوە، کە خوداوەند یە، جیهان پەیدابووە.
لەوکاتەیدا خودی هۆش لە خۆی دەگرێت. لە بنجیدا زانستی خوداوەند لەئارادایە، نەك ویستی خوداوەند . لەوەوە هۆشی یەکەم هەڵدەڕژێ کەوا

**هەسارگە (الفلك)ی گەورە دەجوولێنێت،دواتر هەشت هۆشی دیکە دێت کاریگەری لە تەنە ئاسمانیەکان. دواتر هۆشی کارا دێت، ئەڵقەی گەیاندنە لەنێوان جیهانی باڵا و جیهانی خواروو. دواتر پایەی دەروون دێت. هۆی کاراو دەروون لە تاکەکانی خەڵك (مرۆڤ) زێدە دەبن ئەوەندەی تاکەکانی مرۆڤ. دواتر مادده دێت وشتەکانی لەو پێکدێن.**

**زانین لای فارابی لەخوارەوە بۆ باڵا دەبێت لە بوونەوەراندا. واتە گواستنەوە لە زۆریەوە بۆ تاکایەتی. شتە مادییەکانی گەر هۆی پێ زانی دەبێتە هۆشەکی لە هۆشدا بوونی دەبێت جیا لەبوونی ماددی.**

**فارابی نامەیەکی هەیە سەبارەت بەرای شاری چاك، بۆچوونەکانی تیایە لەبارەی سیاسەت. لە شێوازی (کۆمار)ی ئەفلاتوون داپڕشتووە.**

**لە کتێبەکانیدا رایەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆو ئەفلاتونێن بەرچاون.**

**فارابی لەوخاڵەوە دەستی پێکرد کە سوودی فەلسەفەیە لە ژیانی رۆژانەی مرۆڤی سادەدا، ئەوەشیان لەکتێبی راکانی خەڵکی شاری چاکەوە ئەنجامدا، ئاماژەی بەوەدا کەوا ئەو نموونایەتییەی ئەفلاتوون دەیویست لە (کۆمار) دروستی بکات ئەوا لە ئیسلامدا هاتۆتەدی.**

**فارابی بیرۆکەی پەیدابوونی یۆنانی پەسندکرد نەك (خەلقی) ئاینیەکان. فارابی مەبەستی خوداوەند پەرستی بوو، تیۆری هۆشە ئاسمانییەکانی پەسندکرد وەك لە تیۆری ئەفلاتوونیەتی نوێ: هۆشی یەکەمی بوونی پێویست، بوونی هەڵدەڕژێ هۆشی دووەمی لێ پەیدا دەبێت دواتر سێیەم هەتا هۆشی دەیەم کە هیولی و ماددەی لێ پەیدادەبێت**

کە چوار توخمەکەی سروشتی لێ پێکدێت.واتە ئاو، هەوا، ئاگرو خۆڵ.ئامانجی سەرەکی گونجاندنی شەریعەت و فەلسەفە بوو.

## ئیبن سینا،

## *Avicenna – Ibn Sina, Abu-ali*

**ابن سينا – أبو علي**



**(980 – 1037) فەیلەسوف   و پزیشك‌و زانایەکی سروشتی‌و شاعیر بوو، خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست بوو، لە بوخاراو ئێران ژیاوە. لەگەڵ دڵسۆزیی بۆ ئیسلامەتی، رۆڵێکی مەزنی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی کەلەپووری فەلسەفەیی‌و زانستیی گشتیی کۆن‌و بە تایبەتی رێنوێنیەکانی ئەرستۆ لە نێوان عەرەبەکانداو بەهۆی ئەوانەوە لە ناو ئەوروپادا، ئیبن سینا زۆر تێکۆشا بۆ پشتگیریکردنی بیرکردنەوەی هۆشەکی‌و بڵاوکردنەوەی زانستی سروشتی‌و بیرکاری، لە فەلسەفەکەیدا هەردوو رووکاری مایەکیەتی‌و نموونایەتی (المثالیة - Idealism ) ی ئەرستۆی پاراست، لە هەندێ گیروگرفتدا لای دا بۆ ئەفلاتوونەتیی تازە. ژیربێژی‌و فیزیاو میتافیزیکای لە ئەرستۆوە پەرە پێدا. نەمریی مایەی سەلماندو بە بنۆسی فرە جۆربوونی شتە هەندەکی (جزئی) ەکانی داناو، دژی ئەستێرەگەریی وخوڕانەو جادوو وەستا، کتێبە سەرەکییەکەی (کتێبی زانیاری) بە کورتی بیروڕاکانی لەبارەی ژیربێژیی‌و فیزیا دەردەبڕێت.**



ئیبن روشد (Avreeoes)، ئەبوووەلید محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی روشد: فەیلەسوفێکی مەزنی ئیسلامییە. لە قورتبە (ئەندەلوس) لە ساڵی 520ك/1126ز لە دایك بووەو لە 9ی سەفەری 595ك/10کانوونی یەکەمی 1198زاین لە مەراکش (مەغریب) کۆچی دوایی کردووە.1 پایتەختی هزرو ئیسپانیای ئیسلامی لە دووسەدەی پازدەو دوازدەی زایینی .

ئەبو وەلید بەباشی پەروەدەکرا لە 565ك/1169ز بوو بە دادوەر لە ئیشبیلیە. لە 1171/567کرا دادوەری شاری قورتبە.

ئایینزانی (فقه)ی قورئانی و کەلام و فەلسەفە و پزیشکی و بیرکاری خوێند، ئبن توفەیل (طفیل) بردیە لای خەلیفە موەحید ئەبی یەعقوب یوسف، ئەویش داوای لێکرد لە نووسراوەکانی ئەرستۆ بکۆڵێتەوە.
لە ساڵی 578ك/1182 بوو بە پزیشکی تایبەتی خەلیفە.
فەیلەسوف و زانایەکی موسوڵمانە ،توانی – بە بێ ئەوەی واز لە ئایینی ئیسلامی بێنێت – توخمە مایەکییەکانی فەلسەفەی ئەرستۆ پەرە پێبدات.( )

هەوڵی دا نەمریی‌و کۆنی مایەو بزووتنەوە بسەلمێنێت، نەمریی گیانی تاکە کەسیی رەتکردەوە، ڕاڕەوی راستیی دوولانەی دامەزراند، رەخنەیەکی توندی ئاراستەی سۆفیگەریەتی (غەزالی) خواناس‌و موسڵمان کرد. راڤەو پێگۆتنەکانی لەسەر کارەکانی ئەرستۆ رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پێناسینی فەلسەفەی کۆن بە ئەوروپاییەکان، لە لایەن دەسەڵاتی سەردەمی خۆی رێنوێنیەکانی رەتکرایەوە.
بەڵام بەهۆی سەلەفیەکان، کە دژی فەلسەفە بوون، بەڵام مەنسوری کوڕی خەلیفە هەڵوێستی گۆڕاو ئبن روشد بەندکرا، بڕیاری دا هەموو نووسراوەکانی و هەموو نووسراوە فەلسەفیەکانیش بسووتێنیت ، ناچار

[23] م.رۆزنتال ،ب.یودین،الموسوعه الفلسفیه،دارالطلیعة،گ5 ،1985 ،ل8

دوای ڕەهابوون چوو بۆ مەراکیش (مغرب) و لەوێ لە ژێر چاودێری دابوو. ئبن روشد خۆی بەراڤەکاری ئەرستۆ دەزانی (تهافت التهافت)ی بۆ وەلأمدانەوەی غەزالی دانا.

راڤەکاریی ئیبن روشد بۆ ئەرستۆ لە (الشرق الاکبر الاوسط) دایە کە بەوشەی (قال) دەستپێدەکات.

شایانی باسە لە راڤەکردنی کتێبی (لەبارەی ئاسمان)ی ئەرستۆ دان بە گۆیی بوونی زەوی دێنێت. لە (فی سعاده النفس) و (کتاب الکلیات) و نامەکەی (فصل المقال فیما بین الشریعة والحکمة من الاتصال) راو بۆچوونەکان دەخاتە روو.

لە دووسەدەی سێزدەو چواردە راڤەکانی ئبن روشد بۆ ئەرستۆ کرانە (عیبری) لەسەرەتای سەدەی سێزدە کرانە (لاتینی).بیرو بۆچوونەکانی کاری کردە سەر (تۆماس ئەکیوسیناس) (1225-1279ز) و ئیلبرتی گەورە (1206-1280) و موسی کوڕی مەیمون (1135-1204) و ئیرنس رینان (1823-1892).ئبن روشد لەورایەدابوو فەلسەفە نابێت باس لەو لایەنە بکات کە دژی بوونی خوداوەند و ئەفراندنی بوون بێت لەلایەن خوداوەند وە.

رەخنەی لە تیۆری (دەرکەوتن=الصدور)ی فارابی و ئبن سینا گرت، بە ئەفسانەی دانا.

ڕێبازی لاتینی ئیبن روشد لە فەلسەفەدا:

لەزانکۆکانی ئەوروپا دا–کاتدرائییەی نوتردام- لە1215 ز دروست کراوە،ئۆکسفۆرد- لە1214ز دروست کراوە ..- ئەدەب ،رێزمان، لۆجیکی ئەرستۆ و دەروا زەکەی فەرفۆریوس دەخوێندرا ،ناسراو بە :

ئیساغۆجی فەرفۆریوس Isagoge des porphyrius

لە زانکۆی پاریس هەندێ بابەتی فەلسەفە کە کاتی خۆی لەیۆنانییەوە کرابوونە سریانی ولەویشەوە کرابوونە عەرەبی وەرگێردرانە وە سەر زمانی لاتینی لەوانە بەرهەمەکانی ئیبن روشد کە بە رێبازی لاتینی (ئەرستۆ - ئیبن روشد ) لە فەلسەفەداناسراون.

هەروەها هەندێ بەرهەمی بوعەلی سینا وبنگەبرول کراونبە لاتینی .هەرلەرێی ئیبن روشدەوە گرنگی ئەرستۆ دووبارە هاتوە مەیدانی فەلسەفەی ئەوروپی .

کەواتە لەرۆژئاوا لەسەدەی سێزدەدا هەرچەندە بە فەتوای قەشە تێمپێ لە1277ز چەند بابەتێکی فەلسەفە قەدەغە کراوەلەگەڵ ئەوەشدا:

1- بایەخ بەفەلسەفەی ئەرستۆ درایەوە.
2- رەخنە لە بنەماکانی ئاینی مەسیحی گیرا یەوە لەلایەن هەندێ لە فەیلەسوفان ولە دژی ئەمە دادگای پشکنین دامەزرا.
3- بزووتنەوەی مرۆڤ پەروەری Humanism پەیدا بوو.
4- رارەوی ئاینی نوێ پەیدابوون .
5- لە 1277ز پاپ و کەنیسە چەند کتێبێکی ئەرستۆیان قەدەغەکرد.

لەبارەی فەلسەفەی ئیسلامی



**فەلسەفەی ئیسلامی زاراوەیەکی گشتییە دەکرێ بە چەندان شێواز پێناسە بکرێت و بەکاربێت.**

**دەشێ:-بەوفەلسەفەیە بوترێ کە لە دەقە ئیسلامییەکان وەرگیراوە، بۆئەوەی دیدگای ئیسلام و جیهانبینی ئیسلام سەبارەت بەگەردوون، ئەفراندن و ژیان و ئەفرێنەر (خالق)، روونبکاتەوە.**

**-هەموو کارو بۆچوونە فەلسەفییەکانی لەچوارچێوەی شارستانیەتی ئیسلامی هاتونەتەدی.**

**-هەرکارێکی فەلسەفی، فەیلەسوفێکی موسڵمان کردبێتی.**

نزیکترین وشەی بەکارهاتوو لە دەقە بنچینەییە ئیسلامییەکان (قورئانی پیرۆزو ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ)) بۆ وشەی فەلسەفە وشەی (حکمة) واتە (پەند یاری) بێت.

لەزۆر دەقی  فەیلەسوفە موسڵمانەکان وشەکە وەك هاو واتای philosophy بەکاردێت.

لەگەڵ ئەوەشدا وشەی فەلسەفە هەیە پەیوەست بوو بە چەمکە فەلسەفییەکانی یۆنانی رۆژئاوایی.

فۆناغی هەموارکردن

لەوکاتەیدا سەبارەت بە فەلسەفەی ئیسلامی دەدوێین وەك بۆچوونێکی گشتی گەردوونی و توێژینەوە لە سروشتی ژیان، پێویستە چەندان را ڕەو و فێرگەی هزری دیکەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەبەرچاوبگرین وەك سەرەتاکانی هەموارکردنی هزرو بیر بۆ فۆناغی فەلسەفەیی. گرنگترین ئەم رێبازانەش: ((زانستی ئاخاوتن (علم الکلام) و بنچینەکانی ئایینزانی (اصول الفقه) و زانستە زمانییەکان بوون)).([24])

ئەوەی تێبینی دەکرێت وشەی (حکیم) و (حکمە) لە بواری سۆفیگەریشدا بەکارهاتووە و هەندێ لە سۆفیەکان وەك نازناو وشە   (حکیم)یان بەکارهێناوە. بەگشتی وشەی فەیلەسوف ( فەیلەسوف   ان) تایبەت بوو بەو کەسانە کە لە چوار چێوەی فەلسەفەی یۆنانی کاریان کردووە.

سەرەتاکانی فەلسەفەی ئیسلامی

---

[24] مصگفی عبدالرزاق، تمهید تاریخ الفلسفه الاسلامیه،ج.

گەر فەلسەفە وا پێناسە بکەین، کەوا بنیاتنانی بۆچوون و دیدگایەکی سەرتاپاگرە بۆ گەردوون و ژیان، ئەوا سەرەتای ئەم کارە لە هزری ئیسلامیدا عیلمی کەلامە، کەوا پشت بەدەقەکانی قورئانی پیرۆزو ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ) دەبەستێت بۆ بەرگری کردن لە راستییەکانی ئیسلام.

سەرەتا بە گومان خستنە سەر قەزاو قەدەر، بەتایبەتی قەدەر، ئەم چەمکەیان لە راستەڕێ چوو بووە دەر، ئەمەوییەکان وایان بلآودەکردەوە کەوا ئەم فەرمانڕەوایەتییان بە قەزاوقەدەری خوداوەند بوو (قضاء الله وقدره) و را ڕەوی جەبریان بلآودەکردەوە،

مەعبەدی جوهەنی (لە 80کۆچی مردووە) یەکەم کەس بوو سەبارەت بەم مەسەلە رای جیاوازی دەربڕی وتی مرۆڤ ئازادانە هەڵوێست هەڵدەبژێرێت.

مەعبەد لە بەسرە بوو هەندێ بە ناوی قەزاو قەدەر ئەرکەکانی ئیسلامیان جێ بە جێ نەدەکرد ئەو لێیان بەدەنگ هات و وتی قەدەر توانای هەڵبژاردن لە مرۆڤ وەرناگرێتەوە وتی:

لاقدّر والامر أنُفٌ.

مەعبەدو عەتای کوڕی یاسر دەچوون بۆلای حەسەنی بەسری لێیان دەپرسی:

ان هؤلاء الملوك (بنى امية) يسفكون الدماء ويأخذون الاموال، ويقولون انما تجرى اعمالنا على قدرالله. ويرد الحسن: ...))

واتە ئەوا پاشاکانی بەنی ئومەیە خوێن دەڕێژن و بەناهەق سامانی خەڵك دەدزن، دەڵێن ئەوەش بەپێی دانانی خودایە بۆمان.

حەسەنی بەسڕیی دەیوت: ......!)

لەبەر ئەوە ئەمەوییەکان گرتیان و مەعبەدیان لە سێدارەدا.

پێلێکی دیکەی هزری بەناوی گۆشەگیرەکان ناسرابوون (موعتەزیلەکان)، ئەو ناوەیان لەبەرئەوە پێدەوترا گەورەکەیان واسل کوڕی عەتا (واصل بن عطاء) (699-749م) لە مامۆستاکەی حەسەنی بەسری (الحسن البصری (643-728م) (کەسایەتییەکی مەزنی زاهید بوو لە مەدینە لە دایك بووە بەرەگەز فارسی بوو، لە بەسرە جێنشین بوو،قازی شار بوو، رووگەی پرسیارو داوای فتوا بوو) جارێکیان پرسیاریان لێ کرد سەبارەت بەو کەسانەی گوناهە گەورەکان (الکبائر) دەکەن ئایا ئیمانداران یان کافرن، پێش ئەوەی وەڵام داتەوە، واسڵ کوڕی عەتا کە شاگردێکی ئەو بوو وەڵامی دایەوە: من ناڵێم ئەوەی گوناهی گەورە دەکات بەرەهایی ئیماندارە، ناشڵێم کافرە، بەڵکو لە پێگەیەکی نێوان ئەو دووپێگەدایە( بین بین)،نە ئیماندارەو نە کافرە!

دواتر واسڵ لە کۆڕی حەسەنی بەسری هەستاو چوو پشتی بە کۆڵەگەیەکی مزگەوتەکەداو جیابۆوە، حەسەنی بەسری وتی: واسڵ گۆشەگیر بوو!

لەبەر ئەوە پەیڕەوانی واسڵ ناونران موعتەزیلە=گۆشەگیرەکان.

**کەم کەم خەڵك لەدەوری واسڵ کۆدەبوونەوە و بەسوود وەرگرتن لە فەلسەفە بۆ یەکلایی کردنەوەی زۆر بابەت و پرسی ڕاڕەوێکی تایبەتیان دامەزراند.**

**پرسی وەك: ئایا مرۆڤ ئازادە لەوەی دەیکات یان ناچارە (مجبر)، جەبرییەکان (ناچارەکییەکان) لەو باوەڕەدا بوون مرۆڤ ناچارە، ئازاد نییە، کۆمەڵەی جهەم کوڕی سەفوان بوون. موعتەزیلەکان بە ئەهلی عەدل و تەوحید بەناوبانگ بوون لەبەر ئەوەی وتیان سیفەتەکانی خوداوەند ئەزەلی نین دەنا تووشی فرەیی دەبین, کە هاوبەشی دۆزینەوەیە، هەتا دەیان وت: کەلامی خوداوەند شی گەر دێرین (قدیم) بوایە ئەزەلی دەبێت ئەوەش هاوبەشی پەیداکردنە.**

**ئەم کێشەیە گەورە بوو تراژیدیای قورئانی لێ پەیدابوو دەیان زاناو سەدان کەسی لەسەر کوژرا**[1 25]

**ئەم باسانە ئاماژەن بۆ سەرەتای بیرکردنەوە لە کێشە گەلێك، تیایدا پەنادەبردرا بۆ لۆجیك و نووسینەکانی فەیلەسوفە یۆنانییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارە**

**بەم جۆرە زانستی ئاخاوتن هەوڵی دەدا بە گەنگەشەو بەڵگە هێنانەوە باوەڕی ئایینی لای موسڵمانان پتەو بکات.**

---

[1 25] د.عبدالمنعم الحفنی-موسوعە الفلسفە و الفلاسفە، گ1999،مکتبە مدبولی بەشی یەکەم و دووەم.

ئەم زانستە هەوڵێك بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی راو بۆچوونی نویٚ کە لە میزۆپۆتامیا هەبوو (مانی، زەردەشتی، سابیئی).ئەوکات باوبوون و پرسیاریان دروست دەکرد.

ئەم پرس و کێشانە چەندان کۆمەڵەی دروست کرد وەك:

1- موعتەزیلیەکان.

2- جوهەمیەکان.

3- خەواریجەکان.

4- ئەشعەری و ماتریدی و سۆفیەکان.

5- ئیمامیەکان و ئیسماعیلیەکان....

بەم جۆرە عیلمی کەلام لە مێژووی هزری ئیسلامیدا وەك بەرپەرچ دانەوەی تیمە جیاجیاکان هاتەکایەوە. بەم جۆرە زانستی ئاخاوتن لێکۆڵینەوە بوو لە بنجەکانی ئایین ,کە لەسەر چوار تەوەر کاری دەکرد:

خوداوەند یێتی : گەڕان بەدوای سەلماندنی خودو سیفەتەکانی خوداوەند یێتی .

پێغەمبەرایەتی : بیٚ هەڵە بوونی پێغەمبەران  و خودی پێغەمبەرایەتی لە نێوان لێکدانەوەی هۆشەکی ئیماندا.

پێشەوایەتی-ئیمامەتی: واتە سەرۆکایەتی گشتی لە کاروباری ئایین و جیهانی.

رۆژی دوایی- ئایا جەستەییە,یان تەنیا گیانی، و چەندان ناونیشانی لاوەکی دیکە....



**باتینییەکان (نادیارگەری) (الباطنیة):**

**وشەی (الباطن والباطنیة) لەزمانی عەرەبی لەوشە قورئانییەکانن ،ئەوەتا لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ((هو الاول والاخر والظاهر والباطن)) (الحدید:**

3) هاوکات لەچەندان ئایەتی دیکەدا هاتووە: (الانعام : 151 ,الاعراف : 33, الحدید: 3, 13, الانعام : 120, لقمان :20.

ناودارەباتینیەکان :ئیبن حەزم (ابن حزم):

ئەبو محەمەد عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی سەعید کوڕی حزم, لەقورتبە لە 383ك لەدایك بووە, زاناو زاهید بوو لە فیقھ وحدیپ و ملك وتجل لە 456ك مرد. خاوەن مەزهەبی دەستگرتنە بەزاهیری ئاینەکانی قورئان. ئیسماعیلییەکان باوەڕیان بەزاهیرو باتن هەبوو وبەمەرجیان دەزانی. [26], [27], [28] غەزالی دەڵێت ناسناویان ئەمانەن: باتینی, قەرمایتە, قرمتی, خورەمی, خورمدینی, ئیسماعیلی, سەبعی, بابەکی,محەمەدی تەعلیمی. [29] ئیسماعیلی ئەوانەی سەربەئیسماعیلی کوڕی جەعفەر بوون. [30] دەوترێت بن عەرەبی پەیوەندی بەئیسماعیلیان هەبووە, بابزانین ئیسماعیلییەکان کێن:

---

[26] -د.مصطفى الشكعة. اسلام بلا مذاهب, ص242.

[27] -د. محمد سالم اقدير : العقائد الفلسفية المشتركة بين الفرق الباطنية , مطبعة مدبولي, 2006, ص34.

[28] -د.مصطفى غالب , الحركات الباطنية في الاسلام, ص98.

29 -انور الجندي. الاسلام والدعوات الهدامة, ص20.

[30] -غەزالی, فضائح الباطنية ,ص11.

31 -محمد كرد علي: الاسلام والحضارات العربية ص64,ج2.

ئیسماعیلییەکان،سەربە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر سادق , لکێکن لەدوازدە ئیمامییەکان(الاثنا عشریە) دوای جەعفەری سادق پەیدابوون, دوازدە ئیمامەکان ئەمانەن؛

-عەلی کوڕی ئەبی تالب (لە 40ك مرد)

-حەسەن کوڕی عەلی (لە 50ك مرد)

-حسین کوڕی عەلی (61ك مرد)

-عەلی زەین عابدین(94ك مرد)

-موسای باقر(113ك مرد)

-جەعفەری سادق (148ك مرد)

-موسای کازم(183ك مرد.

-عەلی رەزا( 203ك مرد)

-محەمەد جەواد( 219ك مرد)

-عەلی هادی (254ك مرد)

-حەسەنی عەسکەری (356 ك مرد).

-ئیمام محەمەد مەهدی مونتەزەر (256/355ك مرد)

ئیسماعیلییەکان دەڵێن ئیمامەت لەجەعفەرەوە بەدەق دراوە بەئیسماعیل کەکورە گەورەبوو بەڵام دوازدە ئیمامییەکان دەڵێن نەخێر موسای کازم هەوە.[32] بەڵگەیان ئەوەیە یەکەم لەژیانی باوکی مردووە دووەم پەیوەست

[32] -د.حسن ابراهيم جسن, تاريخ الاسلام السياسي والدينى والثقافي والاجتماعي, ج2/ص154.

بووە بەزێدەڕۆکان (الغلاة) وباوکی لەئیمامەتی خستووە.[33] ئیسماعیل کوڕی (فاتیمە کچی حسێن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب) ئیسماعیلییەکان لەو باوەڕەدا بوون کەلەتەمەنی باوکی نەمردبوو بەلاَم شاردبوویانەوە لەبەر عەباسییەکان نەوەکا بیکوژن دوای باوکی بەپێنج ساڵ کۆچی دوایی کرد [34] هەرلەبەر ئەم دەنگۆیە خەلیفە مەنسوڕ (بەئەبو جەعفەری مەنسور, دووەم خەلیفەی عەباسی بوو لەساڵی 136ک بوو بەخەلیفە دوای مردنی سەفاحی برای کەبەغدادی دروستکردبوو, لە 158ک مرد (22)ساڵ خەلیفە بوو کەسانێکی زۆری کوشت.

ئیسماعیلییەکان ئیمامەتی لەحەوتەم رادەگرن بۆ ئیمامە شاراوەکان[35]

ئیمامە شاراوەکان ئەمانەن:

محەمەدی کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر, عەبدوڵلاَی حوسێن , عەلی کوڕی حسێن ,سەعید الخیر( عبیدالله المهدی) , محەمەد کوڕی ئیسماعیل کەدرابووە مەیمون قەداح بۆپەروەردە کردن, کەباوکی مرد شازدە سالأن بو.

لەسەردەمی هارونەرەشید (170ک بووبەخەلیفە لە 193ک مرد) محەمەد کوڕی ئیسماعیل لەحیجاز بوو, هارونەرەشید ویستی بەکوشتنی

33 -د. النشار ,نشاة الفكر الفلسفي في الاسلام, ج2/ص371.

[34] -الشهرستاني: الملل والنحل ,ج1, ص191.

[35] - د. النشار ,نشاة الفكر الفلسفي في الاسلام, ج2/ص , المقدمة.

بدات ناچار رایکرد بۆ(ری) دێی (سمملا) کە ئێستا بە(محەمەد ئاباد) ناسراوە. دوای ئەو عەبدوڵلا جێی گرتەوە.

عەبدوڵلا ئەوشاروئەوشاری دەکرد لە(ری) خەلیفەکانی عەباسی بەتایبەتی مەئمون, تا لەشاری (سلیمە)ی شام گیرسایەوە بۆ لاکردنەوەی لە بانگەوازەکەیان.

خۆی و چوار بانگدێرانی (دعاتە):

(عبداللە کوڕی حەمدان, عەبدوڵلا کوڕی مەیمون ,عەبدوڵلا کوڕی موبارەك و عەبدوڵلای کوڕی سەعید) نامەکانی یارانی سەفایان دانا (رسائل اخوان الصفا وخلان الوفاء).

لێرەوە وەك ئایدیۆلۆژیا وراڕەوی ئیسماعیلی پەرەی سەند.[36]

تائیمام محەمەد کوڕی مەهدی باللە یان عبیداللە , کەپایتەختی خەلافەتی فائیمیان گواستەوە,دواتر کوڕەکەی قائم و دواتر مەنسور تاموعیزەدین کەپایتەختی گواستەوە قاهیرە. دواتر غەزو حاکم بەئەمرو اللە وزاهرو دواتر موستەنسیر باللە دواتر بوونە دوو بەش نزارو موستەعلا وبوون بەدوو گرووپ.

موستەعلییەکان حوکمی میسرو حیجازو یەمەنیان دەکرد تا سەلیبیەکان لەناویان بردن. کەچی نزارییەکان چوون بۆقەلای (ئالموت) لەئێران لەوێشەوە بلاوبوونەوە بۆهیندو دیلم وسوریا ئەمڕۆ ئیسماعیلییەکانی ئاغاخان سەربە سەر بەنزارییەکانن.

[36] - ا د. النشار ,نشاة الفكر الفلسفي في الاسلام, ج2/ص393.

میژوو نووسان دەڵێن حەسەنی سەباح بانگدێرێکی ئیسماعیلییەکان بوو هات بۆمیسرو بوو بە لاگری نزارو کەهاتەوە توانی قەلاتی (ئالموت) بگرێت و قولله وبورجی دروستکردن, وەك تۆڵەسەندنەوە پیاوکوژی نارد ئیمام ئامیر کوڕی موستەعلییان لەمیسر کوشت, لاگرو پەیوەستانی حەسەن سەباح بەحەشاییەکان ناسرابوون.[37]

حەشاییەکان ناوی کۆمەڵێکی زێدەڕۆن لەرۆژئاوای سوریا بوون لەلایەن کەسێك بەناوی شێخی جەبەل سەرکردایەتی دەکران دەڵێن خودی حەسەنی سەباح بووە, و گۆڕەکەی لەشارۆچکەی (قدموس) ە لە سوریاو بە(مقامی مەولا حەسەن) ناسراوە.[38] ئەم لکەی ئیسماعیلییەکان خۆبەخشی هەبوون بۆیە میرەکان وسەلیبیەکان هەزار لێکدانەوەیان بۆدەکردن.

ئەلموت لەلایەن جەسەن سەباح گیرا, کەهاوچاخی عومەر کوڕی خەیام بوو, لە 6ی رەجەبی ساڵی 483ك=4سێپتێمبەری ساڵی 1090 زایین, لە 23ی مایۆی ساڵی 1124ز=518ك مرد.[39] ,[40]

ئیسماعیلیەکان لەوباوەڕدابوون :

((لکل ظاهر باطنا و الظاهر بمنزلة القشور والباطن بمنزلة اللب المطلوب))

---

37 -د.مصطفى الشكعة: اسلام بلا مذاهب ,ص236.

38 -طه الولي: القرامطة, ص37.

39 -ادوارد جرانڤيل براون: تاريخ الادب في ايران من الفردوسي الى السعدي, ترجمة: د.ابراهيم امين الشواربي, مطبعة السعادة بمصر-1373ك-1954م.

40 -جميل صليبا, المعجم الفلسفي ,ج2, ص277.

**واتە هەموو دیاردەیەك رواڵەت و ناوەوەی هەیە، رواڵەت وەك توێکڵ وایە و ناوەوەشی وەك کاکڵ وایە.**

**مەیموون کوڕی دیسانی ئەهوازی، کەجەعفەر سادق کردیە پەروەرە دکاری محەمەد کوڕی ئیسماعیل ئەم چەمکی (الباطنیة)ی وەك راڕەو پەیداکرد.**

**ئامرازی ئەم را ڕەوەش لێکدانەوە بوو ئەبویەعقوب سجستانی بیرمەندێکی ئیسماعیلیان بوو (لە 971مردووە)، شێوازێکی لۆجیکی داهێنا بۆ گەیشتن بە راستەقینە، ئەویش نەرێی نەرێ (نفی النفی).**

**واتە لە گومانەوە بەرەو یەقین چوون.**

**دوای ئەو ئیسماعیل حەمدەدین کرمانی لە (1020مرد) ئەویش هەمان شێوازی بەکارهێنا.**

**ئیسماعیلیەکان بەدەرکەوتنی بزووتنەوەی یارانی سەفاو دۆستانی وەفا( ئیخوان و لسەفا )بەرهەمێکی هزری گرنگیان بە کۆمەڵگەی ئیسلامی و فەلسەفەی ئیسلامی بەخشی.**

## یارانی سەفا پردی فەلسەفەی یۆنانی بوون بۆ هزری ئیسلامی:

لەژێر کاریگەری هزری ئیسماعیلییەکان کۆمەڵەی یارانی سەفاو دۆستانی وەفا (اخوان الصفا الصفاو خلان الوفاء) لە نیوەی دووەمی سەدەی چواری کۆچی لە بەسرە پەیدابوو. کۆمەڵەیەك بوون لە  فەیلەسوفانی میللی بوون ، واباوە  عەبدوللای کوڕی مەیمونی قەداح دەستی هەبووە لە دامەزراندنی  .([41])

کەسایەتییە بە ناوبانگەکانی وەك: ئەبوسلێمان مەقد سی، مەقدسی، عەلی کوڕی هاروون (ئەبو حەسەن)زنجانی، محەمەد کوڕی ئەحمەد نهرجوری، هەبوون.

فەلسەفەکەی لەسەر هێڵی فەلسەفەی عیرفانی باتینییە، هزری ئیسلامی و هزری یۆنانی کۆدەکاتەوە بە تایبەتی زانستی ماتماتیکی فیساگۆرس.

ئیخوانی سەفا فەلسەفەکەیان لە (52) نامەدا نووسیوە، بەنامەی (الرسالە الجامعە)ەوە. نامەکان (14)یان سەبارەت بە بیرکاری و لۆجیکە، 17نامەی لەبارەی فەلسەفەی سروشتی و تیۆری دەروون، 10نامە سەبارەت بە میتافیزیکا، 10نامە سەبارەت بە سۆفیگەری و ئەستێرەزانی.

---

[41] د.عبدالمنعم الحفنی ،موسوعه الفلسفه والفلاسفه،گ2، مکتبه المتبولی، 1999 .ل114

بنەمای سەرەکی فەلسەفەی سیاسیان دادپەروەرییە، تیۆریان سەبارەت بوون (هەڵڕژانەکییە-فیچیە) جیهان لەخواوە پەیدابووە خودی بنۆسی (علە)هەموو هەڵڕژانێکە، بەریزە ئەمانەی لێ هەڵڕژاوە: هۆش دواتر دەروون، دواتر ماددەی یەکەم، دواتر جیهانی سروشت، دواتر جەستەکان، دواتر هەسارگەکان (الافلاك)، لەدواکایە توخمەکان. خەلیفەی عەباسی (مستنجد) (554ه/1150م) فەرمانی دا هەموو نامەکانیان بسوتێنێت بەنامەکانی (ئیبن سینا)شەوە، لەهەموو کتێبخانەکاندا بەڵام نامەکانی ئیخوانی سەفا مایەوە رۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە هزرو سۆفیگەری ئیسلامی.([42])

ئەم کۆمەڵەیە لەچوار چین پێکهاتبوون:

یەکەم: چینی لاوان لە 15-30ساڵی، ئەرکیان ملکەچییە.

دووەم: چینی پیاوان 30-40زانستە دنیاییەکان فێردەبن و پەندی دنیایی.

سێیەم: چینی پیران، پایەیان وەك پایەی پێغەمبەرانە.

چوارەم: گەر لە پەنجا ساڵی رەتبوون هەریەکە دەگاتە پایەی مەلائیکەتە لە پێشەکان، راستی شتان دەبینێت.

دامەزرێنەری نەناسراوە، بەڵام عەبدوڵڵا کوڕی مەیمون قەداح دەستی هەبووە لە دامەزراندنی.([43])

---

[42] جورج گرابیش، معجم الفلاسفه، گ2، دار الگلیعه بیروت، 1997.

[43] موسوعه الفلسفه ص114.

یارانی سەفاو دۆستانی وەفا(اخوان الصفا وخلان الوفا) کۆمەڵەیەکی نهێنی بوون لەبیرمەندو زانایان ئامانجیان هێنانەکایەوەی دیدگایەك بوو سەبارەت بەبوون ونەبوون، لەسەدەی چوارەمی کۆچی، دەی زایینی لەئێراق-لەبەسرە بەتایبەتی لك و پۆپیان لەشام و میسرو خوراسانیش هەبوو. هەڵوێستیان مرۆدۆستانە و ئامانجیان گونجاندنی فەلسەفەو شەریعەتی ئیسلام بوو.

پردی گواستنەوەی فەلسەفەی یۆنانی و فێرگەجیاجیاکانی دواتر بوو بۆ نێو هزری بیرمەندو زانایانی موسڵمان ورێچکەی سۆفیگەریش. د.عاتف عیراقی دەڵێت: ((کۆمەڵەیەکی نهێنی بوون لەسەدەی دەی زایینی (چوارەمی کۆچی) پەیدابوون لەشیعەی باتینی بوون(واتە 750-1258م،132-652ھ). [44] لەبارەی دیدگاکانیانەوە چەندان نامەیان نووسیوەسەرەڕای (رساله الام الجامعه) کەکورتەی سەرجەم نامەکانە(52) نامەن، بەشەکانی بەم شێوەیەن:

-14 نامە (فێرکاری، بیرکاری، لۆجیك)

-17نامە (سروشتی ودەروونزانی)

-10نامە میتافیزیکی

-11نامە بە(الرساله الاضافیة او الجامعه )ەوەکەتایبەتە بەنوامیس وئیلاهیات وفەلەکناسی.

---

44 عاتف عراقی، مذاهب فلاسفة المشرق،ص20،الطبعة السادسة-دار المعارف-القاهره-عام1978.

ئەم نامانە خۆی لەخۆیدا زانیارستان، ئینسایکلۆپیدیایەکی زانستی و فەلسەفی وهونەرو ئەدەب بوون. کاریگەری فیساگۆریزم وئەفلاتون وئەرستۆو ئەفلاتونیەتی نویٚ یان لەسەر بوو. بەتایبەتی ئەفلوتین و کندی وفارابی هاوچاخ بوون لەگەلٚ ئەم کۆمەلٚەیە. ئەوانیش کاریگەریان هەبوو لە سەر هزری ئیبن سینا.

برایانی سەفاو دۆستانی وەفا. ئەلٚقەی گەیەنەری فەلسەفەی رۆژئاوا – یۆنانی بوون بۆ هزری ئیسلامی .لەسەردەمێکدا وزەو تواناکانیان تەقیەوە کە دەسەلاٚتی ناوەندی خەلیفەکان کزبوو بوو یان هەر نەمابوو، لەبەغدا بوەیهیەکان فەرماندار بوون، لەئەندەلوس بەنی ئومەیە، لەئەفریقیا عوبەیدیەکان لە میسر ئەخشید ییەکان لەحەلەب حەمەدانییەکان، لەجەزیرە شەیبانییەکان لەعمان و بەحرێن قەرامیتەکان لەخوراسان وئەودیو زیٚ ساسانیەکان، بەهۆی ئەو گەندەلٚی و نادادپەروەریەی لەدەسەلاٚتی ناوەندی داهەبوو.[45]

زۆر توێژەر باس لەسەدەی دووەمی کۆچی دەکەن، بەلاٚم د.تەها حسێن پشتگیری سەدەی چوارەمی کۆچی دەکات،[46] هەر لەم سەدەیەدا بوو بزووتنەوەی وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی گەیشتە چلە پۆپە و گرووپە جیاجیاکانی ئیسلامی دەرکەوتن وەك: لاگرانی فەرمودە (اهل الحدیث)،

---

[45] -د. محمد فريد حجاب، الفلسفة السياسية عند اخوان الصفا، ص33، الهيئة المصرية للكتاب،ط1، 1982.

[46] - د.طه جسين، من مقدمة رسائل اخوان الصفا وخلان الوفا-تصحيح خيرالدين الزركلي،ج1،ص3،المطبعة العربية،مصر (1347ه/1928م).

گۆشەگیرەکان(المعتزله)، دواخەرەکان (المرجئه)شیعه و لادەرەکان (خەوارج).

لەنێو ئەم لێکدژو نەسازیانەدا ئەم کۆمەڵە ئامانجیان کۆکردنەوەی ئاینی ئیسلام و فەلسەفەی یۆنانی بوو.[47]

بەم جۆرە نامەکان کاریگەری شیعەو موعتەزیلەو فەلسەفەی یۆنانی تیادایە،[48] ئامانجیان کۆکردنەوەی هەموو لایەنە باشەکانی فەلسەفەو مەزهەب و رێچکەکان بوو[49] لەچواریەکی سەدەی چوارەمی کۆچی یارانی سەفا رێکخستنیان تەواوبوو بەتایبەتی لەساڵی 373ك پێگەیشتبوو، بەپێی ئاخاوتنی ئەبوحەیانی تەوحیدی رسکا بوو[50] لەم بارودۆخە لێکدژەدا، کەداهێزران و نەمانی کۆنترۆڵی ناوەندییە، هاوکات بەرزبوونەوەی هۆش وژیاری وزانستە ئەم لێکدژییە بەرچاو دەکەوێت وگەورەترین بەڵگەش نامەکانی یارانی سەفاو دۆستانی وەفایە.

---

[47] -د. جميل صليبا، اخوان الصفا-دائرة المعارف-قاموس عام لكل فن ومطلب،ص455،بيروت، 1967.

[48] - دى بور، تاريخ في الاسلام-ترجمة د.ابوريدة،ص111-لجنة التاليف والترجمة والنشر-القاهرة –ط2-1948م.

[49] - د.عمر فروخ،تاريخ الفكر العربي الى ايام ابن خلدون-ص293-بيروت –ط11962م.

[50] - ابوحيان التوحيدي، الامتناع والمؤانسة، بتصحيح احمد امين واحمد الزين ص6-8ج2،لجنة التاليف والترجمة والنشر –القاهرة -1942م.

ئەم دەقەی ئەبوو حەیانی تەوحیدی ((کۆنترین دەقە کەباس لەو کۆمەڵەیە بکات))[51] هەندێ لەرۆژهەڵاتناسان وەك کازانۆڤا casanova لەخوێندنەوەی دەقەکان دەگاتە ئەم ڕێکەوتەی خوارەوە : 19نۆڤێمبەری 1047، واتە 26جەمادی یەکەمی ساڵی 439ی کۆچی.[52]

یارانی سەفا ناویان لەشیعری (ابی العلاء) دا هاتووه[53] :

واذا اضاعتني الخطوب فلن ارى

لوداد اخوان الصفا مضيعا

کەسانێك هەن دەڵێن لەشاری (مصیاف) ی سوریا کۆمەڵەکەیان دامەزراندووە،[54] بیروڕاکانیان لەکندی نزیك بووە[55] ئەم بیرمەندانە زۆریان لەنەتەوەکانی دیکە وەرگرتووە بەتایبەتی یۆنان..[56] زۆربەی راکان

---

[51] - د.زكي نجيب محمود.مقال بعنوان: (الامتناع والمؤانسة لابي حيان التوحيدي) مجلة (تراث الانسانية)،القاهرة،المجلد الاول-العدد 10-ص799-سنة 1963

[52] – د. محمد فريد حجاب: الفلسفه السياسيه عند اخوان الصفا.ص43 بەگواستنەوە لـــە: casanova:p.unedate.Astronomiquedans les epittres des(khwan El-sata)journal Asiatique.

[53] - د.طه حسين، ذكرى ابي العلاء،ص125، ط1-القاهرة1925م.

[54] - عرف تامر:حقيقه اخوان الصفا وخلان الوفا،ص10-11.

[55] - د.فيصل بدير عون: علم الكلام ومدارسه،ص339.طبعة القاهرة-1978م.

[56] - د.عاطف العراقي:مذاهب فلاسفة المشرق،ص20، الطبعة السادسة،دار امعارف –القاهرة عام 1978.

دەڵێن لەبەسرە پەیدابوونە[57] ئەم رایە لەپێشە لەبەرئەوەی بەسرە دورپیانی پەیوەندی بوو لەگەڵ هیند، فارس، ئەفریقیا، لەبەسرە مورجیئە وقەدەری و حەسنی بەسری ولەویٚ زیادە، (واصل بن عطاء) سەرۆکی موعتەزیلان، و(نظام) لەبەسرە بوون(نظام) یەکێك بوو ئایین و فەلسەفەی تێکەڵ کردووە.

نامەکانیان پێشبینیکاری تێدایە، فیساگۆریەتی، فەلسەفەی ژمارە، بڕیار لەسەر حوکم وفەرمانڕەواکان..

زانست لای یارانی سەفا:

برایانی سەفا بەخوێندنی بیرکاری و ژمارەو پیتەکان دەستیان پێکردووە، دواتر لۆجیك و سروشت، گشت شتێك دەگێڕنەوە بۆ دەروون وهێزەکانی و لەدوا کایە نزیك کەوتنەوە لە ناسینی خوداوەند لەشێوازی سۆفیگەری.[58]

سەرچاوەی زانستەکانیان:

-کتێبە فەلسەفییەکان

-مەجەستی –لەئەستێرەزانی بەتلیمۆس.

-بنجەکان لەزانستی ئەندازەی ئیقلیدس.

-راسپاردەی زێڕینی فیساگۆری.

-ئەسالۆجیا.

-وتارەکان(قەتیگوری).

---

[57] - حنا الفاخوری وخليل الجسر: تاريخ الفلسفه العربيه ص226-بيروت -1957م.

[58] - د.حسن ابراهيم :تاريخ الدولة الفاطمية،ص465، مكتبة النهضة المصرية –ط4، 1981.

-پێوەری فلوفوریوس.

ئامانجی سیاسیشیان هەبوو بۆ نمونە دژایەتی دەوڵەتی عەباسیان دەکردو کاریان بۆ رووخاندنی خەلافەتی عەباسی دەکرد،[59]

فەیلەسوفانی پێش ئەفلاتون Plato (347-428 پ.ز)، وئەفلوتین Platinus(204-270زاین) خاوەنی تیۆری ورشەیی=الاشراق و پژان=فیوض،وچەندان فەیلەسوفی دیکە بیروبۆچوونەکانیان خراوەتە نێو هزری ئیسلامی، لەرێی ئەوانیشەوە و بیرمەندانی دیکە گەیشتۆتە هەندێ رێچکەلە سۆفیگەری.

سۆفیگەری تێگەیشتنێکی نوێ یە لەخوداوەند ناسی و هەستناسکی سەرچاوەکەی قورئانی پیرۆزە: لەقورئانی پیرۆزدا لەمەزنی ئەم ئایەتە خۆی دەنوێنێت:

(( الله نور السموات والارض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح ,المصباح في زجاجة...)) النور: 35, بەڵێ ((خودا نوری ئاسمانەکان و زەوییە)) خوداوەند یی خودا لەم ئایەتەدا بەرجەستەیە:

((هو الاول والاخر والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم ..وهو معكم اينما كنتم..)) الحديد : 3-4. دیسان هاتووە: ((ونحن اقرب اليه من حبل الوريد)) ق: 16 بەلأم سۆفیگەری توانی خواناسیێکی دیکە بنیات بنێت ,لەرێگای خۆشەویستی ,بەتایبەتی خۆشەویستی خودایی.

---

[59] - عمر دسوقی: اخوان الصفا–ص92.

((بریانی سەفا تەواو لەگەڵ ئەرستۆ یەکن کەدەڵێت: هەر دروست کراوێك چوار بنۆسی هەیە، بۆنمونە تەختی دارین، بنۆسی (علە) بکەری دارتاشە، هیولانیەکی(مادده)دارە، وێنەییەکەی (شێواز) چواریانە(التربیع) (لەسەر دانیشتن). هەروەها هەردروستکارێك (صناع)ی مرۆیی پێویستی بەشەش شت هەیە: هیولییەك-(شوێنێك)، کاتێك، ئامرازێك وەك دەست و پێ، ئامێر وەك تەورو مشار، وجووڵەیەك، دروستکاری سروشتی پێویستی بەچواریانە: هیولی –شوێن –کات-جوڵە، تادەگەینە باری تەعالا کەپێویستی بەهیچ شتێك نییە لەبەر ئەوەی داهێنەرو دروستکاری ئەم شتانەیە واتە داهێنەری هیولی و کات و جوڵەو ئامێرو ئامرازە[60] کاری مرۆڤ یان بەدەستبەکاربوونە یان لێ پەیدابوون.

سەبارەت بەئاسمانەکان وخولگەکان (افلاك) دەڵێن:

((وجملة العالم احدى عشرة كرة، اثنتان في جوف فلك القمر وهما الارض والهواء، لازرع الارض والماء كرة واحدة والهواء والاثير كرة واحدة، وتسع من ورائه محيطات بعضها ببعض)) (اخوان الصفا: الرسائل-ج2،ص23) ئەم شێوەیەی خوارەوە پێکهاتەی خولگەکان (ئەفلاك) دیار دەکات لای ئەوان، جیهان لاوانی یازدە هەسارەیە، دویان لەنێو خولگە(فلك) مانگ دان کەزەوی وهەوان، لەبەر ئەوەی زەوی وئاویەك گۆن و هەواو ئەسیر یەك گۆن لەدوای ئەوانیش نۆ زەریای لەیەك،وێنەی ص246).

---

[60] - اخوان الصفا :الرسائل-ج3،ص358.



خولگەی دەوراندەور

خولگەی هەسارە چەسپاوەکان

خولگەی زوحەل

خولگەی موشتەری

خولگەی مەریخ

خولگەی خۆر

خولگەی زوهرە

خولگەی عەتارد

خولگەی مانگ

خولگەی هەوا

زەوی




## نامەکانی یارانی سەفا[61]

**دەروون(النفس) لای یارانی سەفا:**

---

[61] – د.صابر عبده ابازيد محمد:فكره الزمان عند اخوان الصفا، مكتبه مدبولى 1999،ل246.

**((دەروون واتە گیان، جەوهەرێکی ئاسمانی، نورانی، زیندوو، زانیار، کارا، بەسروشت، هەستیار،پێزان نامرێ و لەناوناچێ، تاهەتاهەتایە، یان لەخۆشایەتی دایە، یان لە ئازاردایە،....))**[62] **بڕوانە ئەفلاتون لەوتوێژی (فیدروس) کەباسی گیان =روح دەکات پێش هاتینە سەر زەوی،دەڵێت:**

**((دەروون،(گیان) بەباڵەکانی لەپۆپە هەرە بڵند دەگەڕا لەگومەزی ئاسمانەکان، چییەتی خۆشبەختی ئەودیو ئاسمانی دەبینی خۆشبەخت دەبوو بۆئەم بینینە، کە دەگەڕایە بوونی بەرهەست ئەو تەواوی و کەماڵەی پێشووی لەپێشان بینی بووی یادەکەوتەوە ))ئەمە دیدگایە لە وتوێژی (فیدون) یشدایە.**[63]

**دەڵێن : مانەوەی دەروون بنۆسە بۆبوونی هیولی, هەرکاتەی دەروون تەواو بوو هیولی تەواودەبێت, لەبەرئەمەیە هەسارگەکان (الفلك) لەخولانەوەدان. بۆپەیدابوونی کائیناتە, بۆئەوەی دەروون دەرکەوێت بەدەرخستنی چاکایەتییەکانی لەهیولی داو هیولی تەواو بێت بەوەرگرتنی ئەمە, گەروانەبوایە خولانەوەی تەنە ئاسمانییەکان لەهیچە دادەبوو ))**
**([64])**

**تیۆری نموونان و نموونەکراوەکان:**

---

[62] - **اخوان الصفا :الرسائل، ج3-ص290.**

[63] **-د.احمد فؤاد الاهواني: الفلسفة الاسلامية،ص82، الهيئة المصرية العامة لكتاب. طبعة ثانية -1985م.**

[64] **اخوان الصفا: رساله جامعه الجامعه ,ص62**

سەرچاوەی ئەم تیۆریە ئەفلاتوونە, ئەفلاتوون نمونەیەکی هێناوەتەوە بە ئەفسانەی ئەکشەوت, ناسراوە, ئەفلاتوون بۆ ئەوەچووە کەوا مرڤەکان کۆمەڵە کەسانێکن لەئەشکەوتێکدان دەست و پێ و ملیان بەستراوەتەوە, تەنیا دەڕواننە دیوارێکی پێش خۆیان , دیوارەکە بەرامبەر کونێکە لەپشتیانەوە- تیشکی رووناکی لێوە دێتە ژوورەوە سێبەری ئەو شتانەی لەدەرەوەن لەسەر ئەم دیوارە دەبینن, ئەو کەسانە گەر دەرەوەیان نەبینیبێت وادەزانن ئەم سێبەرانە راستەڤینەن, بەلاّم گەر دەرەوەی ئەشکەوتەکەیان بینیبێت ئەوا دەزانن ئەمانە سێبەرن وێنەی شێواوی راستی شتەکانە کەلەدەرەوەن.

بەهەمان شێو مرۆڤایەتی لەجیهانی ماددیدا لەنێو جەستەو هەست بەندکراون و پەیوەستن بە پێداویستییە ماددیە جەستەییەکان , رووناکیش هێمایە بۆ راستەڤینە گشتییە چەسپاوەکان کەلەجیهانی نموونەکاندایە ([65])} دوای ئەفلاتوون لەچاخەکانی ناوەڕاست قەشە ئۆگستین (354م-430م) لەبەررۆشنایی ئاینی مەسیحی تیۆری نموونەکانی ئەفلاتوونی دەستکاری کرد: وتی نموونەکان لە جیهانێکی ئاسمانی بالاّدا نییە (وەك ئەفلاتوون دەڵێت), بەڵکو لە هۆشی خوداوەند دایە و بیرو هزری ئەوە کەبەخۆی دروستی کردوون.

## تێخزان و کلّێشە گۆڕی:

[65] تاریخ الفکر الفلسفی ص38-39

تێخزان (حلول) تێخزان لەبنجدا لەئایینی براهمایی هیندۆسی دایە ، ئەو هێزانەیان دەپەرست کە بە بۆچوونی ئەوان کار لەگەردوون دەکەن و باوەڕیان بەتێخزانی ئەم هێزانە لەجەستەدا هەبوو, بتیان دەپەرست گوایە ئەم هێزانەی تێخزاوە دواتر تەنیا سێ هێز مایەوە:

براهما= خوداوەند یێتی ئەفرێنەر (خالق) .

سیفا(سیوا)= خوداوەند یێتی وێرانکەرو لەناوبەر.

بشتو= خزاوەتە ئەفرێنراوەکان.

کرشنە= ئەو مرۆڤەیە کەهەندێ خوداوەند یێتیە کانیان تێی خزاون. بوداش گوایە خوداوەند یێتی تێخزاوە([66])

مەسیحیەکانیش لەو باوەڕەدان لاهوت خزاوەتە ناسووت وەك تێخزانی ئاو لە دەفردا, نەستووری (لەسەردەمی مەئمون (118ك-218ه) دەرکەوتن، یەعقوبییەکان (لەو باوەڕەدان لاهوت و ناسوت وەك ماست و ئاو تێکەڵ بوون .)

مەلکانییەکان (مەلکا لەئەردەرۆم پەیدابوو) لەو باوەڕەدان خوداوەند یەکێکە لەسێیان واتە وێنەی خوداوەند یی سێ (باوك, کوڕ, گیانی پیرۆز): (نؤمن بالله الواحد) الاب مالك كل شيء وصانع مايرى وما لايرى.......))([67])

کلێشە گۆڕی:

---

[66] د. ابو زهرة: محاضرات في مقارنة الاديان ج1, 27-28, 54

[67] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کڵێشه گۆڕی, واته گیان لەجەستەیەکی مرۆیی, دوای مردن دەچێته جەستەی مرۆڤێك یان زیندەوەرێکی  دیکه, واته خولدەخواتەوەو تاهەتایه بەردەوام دەبێت. واته سزاو پاداشت لەم جیهانه دایه نەك له قیامەت. مانی باوەڕی بەکڵێشه گۆڕی هەبوو. بودیزمیش باوەڕی پێ هەیه سوکراتو و ئەفلاتوون باوەڕیان وابوو, ئەرستۆ دژی کڵێشه گۆڕی بوو.

**غەزالی و ئیسماعیلییەکان**

نیزامولمولکی سەلجووقی بەدوای ئەبوحامیدی غەزالی (450ک/1059ز)-(501ک/1111زاینی)، نارد بۆئەوەی بیکاتە بەرپرسی فێرگەی نیزامییەکان، ئامانجی سەرەکی ئەم کارەش بۆئەوەبوو دژی هزری ئیسماعیلییەکان بوەستێت.

غەزالی، فەیلەسوف و شارەزا لەزانستی ئاخاوتن (علم الكلام) و ئاینزان و سۆفیگەر، بیریارێکی مەزنی رۆژگاری خۆی بوو.

لەشاری توس لە خوراسان لەدایك بووە (باکووری رۆژهەلأتی فارس).

لە زووەوە کەوتە گومانەوەو لە کتێبە بەناوبانگەکەی (المنقذ من الضلال= رزگارکار لە گومڕایی)، بەرنامەی هۆشپەسندی لەسەر (علم الكلام) جێبەجێکرد، ئەو بەلگانەی خستەڕوو کە پێویستن بۆ سەلماندنی هۆشپەسندانەی ئیمان. ئەم گومانگیریە بەرەو (ئاشکرا بینی) ناوەکی و ((ژیانی دلّ))ی برد، هەر لە 1059ز (448ک)، سالّی تەنگژەکەی. تیایدا وازی لەوانەوتنەوە لە (النظامية) هێنا، لەو ماوەیەدا کتێبی (احياء علوم الدين)ی نووسی.

لە چوارچێوەی هەولی سەلماندنی هۆشپەسندانەی دەقە پیرۆزەکان، غەزالی (تهافت الفلاسفه)ی دانا، تیایدا نەسازی بیروبۆچوونەکانی فەیلەسوفە موسلّمانەکانی بە بۆچوونەکانی خۆی خستەڕوو, ئەوەیش لەلایەن ئیبن توفەیل و ئیبن روشد رەتکرایەوە.

غەزالی دەلّێت:

سعادة كل شيء لذته وراحته، ولذة كل شيء تكون بمقتضى طبعه، وطبع كل شيء ماخلق له، فلذة العين في الصور الحسنة، ولذة الاذن في الاصوات الطيبة، ولذة القلب الخاصة بمعرفة الله لأنه مخلوق لها.. ولا لذة أعظم من لذة معرفته... وكل لذات شهوات الدنيا متعلقة بالنفس، وهي تبطل بالموت، ولذة معرفة الله متعلقة بالقلب، فلا تبطل بالموت لأن القلب لايملك بالموت، بل تكون لذته اكبر وضوؤه اكبر، لأنه خرج من الظلمة الى النور)).

له ئاكامدا غەزالی گەیشتە ئاکامی جیاکردنەوەی ((جیهانی ئاشکرابینی)) و ((جیهانی مەلەکوت)) واتە بەرهەست و بەریاسا فیزیاییەکان و جیهانی نابەرهەست و گوزارەیی.

واتە یاساکان بەشی بەرچاو لەلایەن مرۆڤەوە لەسەر سروشتی لایەنی گوزارەیی جێبەجێ نابێت، باشترین شێواز بۆ تێگەیشتن لە لایەن گیان ئامرازی تایبەتی خۆی هەیە.

غەزالی رێگای سۆفیگەری هەڵبژارد بۆ گەیشتنە یەقین.

ئەم لایەنەی لە کتێبەکەی (مشكاة الانوار) دەردەکەوێت کە لەبەر رۆشنایی ئایەتی 35 لە سوورەتی نوور:

((الله نور السماوات والارض مثل نوره كمشكاة فهما مصباح المصباح فى زجاجة الزجاجة، كانها كوكب درى يوقد من شجرة مباركة زيتونة لاشرقية ولاغربية يكاد زيتها يضئ ولو لم تمسه نار نور

**يهدى على نور الله لنوره من يشاء ويضرب الله الامثال للناس والله بكل شيء عليم)).**

**غەزالی دەیوت نووری مەبەست لەم ئایەتەدا خودایە، هەروەها ئاماژەبە هەموو تەنێکی درەوشاوەی وەك (مشكاه= چرادان) و ئەستێرەکان و هەتا هۆشی رووناك، لەبەر ئەوەی رووناکی هۆش دەتوانێت لە کات و بۆشایی رەت بێت. واتە لە ڕێگای دڵەوە مرۆڤ دەگات بەیەقین.**

**پێویستی بەفەلسەفە نامێنێت بۆ ئەو مەبەستە لەبەرئەوەی خوداوەند دەکەوێتە دەرەوەی بواری هزری لۆجیکی  وەك لە کتێبی (تهافت الفلاسفه) باسی دەکات ، بەڵام لە دواکایە ئیبن روشد بەکتێبی (تهافت التهافت) وەڵامی دایەوە. رۆڵی فەلسەفەی زیندوو کردووە لەگەیشتن بەیەقین، لەگەیشتن بە دڵنیایی لە بوونی خودا، بەڵکو فەلسەفەی بەباڵاترین پایەی ئاییندارى دانا.**

## یەکێتی بوون (وحدە الوجود)
## (Pantheism)

یەکییەتی بوون لەرۆژئاوادا:

لەرۆژئاوا ئەوانەی باوەڕیان بەیەکێتی بوون بوو, دابەشی سەر سێ بەشیان کرد یان سێ جۆر لەیەکێتی بوون:

-یەکێتی بوونی لکاو Pantheism.

-یەکێتی بوونی جیاکراوەParentheism.

-یەکێتی بوونی خوداوەند یی .

لەوانەش :

1- جوردانوبرونو, (1518-1600ز=992ك-1009ك) ماددیگەر بوو.

2- لیپنتز, (1646-1716=1051-1128ك).بانگەشەی بۆ تیۆری گیانی گشتی Papsychism,بەواتای باوەڕبوون بەوەی کەوا سروشت هەمووی ئەتۆمن یان یەکەی گیانی رێك لەگەڵ هزری ناوی نان مۆنۆدەکات.

3- فەیلەسوفی ئەڵمانی ئوتولیبمان, (1840-1912ز=1256-1331ك) بۆئەوە چووە کەوا فەلسەفەی شوبنهاور (1788-1860ز) =1213-1277ك) نمونەی فەلسەفەی هربارت, ناوی نا یەکێتی بوونی شەیتانی Satanism-pan .

4- بوونگەرایی کەسانی(الوجودیە الشخصانیە) -Personalism Pantheisitic ئەم بۆچوونەی هەیە کەدەڵێت: راستی بەو ئەتۆمە

هەرە زۆرانە دەوترێت کەجیهانی ئەتۆمان بەشێکن لەو،ئەم ئەتۆمە پیرۆزانە سەربەخۆنین جیا لە ئەفرێندراوکان .

فەلسەفە لەیەکێتی بووندا:

پەیوەندی نێوان خوداوەند و جیهان لەهزری هیندیدا پەیوەندی ئەفراندن و داهێنان نییە لە نەبوو, بەڵکو پەیوەندییەکی (پژان=فیض) و دەرچوون و دەرکەوتنە

((من هەر ئەو ئەفرێندراوانەم, لەبەرئەوەی لەخۆمیان دەئافرێنم, بەم شێوەیە بوون پەیدابووە)).

هەتا گاندیش دەڵێت: ((خوداوەند لەبەرد حەشاردراوە, هەموو بەردێك بەرەهایی ))

هزری هیندۆسی دوو هێڵی سەرەکی تێدایە:

1- خوداوەند یێتی دانە جیهان (بوونەوەران ).

2-جیابوونی خوداوەند یێتی لەجیهان.

لەهزری چینیدا:

بایەخدان بەمیتافیزیکیا کەمە, کتێبی (گۆڕانەکان)ی( ون ئنج) ئاماژە بەوەدەدات, بنیاتی بیرۆکەکە بۆلێکدانەوەی دیاردە گەردوونییەکان, هەشتن, هەریەکەیان ریز بەنددارییەکی سێ هێڵی هەیە, هەریەکێکیان ئاماژە و سیمبولە بۆدیاردەیەکی گەردوونی لەبارو ئەرێنی بەپەیوەست

بەدیاردەیەکی دیکەی نەرێنی, کتێبەکە ناوی لەدیاردە نەرێنییەکە ناوە (ین) واتە مانگ و دیاردە ئەرێنییەکەی ناوناوە(یانگ) واتە هەتاو.

لەرۆژهەلأتی دێریندا :

راڕەوی بەزیندووگری دیاردەکان باوبوو, دیاردەی وەك پەرستنی دیاردە سرووشتییەکان , وەك هێمایەك بۆ خوداوەند یێتی ,دیاردەی بالأدەست بوونی دوو هێزی پەیداکردن و گەشەسەندن بەرچاون کە,دیاردەی کۆمەلگەی کشتوکالێن. لەداستانی ((ئەنیوما ئیلیش)) سەبارەت بە بوون و سەرەتاکانی گەردوون و خوداوەند مەردۆخ ((دانیشتن بۆراگەیاندنی ناوەکانی هەریەکەیان ناوەکانی لەبیرە لەشوێنی پیرۆز بابەئاشکرا پەنجا ناوەکانی رابگەیەنین)) لەدۆلی نیلدا خەلك جیاوازی لەنێوان خوداوەند یەکان و شتەکان و مرۆڤ تەنیا لە شێوەدا دەزانێت, پادشاکانیان بەخوداوەند و نوێنەری ولأت لەنێو خوداوەند کان دەزانی, واتە باوەڕیان بەتێخزان (حلول) هەبوو, خوداوەند دەخزایە گیانی پادشاو خوداوەند یێتی پێدەبەخشی.

لەلای یۆنانیەکاندا :

بیرو بۆچوونی فرەلایەن هەبوو:

ئاشیانەکییەکان (الرواقیون):

لەو باوەڕەدابوون گەردوون دووبنەمای هەیە, یەکەم بنەمای کارابوون, دووەم بنەمای بەرکار بوون, ماددەش ئەم بنەمای بەرکاربوونەیە, گەوهەرێکە هیچ سیفەتی تێدانییە. بنەمای کارایی واتە خوداوەند پێتی , ئەو هۆشەیە لەماددەدایە کەوا وێنە بە شت و بوونەوەران دەبەخشێت.

★ئورفییەکان :

باوەڕیان بەیەکێتی بوون هەبوو, زیۆس, تاکەخوداوەند بوو, لەهەموو شتێکدا خوداوەند یەو لەهەموو شوێنێك دایە, ئورفیەکان لەو باوەڕەدابوون, ئامانجی ناوەندی مرۆڤ لەسەر راستەقینەی گیانی دامەزراوە, مەبەست توانەوە نییە لە چلە پۆپەی بێ کۆتایی خوداوەند یی.

★ئەفلاتوون (428-348پ.ز) (بوون) لەهێزدا پێناسەدەکات, یان بوون گریمانەی هێزدەکات و بەپێویست ملکەچییەتی)) کارای هۆش و بەکاریەتی, کەواتە نەبوون, نییە .ئەوەشیان لەدیالۆگی ((گرفتی هەڵەو نابوون)) دەخوێندرێتەوە, لەدیالۆگی نێوان تیئیس و نامۆدا , نامۆ چەندان گوتەی زۆر ترسناك دەخاتە روو.

⭑ئەرستۆ (384-322 پ.ز): خوداوەند ی ئەرستۆ بزوێنی نەبزواوە ,واتە ئەوەی جیهانی بزواند وجێی هێشت.
ئەم دوورخستنەوەی خوداوەند   لەهزری رۆژئاوادا بەردەوام بوو, چاخی رۆشنگەری لەسەر هۆشپەسندی پوخت دامەزراوە.
بەرامبەر بە وانەش زۆربەی  فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەم گریمانەیان بەپێویست نەزانیوە باوەڕیان بە زانیاری زانستی هەبووە.

سپینوزا



سپینوزا , پێشەنگی یەکێتی بوون لەهزری رۆژئاواییدا:

**سپینوزا(1632-1677) فەیلەسوفێکی مایەخوازی هۆڵەندی بوو, لەدژی دوانەتی دیکارت دەیوت ((هەر سروشت هەیە, ئەویش بنۆسی (علە) خۆیەتی, بۆبوون پێویستی بەهیچی تر نییە)). لەسەر ئەم بنەڕەتەی کەوا سروشتێکی پەیداکارە (خالیقە) گەوهەرێکی خوداوەند ییە. گەوهەر یەکە کەچی بارە جیاجیاکان فرەن.**

**سپینوزا بەسێ چەمك دەستپێدەکات:**

**گەوهەر: واتە راستەقینەی بنچینەیی نەگۆڕو, بنیاتنانی یاساکانی جیهان.**

**سیفەت: رواڵەتێکی گەوهەرە یان راستییە بێ کۆتاییە کەیە, وەك فرەوانبوون و هزروبیر.**

رواڵەت(عرض)؛ شتێکی دیاریکراوەیان, شێوەیەکی دروستکراوە. سپینوزا مەبەستی لەگەوهەر؛ سیستەمی هەتاهەتاییٚ یە یان (سنە اللە) یاسا سروشتییەکان .

جیهان دابەش دەکات بۆ گەوهەر واتە (خوداوەند پێتی) ورواڵەت واتە ماددە وهەڵکەوت (حادث)واتە جیهانی ماددی بەرهەست, بەلاٚم گەوهەر لە ئاستی ماددە بالاٚترە.

بەبۆچوونی وی خوداوەند جیهان نییەو, جیهانیش خوداوەند نییە.

*ئەفلاتوونیەتی نویٚNeoplatonism , لەسەردەستی ئەفلوتین 203-270م دارێژراوە, فەیلەسوفێکی یۆنانی بوو, Plotin لە ((نۆییانە)) کانی دانووسیویەتی : ((گیان رەهابوون بەرەوخوداوەند )) واتە لەهەموو شتێك رەهابوون. لەسەرەمەرگدا وتوویەتی؛ هەوڵدەدەم ئەوەی خوداوەند پێتی یە لام بیگێڕمەوە بۆخوداوەند پێتی کەلەگەروودندا هەیە)).

میتافیزیکیای ئەفلوتین بە سێیانەی پیرۆز دەست پێدەکات؛

یەك, هۆش, دەروون, ئەم سێیانەیە یەکسان نییە, بەڵکو یەکەمیان لەسەرووی دووەمیانە, ودووەمیان لەسەرووی سێیەمیانە, یەك... واتە خوداوەند خاوەن تەواوی و بەخشینە , بوونەوەرێکی لەخۆی نزمتری لیٚ پەیدادەبێت بە هەڵڕژان (فیض) کەهۆشی گشتییە یان گیانی رەها, هۆشیش دەروونی گشتی لیٚ هەڵدەڕژیٚ و لەویشەوە دەروونە پاژەکییەکان, واتە شتەکان لە یەکەم بوونەوە پەیدابووە...خوداوەند . کەواتە هەمووی تێکبەستەیەو یەکچینە وپەیوەست و وەك یەکی تەواو , لەبەرئەوە ئەم

**جیهانە , بواری جیهانە شیاوەكانە, بەگشتی چاكەو باشە, خراپە چەشنێكە لەنەبوون.**

**لەكۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئەم پرسە رەهەندی دیكەی وەرگرت بەهۆی ئەوەی دەقێكی بنەڕەتی لەئارادایە كەقورئانی پیرۆزە, دەقی دیكەش وەك فەرموودەكانی پێغەمبەر (د.خ) و ئاینزانی (فیقە) و زانستی دوان (علم الكلام)و سۆفیگەری... هتد.**

**فەیلەسوفانی موسڵمان و سۆفیەكانیش , یەكەم هەنگاوی گرتوونەتە بەر لێكدانەوەی (تاویل) ئایەتەكانی قورئانە سەبارەت بەدروستكردنی جیهان بەگیانی تیۆری هەڵڕژان (فیض) , بەواتای ئەوەی جیهان لەخوداوەند وە بەهەڵڕژان پەیدادەبێت.**

**فارابی (لە 329ك مرد).یەكەم كەسە تیۆری دەرچوون (الصدور)ی لە فەلسەفەی ئیسلامی خستە روو ئەفلوتین كاریگەری لەسەر فارابی هەبووەو ,فارابی تیۆرییەكەی وەرگرتووە.([68]) بەم جۆرە هەموو هۆشێك كارایە بەگوێرەی خوارەخۆی, وكارتێكراوە بەگوێرەی سەرووی خۆی, هۆشی كارا هەمیشەو, هیچ كاتێك بەركار نابێت بۆ جگە لەخۆی, ئەویش خوداوەند یەئەم رێچكە فەلسەفییە , لۆجیەكەی فارابی هاوكاربوو بۆدانانان بەدوو بیرۆكەی شیاوی بوون و,بوونی پێویست, لەبری دوو بیرۆكەی دێرین و داهێنراو , واتە تیۆری لەنەبوو دروستكردن.**

[68] جورج طرابيشي: معجم الفلاسفة-دار الطليعة بيروت, ط2, 1997, لافارابي ص449-450

لەبۆچوونەکانی فلوتین دەبینین!

1- کردەوەی دەرچوواندن ویستەنی(ارادی) نییەخۆکارانەیە, لەلای هەردوو لایاندا هەیە.

2- بنیاتی پێکهاتەی دەرچوواندن, لەسێ پایەی یەکەم, هۆی یەکەم-هۆیە دووەمینەکان –هۆشی کارا , دەروون –وێنە –مادده لەجەستەکاندایە , جەستەکانیش شەش رەگەزیان هەیە: ئاسمان , مرۆڤ , ئاژەڵ, رووەك ,کانزا چوار توخمەکە,لەم جەستانەشدا گەردوونی گەورە پیکدێت, هەمان تیۆری و سیستەمی ئەفلوتینە بەهەموارکردن لەسەر ئاستی لك و ناوەکاندا.

3- بایەخ دان بەژمارەکان , لەکتێبی (مبادیء الموجودات و السیاسات المدنیة)) شەش چەشن دادەنێن؟! لە ((رسالة في اثبات المفارقة)) ژمارەکە چوارە..

4-بوونەوەرە هەڵڕژاوەکان لەگەڵ زۆریان, لەگەڵ یەکەم بوونی دادپیەروەردا یەکن, هەمان بیرۆکەیە لای هەردووان. هەرچەندە فارابی هەنگاوێك لە یەکێتی بوونی ماددی نزیك بۆتەوە, بەڵام دووبارە ئەڵقەکە دەبەستێتەوە بەمیتافیزیك. بەڵکو فارابی مادده بە پووچ دادەنێت و لەدواکایە یەکێتی بوونی فارابی ماددیانە نییە. دواتر فەیلەسوفانی دیکە تیۆری (دەرچواندن) یان باسی کردووە

وەك:*ئیبن سینا-تەوەری فەلسەفەكەی ((پەندیاریی رۆژهەڵاتی)) بوو.( [69] )

**تیۆری هەڵڕژان (الفیض):**

ئەم تیۆرییە سەر بە ئەفلاتوونیەتی نوێیە و یەكەم فەیلەسوفە خوداوەند و شتەكانی لەیەك جیا كردەوە. شتەكان (مادده) ی وادانا لەیەكەم بوونەوەر لەرێگای هەڵقوڵین و پژان (فەیز=فیض) ەوە دەرچووە.(1)

ئەفلوتین دەڵێت گەردوون لەرێگای لێ جیا بونەوە لەیەكەم پەیدانەبووە, لەبەر ئەوەی جیابوونەوەی لەیەكەم كەم دەكاتەوە, بەڵكو لەرێی پژان و (فەیز) دەرچووە ئەویش ترووسكانەوەیە لەسروشتی یەكەمدا دەردەچێت.

پژانیش بەچەند قۆناغێك دەبێت, ئەفلوتین دەڵێت:

یەكەم: قۆناغ لەم پژانە هۆشی گشتی لێ پەیدابوو. سیستەمی گەردوون و كاكڵ (جوهر)ی بونەوەرانیشی گرتەوە.

دووهەم: هەڵڕژانی دەروونی گشتییە لەهۆشی گشتی , ئەو هێزەیە كەوا گەردوون دەبزوێنێت ,بەپێی ئەوسیستەمەی لەهۆشی گشتیدایە.

---

[69] سماح رافع محمد, تاريخ الفكر الفلسفي ص19.

سێیەم: دەرچوونی دەروونە گشتییە پاژەکییەکان لەدەروونە پاژەکییەکانکەهێزی لاوەکییە کەوا بوونەوەرە تاکەکان دەبزوێنێت, جۆرە بوونەوەرەکان لەجیهانی سروشتدا بەردەوام دەبێت.

سنووری لەوداو لەدەروونە پاژەکییەکان وێنەو هیولی دەردەچێت لەویشەوە چوار توخمەکان پەیدادەبن (ئاگر,ئاو, هەاو ,خاك) لەوەشەوە بوونەوەرکان دروست دەبن لەژێر کاریگەری خولگەکان (افلاك) وهۆکاری چوار سروشتەکە ( [70] )

ئەم تیۆرییە چەندان فەیلەسوفی ئیسلامی بەرگری لێ کردوە وەك: فارابی و ئیبن سیناو ،ئیخوانی سەفا.

[70] اليازجي: الموجذ في المسائل الفلسفية الاسلاميةص32.

دەرووی دووەم: سۆفیگەری

بەشی یەکەم:

پێکهاتەی هزری ئیسلامی

هزری ئیسلامی بەپێی لێکدانەوەی زانستی چواربەشە:

1- فەلسەفەی ئیسلامی: ناسراو بە فەلسەفەی رۆیاریی ئیسلامی (مەشائی ئیسلامی) وەك لای : کندی، فارابی، ئبن سینا لە رۆژهەلاتدا، ئبن روشد و ئبن باجەو ئبن توفەیل لە رۆژئاوای ولاتانی ئیسلامیدا.

2- زانستی ئاخاوتن=علم الکلام، هەروەها بە (علم اصول الدین) یان (علم التوحید)یش ناسراون.

3- بنجەکانی ئایینزانی (فیقە)، لە کۆتاییەکانی سێیەم دەیەی سەدەی بیستەم دەرکەوت.

4- سۆفیگەری ئیسلامی.

—پێناسەی سۆفیگەری

نووسین سەبارەت بەسۆفیزم (Sufisme) یان گیانگەرایی (الروحانیە Mysticism) فرەلایەنە، هەرلەمێرگ و گوڵستانی زاهیدانەوەتا سۆفیە فارس وکوردو عەرەبەکانەوە، تاترۆپکی رامانە فەلسەفییەکان، یان پێدەشتی خەڵکی رەشۆکی و بەمەزن گرتنی ئەولیایان. تا ئەو پەڕی چیای نەدیوستان و(( سیمورخ)) ی سۆفیستان.

**ناساندنی چەمكی سۆفیگەری:**

**بەو چیرۆكە دەست پێدەكەین كەوا جەلالەددینی رۆمی گەورە سۆفیستی زانا لە سەنائی وەرگرتووە بەناوی ((پیاوە كوێرەكەو فیل)) هەمان چیرۆك لەلایەن شاه وەلی الله ی دهلوی بەكارهاتووە، چەند كوێرێك هەوڵیان داوە بەدەست وەسفی فیل بكەن هەریەكەبەپێی ئەوبەشەی دەستی پێكەوتووە، وەسفی دەكات، هەیە دەیوت وەكو تەختی پادشایە (عەرشە) هەیە دەیوت باوەشێنە، هەیە دەیوت نێرگەلەیە، كەسیان نەیاندەزانی چییە!**

**زاراوەی (سۆفیزم ) (sufismus) یان (Sufik) ئەو وشەیە بۆ بابەتە گیانەكییەكان بەكاردێت لەئیسلامدا، بۆ زانینی بابەتی گیانەكی (Mystic) .**

**سەبارەت بەسەرچاوەی وشەی سۆفیگەری، چواربۆچوون بۆ بەزاراوە عەرەبیەكە (التصوف) لەئارادایە: ([71])**

**یەكەم: لەوشەی (الصفە) ەوە هاتووە، كە چۆلاییەك بوو پەیوەست بوو بە مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) لەشاری مەدینە. كۆمەڵە كەسێكی هەژارو بێنەوای تێدا دەژیا وخوداوەند پەرستیان دەكرد. هەندێكیان هەمیشەیی لەوێ بوون وەك: ئەبوزەری غەفاری، موسای ئەشعەری، سەلمانی فارسی،**

---

[71] د.اسعد السحمرانی، التصوف منشاه و مصطلحاته، دار النفائس بيروت –لبنان) ط2،2000م، ل15-15.

هەندێ جار ژمارەی دانیشتوانی سەفا دەگەیشتە سێسەد کەس یان زیاتر[72].

لەرووی داڕشتنەوە وشەی (صفه) دانە پاڵ (نسبه)ی دەبێتە (صفی) نەك (صوفی)، بەلآم لەگەڵ ئەوەشداکاریگەری رەفتارو رەوشتی دانیشتوانی سەفا نابێت فەراموۆش بکرێت لەمێژووی سەرهەڵدانی خۆنەویستی (زهد)دا.

دووەم: لەوشەی (الصوفه) واتە ئەوانەی کارگوزاری کەعبەن بەتایبەت ئەوانەی لەپێش ئیسلام خزمەتییان دەکرد. ئەوەیان گریمانەیەکی راست نییە.[73]

سێیەم: لەوشەی (الصوف) (خوری)، واتە پەشمینە (خەرقە)ی لەخوری دروستکراو پۆشین. مەرج نییە هەموویان پەشمینەی لەخوری دروستکراو پۆش بووبن.

چوارەم: لەوشەی (الصفاو) واتە پاك و روونی دڵ، ئەوەتا بشیر بن ئەلحارس حافی دەڵێت: ((الصوفی من صفا قلبه لله)) واتە سۆفیگەر ئەو کەسەیە کە دڵی بۆ خوداوەند پاك وروون بێت، ساف بێت.

پێنجەم: لەوشەی (سۆفۆsophos) ی یۆنانی وەرگیراوە، بەبەڵگەی بۆچوونەکانی (اخوان الصفا).

---

[72] -د.اسعد السحمرانی، التصوف منشاه و مصطلحاته، دار النفائس بيروت –لبنان) ط2،2000م، ل15-15.

[73] - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پێناسە: زاراوەی سۆفی و سۆفییەتی لەسەدەی دووەمی کۆچیەوە لەهزری ئیسلامیدا پەیدابوو، پێش ئەوە وشەی زاهید (زاهد) و(زهد) ی بۆ بەکاردەهات(لەسەدەی یەکەمی کۆچی)[74]

رەفتاری سۆفیگەریانە لەسەر گریمانەیەك دامەزراوە دەڵێ: ( ( مرۆڤ لەدوو جیهان پێکهاتووە: جیهانی جەستەو جیهانی گیان، ئەم جەستە چڕە سەربە ئەم جیهانەمانە... بەلآم گیان سەر بەم جیهانە نییە، بەهیچ هۆیەکەوە بەو پەیوەست نییە، لەم جیهانە مایەکییە(ماددییە) نامۆیە، ڕێگای سۆفیگەر، بە کۆشش وراهێنانانە، شکستهێنانە بەم جەستەیە وکردنەوەی شیشەکانی ئەم قەفەزەی جەستەیە، تاوەکو گیان رەها بێت و بەرەو مەلەکوتەکەی بڕوات)) [75]

ئەم فەرموودە (حدیث)ی ، کە فەرموودەیەکی قودسییە، دەستپێکی سۆفیگەرانە لەرێکخستنی رێبازەکانیان، لەم فەرموودەیەدا هاتووە:

((من عادی لی ولیا، فقد اذنته بالحرب، وما تقرب الي عبدي بافضل من اداء ما افترضت علیه، وما یزال عبدي یتقرب الي بالنوافل حتی احبه، فاذا احببته کنت سمعه الذي یسمع به، وبصره الذي یبصر به، ویده التي

---

[74] –رینولد.ا.نیکولسن:فی التصوف الاسلامی وتاریخه –ترجمه ابو العلاالعفیفی مطبعة لجنة التالیف والنشر-1947.

[75] –خلیف، د. فتح الله، محاضرات الفلسفة الاسلامیة، بیروت-مكتب كریدیة، سنة 1975، ص7./س4 ص22/

**يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، ولئن سالني لاعطينه، ولئن استعاذني، لاعيذه، وما ترددت عن شيء انا فاعله ترددي عن قبض نفس المؤمن يكره الموت، وانا اكره مساءلته)**[76]

**(( ئەوەی دوژمنداری وەلییێکی من بکات ئەوا جەنگی لەگەڵ رادەگەیەنم، بەندە بەهیچ شتێك لەمن نزیك نابێتەوە، کە خۆشم لێی بێت، جگە لەبەجێهێنانی فەرزەکان نەبێت، گەر خۆشمویست: دەبم بەگوێی کەپێی دەبیستێت، بینایی کە پێی دەبینێت، دەستی کە تۆڵەی پێدەکاتەوە،پێی کەپێی دەڕوات، گەر داوام لێبکات پێیدەبەخشم، گەر پەنای بۆ هێنام پەنای دەدەم، لەهیچ شتێك ئەوەندە دوو دڵ نەبوویم، رارا نەبوویم، لەوە نەبێت لەدەروونی بەندەی باوەڕدارم نەبێت: مردنی پێ ناخۆشە، پێم ناخۆشە زیانی پێبگات))**

**لەدواکایە دەگاتە پایەی ئیحسان- چاکەگەری واتە، وەك لەفەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)  هاتووە: کەلێیان پرسی ئیحسان چییە ئەی پەیامبەری خودا؟ فەرمووی :**

**(( الاحسان ان تعبد الله كانك تراه، فان لم تكن تراه فهو يراك)) .**

**چاکەگەری ئەوەیە خوداوەند  بپەرستی وەك ئەوەی بیبینیت، گەر نەیبینیت ئەو دەت بینێت )) بەم جۆرە (وەلی) ئەو کەسەیە گەیشتۆتە**

---

[76] – **بوخاری گێڕاویەتییەوە /س4،ل22/.**

پێگەی ئیحسان وخودا دەیپارێزێت وسەری دەخات. ئەوەشیان لەگەڵ ئایەتی قورئانی پیرۆز یەکدەگرێتەوە (یونس، ایە 62-63)

(( الا ان اولیاء الله لاخوف علیهم ولاهم یحزنون..)) بەم جۆرە زاراوەی سۆفیزم =سۆفیگەر، چەند واتای هەیە لای لێکۆڵەرەوان،

کلابازی دەڵێت : (( هەندێك دەڵێن (صوفیە) بەهۆی (صفاء اسرارها ونقاء اثارها) ناونراون، واتە دڵ و دەروونیان پاك و ئاشکرایە.

بشر کوڕی حارس ( بشر بن حارپ) دەڵێت : (( الصوفي من صفا قلبه لله))

(( سۆفیگەر ئەو کەسەیە دڵی بۆ خوداوەند ئاشکراوساف بێت )) .

هەندێکی دیکە دەڵێن : ناونران بەسۆفیگەر چونکە لە (الصف الاول – ریزی یەکەم ) دان لەبەردەستی خودا ..))[77]

پەیدابوونی سۆفیزمی ئیسلامی :

بەیرونی (44 کۆچی مرد) بۆ ئەوەچووە سۆفیزم لەوشەی ((سۆفیا))ی یۆنانی واتە ((پەندیاری))یەوە هاتووە.

((ولما ذهب في الاسلام قوم الی قریب من رایهم، سموا باسمهم))

((تحقیق ما للهند من مقولة –ج1(24-25).)

(واتە کەسانێك لەئیسلامدا وەك ئەوانیان دەکرد ونزیك بوون لەرای ئەوان، ناوی ئەوانیان لێنان).

---

[77] – الکلاباذی، م.س،ل5

یان هەیە دەڵێت لەوشەی ((Gymnosophists)) (( جیمنوسوفیا)) یە واتا

(پەندیارە رووتەکان)) یۆنانیەکان وایان بەهیند دەوت، وشەکە بۆ یەکەم جار لەئەسکەندەریەی میسر دەرکەوت،دواتر لەکوفە.

-سۆفیزم دەروویەك بوو بۆ دەربڕینی نارەزایی وبەرهەڵستکاری لە دژی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی وگەندەڵی باو، بەتایبەتی ئەو نەتەوانەی تازە ببونە موسڵمان.

لەم ناوەدا خوراسانییەکان لەپێشەوەی ئەم نەتەوانەبوون،سەرەڕای لەناوبردنی شکۆمەندی نەتەوەییان،زوڵم زۆری دەسەڵات وایکرد بەدوای بەرگری وبەرهەڵستی بگەڕێن .بۆ نمونە ((دەبینین شێست زاهید پەشمینەیان پۆشیوە، بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم،کەمیرێکی پێشووی فارس بوو، بۆ ئەوەی بانگەوازی شێوازێکی نوێی ژیان بدەن.لەکوفەو بەسرەش زاهیدی وادەرکەوتن وەك حەبیبی عەجەمی بازرگان، عەبدوڵلای کوڕی موبارەك بانگەواز بۆ بزووتنەوەیەکی سۆفیگەرانە دەدەن، لەئاکامدا چلە پۆپەی گەیشت بە لەسێدارەدانی حەلاج .

-سۆفیزم لەهەندێ لەو قۆناغانەدا کەدەسەڵات توانی دەست بەسەر هەندێکیاندا بگرێت و وەك ئامرازێکی خۆی بەکاریان بێنێت و بوون بەواجیهەیەکی دەسەڵات، رۆڵی سلبیان هەبوو لەخەواندن و سڕکردنی کۆمەڵگە و لەبیر بردنەوەی ئامانجە سەرەکییەکانی.

لەم بارەدا دەبن بەكۆمەڵەیەكی بێكاران و ((ملكەچی زاڵم))بوون و لەم ڕێیەوە فەرمانڕەواكان خەڵكانێكی زۆر خەریك دەكەن ئاگایان لەواقیعی تاڵی خۆیان نەمێنێت.

**پێناسەی سۆفیزم لە دەروەی وڵاتە ئیسلامییەكان:**

لا هوتیانی سەدەی ناوەڕاست، باس لە لاهوتی سۆفیزم دەكەن Mystical tgeology پێناسەی : پەند یاری ئەزموونەكییە، یان (( ڕەهابوونی گیان بۆ خوداوەند لە ڕێگای هاندەری خۆشەویستی قووڵ)). ([78])

ڤۆن هارتمان V.Hartman سەبارەت بە سۆفیگەری دەڵێت: پڕبوونی هەست و نەست بە ناوەڕۆكێكی دیاریكراو ( وەك سۆزو هزرو ئارەزوو) نەویستە لە نەستدا Vncon ciaus گۆتە Goethe دەڵێت:

سۆفیگەری (لێكۆڵینەوەی دڵەو دیالۆگی هەستەكان، یان ویژدانی هۆشی)).

ئەندرهل E.Vnleohill هونەری یەكبوونە لەگەڵ ڕاستی، سۆفی ئەو كەسەیە كە گەیشتۆتە ئەم یەكبوونە بە پلەی جیا جیا، یان ئەو مرۆڤەیە كە ئامانجی گەیشتنە بەم ئامانجە، یان لەو باوەڕەدایە بگاتە ئەم ئامانجە))([79])

---

[78] ابن سینا: الاشارات /104/2).

[79] د.محمد كمال ابراهیم جعفر، التصوف، طریقا وتجربةو مذهبا- 1970 دار الكتب الجامعیة . ل115)

**بەشی دووەم:**

پێگەی سۆفیگەری لە هزری ئیسلامدا

**زانایان لەسەدەی چواری کۆچی (دەی زایینی) زانستیان دەکردە دوو بەش یەك: زانستە ئیسلامییەکان کە: زمان، فیقە، کەلام، مێژوو، ئەدەب بوون.**
**دوو: زانستە نا ئیسلامییەکان: فەلسەفەو، سروشت و پزیشکی بوون.**
**ئەم دابەشکردنە یەکەمجار لای ئەبوعەبدوڵلاَ محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف خەوارزمی لە پێشەکی کتێبەکەیدا بەناوی (مفتاح العلوم) دەڵێت:**

**((وجعلته مقالتين: احداهما لعلوم الشرائع وما يقترن بها من العلوم العربية، والثانية لعلوم العجم من اليونانيين وغيرهم من الامم))([80])**
**بەم جۆرە بابەتە سەرەکیەکان هەنگاو بەهەنگاو دروست بوون سەرەتا زانستی بڕیارەکان (علم الاحكام).([81])**
**هەر بەم جۆرە ئایینزانی (الفقه) پەرەی سەندو چەندان فێرگەی ئایینزانی پەیدابوو. ئەوانەی خاوەن سەربەخۆیی وئیجتهاد بوون ناونرا ن(خاوەن رایان-أهلی الرأی) زۆربەیان لە عیراق بوون و ئەوانەی خاوەن فەرموودەن لە مەدینە بوون.**

---

[80] الخوارزمي: مفتاح لعلوم ص5، ليدن 1895.

[81] دى بور: تاريخ الفلسفه فى الاسلام، ص50، ترجمه أبى ريده، القاهره 1954.

پێشەوای خاوەنڕایان ئەبوحەنیفە (لە 150کۆچی مرد) بوو.
خاوەن فەرموودەکانیش پێش مالك( لە ساڵی 189 کۆچی مرد) خاوەن رابوون هەرچەندە بەکەمی بەکاریان دێنا .
ئینجا ئیمام شافیعی دێت (لە 204 کۆچی مرد) خاوەن رێچکەیەکی ئایینزانی سێیەم بوو، زیاتر پشتی بە سونەت (ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ)دەبەست. وەك ئەوەی زانستێکی پراکتیکی بێت یاساو کارو ئەرك و پەسند و شیاوو رێپێدراو رێپێنەدراوەکان دیار بکات.
زۆر لە فیقهزانان هەبوو خاوەن بۆچوونی سۆفیگەریانە بوو وەك حارسی کوڕی ئەسەد موحایبی، خاوەن کتێبی (الرعایە لحقوق اللە) )، یان دواتر ئەبو تاڵیبی مەکی لە کتێبی (قوت القلوب)، غەزالی بەکتێبەکەی (احیاء علوم الدین).
سەرەڕای سۆفیگەری پەیوەست بە دڵ و گیان تارادەی ناکۆکی و جیاوازی لەنێوان فیقهزانان و سۆفیان سەری هەڵدەدا.

هەڵوێست لە سۆفیگەری

سیراجی توسی لە (اللمع)لاپەڕە43

هەوڵی یەکخستنی سۆفیگەری و فیقهزانی دەدات و دەڵێت فیقهزانی پشت بە گێڕانەوەی (الروایە) دەبەستێت و سۆفیگەری پشت بە (تێگەیشتن) (الدرایە).

بەپشت بەستن بە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، لە قورئاندا هاتووە (وأسبغ علیکم نعمة ظاهرة وباطنة)، نیعمەتی دیارو بەرچاو پەرستنەکانن (الطاعات)، و بەخشی نادیار ئەوەیە کە رژاوەتەسەر دڵ لە حاڵ و پێگەکان (مقامات).

دیار و نادیار بەیەکەوە پەیوەستن لە قورئاندا هاتووە:

((ولو ردوه الى الرسول والى أولى الامر منهم لعلمه الذين يستنبطون منهم)) زانستی هەڵێنجراو زانستی سۆفیگەرییە.

1- شەعرانی: ئەویش زانست و رێبازی سۆفیگەری گێڕاوە بۆ قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەر (د.خ)

الشهرانی: الطبقات الكبرى جـ 1 ص4

ئەوەتا عەبدولوەهابی شەعرانی دەڵێت:

"ان علم التصوف عبارة عن علم: انقدح في قلوب الاولياء حين استنارت بالعمل بالكتاب والسنة"

ئبن خەلدون:

ئبن خەلدون لە کتێبی (المقدمه-پێشەکی) بەشێکی تەرخان کردووە بەناوی (علم التصوف) سەبارەت بەسۆفیگەری و سەرهەڵدانی. ئەوەتا دەڵێت:

((هذا العلم من علوم الشريعة الحادثة في الملة وأصله ان طريقة هؤلاء القوم لم تزل عند سلف الامة وكبارها من الصحابة والتابعين ومن بعدهم طريقة الحق والهداية وأصلها العكوف عن العبادة والاستقطاع الى الله تعالى والاعراض عن زخرف الدنيا وزينتها، والزهد فيما يقبل عليه الجمهور من لذة ومال وجاه، والانفراد عن الخلوة للعبادة، وكان ذلك عاما في الصحابة والسلف. فلما فشا الاقبال على الدنيا في القرن الثاني وما بعده وجنح الناس الى مخالطة الدنيا، إختص المقلبون على العبادة باسم الصوفية والمتصوفة. فلما اختص هؤلاء بمذهب الزهد والانفراد عن الخلق والاقبال على العبادة اختصوا بمواجد مدركة لهم)) ([82])

لە پەیوەست بوونی سۆفیگەری بە ئاینەوە سەراجی دەڵێت :بنجی ئەو بیرو بۆچوونانەی سۆفیگەری ئیسلامی ئەم سێ فەرموودەی پێغەمبەرن (د.خ):

[82] ابن خلدون: المقدمه ج3 ص1063

1- فەرموودەی تیایدا جبریل لە پێغەمبەر (د.خ) دەپرسێت سەبارەت بە ئیمان و ئیحسان، تیایدا وتی:"الاحسان أن تعبد الله كأنك تراه..."

چاكە خوازی لەوەدایە خودا وابپەرستی وەك ئەوەی ئەودە بینی.

2- فەرموودەی عەبدوڵلاّ كوڕی عەباس گێڕاویەتییەوە كە پێغەمبەر (د.خ) وتویەتی:

"أخذ الرسول بيدى، وقال لي ((ياغلام،إحفظ الله يحفظك))

واتە: كوڕیژگە، (مافەكانی) خوداوەند بپارێزە، دەتپارێزێ.

3- فەرموودەی نوعمان بن بەشیر لە پێغەمبەر (د.خ) دەگێڕێتەوە: ((الاثم ماحاك في صدرك، البرمااطمأن اليه نفسك)).( )

هەڵوێستی مەعروفی كەرخیی لە سۆفیگەری :

كۆنترین پێناسەی سۆفیگەری ، پێناسەی مەعروفی كەرخییە( لەساڵی 200 كۆچی مرد)، پێش كۆتایی سەدەی دووەمی كۆچی- كەرخی گوتوویەتی: سۆفیگەری دەستگرتنە بە راستییە كان وبێئومێدبوونە لە وەی لەدەست خەڵكدایە .

((التصوف الا خذ بالحقائق والياس مما في أيدي الخلائق))(2)القشيرى: الرساله ص127)

---

[83] ابن الجوزى: صفه الصفوه ج1 ص27، گ الهند 1355 كۆچی.

شایانی ئاماژە پێکردنە رۆژهەڵاتناس (نیکلسون) سەبارەت سۆفیگەری باس لە ریچکەی نوێ لە سۆفیگەری دوای (سۆفیگەری زاهیدانە) دەکات.

دەتوانین ناوی بنێین (سۆفیگەری فەلسەفیانە) لەمبارەیەوە دەڵیت: (سۆفیگەری لای کەرخی ئەورازێکە (وسیلە) بۆ زانین. ئەو رەگەزە (سیوسوفی)ییە (پەیوەست بە زانین) لە سۆفیگەری ئیسلامی بە (رەگەزو توخمێکی یۆنانی)) دەژمێردرێت ([84])

واتە پێلێکی هزری نوێ هەبوو کاریگەربوو لە هزری سۆفیگەری ئیسلامیدا[85] کە فەلسەفەی یۆنانی بووە.

نیکلسون دەڵێت: خاوەنی (تذکرە الاولیاء) وا وەسفی کەرخی دەکات کەوا پیاوێکە

(( تاسەی بۆ خودا بەسەریدا زاڵ بوو)) تا دەڵێت: (( لە ئاخاوتنەکانی مەعروفی کەرخی شوێنەواری هزرێکی نوێ دەبینین کە تا ئەمڕۆش توخمی بنەڕەتییە لە سۆفیگەری ئیسلامیدا. ئەم سەرچاوە نوێیەی کە تایبەتە بە پەیوەستی زانین بە خۆشەویستی ، لای هلینییەکاندا هەبوو کە بە ((گنۆسی)) بەناوبانگەکە جۆرە چێژێکە هۆشی تیایدا

[84] نیکلسۆن: فی التصوف الاسلامی ص4-27)

[85] عبدالباقی سرور: من اعلام ص96

کاریگەر نییە، هاوکات بینینی (حق) لە دڵدا بەرووناکی (نور)ی خوداوەند رووناك بۆتەوە))( [86] )

شایانی باسە (ابن الندیم) دەڵێت: جەعفەری خلدی رێبازی لە جونەیدی وەرگرتووە، ئەویش لە (السري السقطی)، ئەویش لە مەعروفی کەرخی، ئەویش لە فەرقە (السنجی) ئەویش لە (حەسەنی بەسرِی) و ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالك.... واتە رەگ و ریشەی سۆفیگەری دەگەڕێتەوە سەر چاخی بەرایی ئیسلام. مەعروفی کەرخی لە 200ك لە بەغداد دا مرد.

**خۆنەویستی (زوهد):**

-زوهد هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە(د.خ) هەبووە، ئەم رەوتە بەردەوام بوو لەکەسانێکی وەك عەماری کوڕی یاسرو عەبدوڵلای کوڕی مەسعود و عەلی کوڕی ئەبی تالب(ر.خ).

بەسرە پایتەختی حکومەتی خوراسان بوو، فارسەکان هاتووچۆیان هەبوو. دی بور دەڵێت : ((کاریگەری مەزهەبە فەلسەفییەکان لەبەسرە دەرکەوت پێش دەرکەوتنی لەشوێنی دیکە))[87]

دەڵێت :عامر کوڕی عەبدوڵلا وتویەتی: ((خودام واخۆشویست هەموو موسیبەتێکم لائاسانە، لەهەموو کێشەیەك رازی کردووم، لەگەڵ ئەم

---

[86] نیکلسون: فی التصوف ص4-5 بۆ ص115)

[87] -تاريخ الفلسفة الاسلامية –ص39

خۆشەویستییەم  گوێ نادەم لەچیدام  بەیانی و ئێوارە)) حلیه الاولیاء-
.90-89/2

حەبیب کوڕی عیسی عەجمی بەناوبانگ بوو لەو ئیشق و خۆشەویستییەدا.

دواتر رابیعەی عەدەویە دێت –شەهیدی ئیشقی خودایی شیعرەکانی سەرتا شیعری خۆشەویستی ئیلاهین لەمێژووی سۆفیگەری ئیسلامیدا.

-فارسەکان ئایین و کتێب و فەلسەفەی خۆیان هەبوو، شارستانیەتی خۆیان هەبوو، رێچکەیەکی سۆفیگەری خۆیان هەبوو هەوڵی گونجاندنی فەلسەفەو ئایینی تێدابوو، گونجاندنی ئایینەکانی تێدابوو.بەتایبەتی خوراسان کەلەساڵی (30کۆچی) بەئاشتی داگیرکرا،پەناگەی نەتەوەخوازانی فارس بوو تائەوڕادەی ئیبن حەزم دەڵێت : ((شیعەگەری و سۆفیگەری لەو چەکانە بوو فورسی دژی عەرەب پێی دەجەنگین بۆ نەهێشتنیان)).[88]

-زمانی خۆشەویستی لای سۆفییێکی دیکەش هەبوو ئەبو سلێمان دارانی (215 کۆچی دوایی کرد)،خەڵکی (واسط) بوو چووە شام و لەدێی (داریا ) نیشتەجێ بوو، بوو بەگەورەی سۆفیانی شام.))[89]

---

[88] -الفصل في الملك والاهواء والنحل -115/2

[89] -الرسالة القشيرية،ص16-17

**شێوازو پلەو پایەی سۆفیگەری:**

1- پایەی تۆبە.
2- پایەی ترس.
3- پایەی تکا.
4- پایەی خەمباری.
5- پایەی قەناعەت-دڵنیایی.
6- زوهد (خۆنەویستی).
7- وەرەع=ترس.
8- تەوەکول=پشت بەستن.
9- سەبر=خۆراگری.
10- شوکر= سوپاسگوزاری.
11- جهاد النفس=کۆششی دەروونی.

12- رازی بوون بەقەزاو قەدەر.

13- واز لە بەندەکان (خەڵك) هێنان.

دەرووی سێیەم:

## ژياننامەی سێ چرای جيهانی سۆفیگەری

دەرووی سێیەم:

ژياننامەی سێ چرای جيهانی سۆفیگەری



ئیمامی غەزالی　　بن عەرەبی　　مەولانای رۆمی

## ئیمامی غەزالی و بن عەرەبی ومەولانای رۆمی

دەرووی سێیەم:

## باسی یەکەم

## یەکەم چرای جیهانی سۆفیگەری

## ئەبوحامید محەمەد کوڕی محەمەدی غەزالی

## ( 450ک 505 - ک1058 / ز1111 – ز)



## یەکەم  چرای جیهانی سۆفیگەری

## ئەبوحامید محەمەد کوڕی محەمەدی غەزالی

## ( 450ک 505 - ک1058 / ز1111 – ز)

**باسی یەکەم:**

**بەشی یەکەم:**

رەوشی زانستی و سیاسی سەردەمی غەزالی

**بێگومان پێکهاتنی کەسایەتی مرۆڤ کۆی کۆمەڵە هۆکارێکی ژینگەیی، ژیان و هزری، کۆمەڵایەتی، سیاسیی ئەو کات و شوێنەیە کە مرۆڤ تیایدا دەژییێت.**

**دیارە مرۆڤ کاریگەری کۆمەڵگەی لەسەرەو کار لە کۆمەڵگە دەکات و ئەو رۆژگارەی کە تیایدا دەژییێت، بەرهەمی هزری ، کۆ بەرهەمی هزریی ئەو کۆمەڵگەیە.**

**غەزالیش، وێنەی رۆژگارەکەی بوو، کاری تێداکرد کاریگەری لەسەر هەبوو.**

**غەزالی لە دایکبووی سەدەی پێنجەمی کۆچی بوو، کە باس لەو چاخە دەکەین هەندێ لایەنی ژیان و کەسایەتی ئەومان بۆ روونددەبێتەوە.**

**سەدەی پێنجەمی کۆچی لە ساڵی 1010 زایینی دەستپێدەکات تا ساڵی 1106 زایینی، لەم سەدەیەدا چەندان دەوڵەتی ئیسلامی سەریان هەڵداو چەندانی دیکە تێچوون.**

**دەوڵەتی سەلجووقی لە رۆژهەڵات لە 431 کۆچی- 1039 زایینی دروستبوو- تیایدا پادشایەتی تۆغرۆل بەگ و براکەی داود دوو کوڕی میکائیل کوڕی سەلجوق لە خوراسان جێگیربوو .**

**(مقدمە الوجیز ص5).**

دواتر پادشایەتیان (عێراق)یش گرتەوەو توغرول بەگ لە ساڵی 447ی کۆچی- 1055ی زایینی بەغدادی داگیرکرد لەسەردەمی خەلیفە (القائم)ی عەباسی دابوو، و دەوڵەتی (بەنی بوەیهی) لابرد.
ئەم دەوڵەتە لەسەردەمی مەلیك شاه كوڕی ئەلب ئەرسەلان، پەرەی سەند،لە سنووری چینەوە تا شام، لە دوورترین وڵاتی ئیسلامی لە باکوور تا یەمەن.
سەرانەی لە دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵاتی وەردەگرت، لە 485ی کۆچی - 1092 زایینی کۆچی دوایی کرد.
دواتر پارچە پارچە بوو تا خاچپارێزان توانیان وڵاتی شام لە دەست موسڵمانان دەربێنن. و ((بیت المقدس)) داگیر بکەن لە ساڵی 490ی کۆچی بەرانبەر 1096ی زایینی ئەم جەنگە دەستیپێکرد.
سەلجووقیەکان تورك بوون، لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوونئەت و جەماعەت بوون، سەر بە خەلیفایەتی بەنی عەباس بوون، لەم سەردەمەدا دەوڵەتی خەواریزمی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵات دروستبوو، کە دەوڵەتێکی تورکی ئیسلامی بوو لە 490ی کۆچی- 1096ز دروستبوو و خوراسان و ئەمدیو زێی (ماوراء النهر)ی گرتەوە.
لە ڕۆژئاوا دەوڵەتی بەنی ئومەیە لە ئەندەلوس کۆتایی هات (407ك- 1016ز) دەوڵەتی بچووکی دیکە دروستبوون (ملوك الطوائف)، دژی یەکتربوون و ناکۆك بوون لەگەڵ یەك .
لە ڕۆژئاوای دوور دەوڵەتی موڕابیتیەکان (دولة المرابطين) دروستبوو لە ساڵی (448ك- 1056)ز، بەناوبانگترین پادشایان (یوسوف کوڕی تاشفین)

**بوو له (462ك - 1019ز) بوو به پادشا، ئەو بوو شاری مەراكشی دروستكردو كردی به پايتەخت، له ساڵی (479ك - 1086ز)، ئەندەلوسينی رزگاركرد، سوونني بوو، سەر به خەليفەی عەباسی بوو، غەزالی هاوچاخی گەورەترين پادشايانی سەلجووقی بوو، له ئەلب ئەرسلان، تا جەلالەدين ئەبی فەتح مەليك شا، ناسرەدين مەحمود، بەركيارق، مەليك شاهی دووەم، محەمەدی كوڕی مەليك شا. لەسەردەمی ئەلب ئەرسەلان خوێندگەكانی نيزامی دروستكران.**

**غەزالی كتێبی (التبر المسبوك في نصيحة الملوك) بۆ محەمەد كوڕی مەليك شا، دانا.**

**هەر لەو چاخيدا خەڵك خەريكی ئاخاوتن بوون لەبارەی باتينييەكان و رۆڵی پڕ مەترسيان له رووداوەكانی ژيان،.**

**له زۆر ناوچه بەهۆی بارودۆخی سياسی بڵاوبۆوە، دواتر بوو به راڕەوێكی ئاييني، غەزالی كاری لەسەر ئەم تيمه كردو بەرپەرچی دانەوەو راڕەوەكەيانی رەتكردەوەو رەخنەی له راو باوەڕەكانيان گرت.**

**له هەمان سەردەم زۆر هێرشی توندی لەلايەن خاچپارێزان كرايه سەر، بەتايبەتی رۆژهەڵاتی وڵاتانی ئيسلامی و زۆر وڵاتيان گرت له ئاسيای بچووك و شام، تيايدا ميرنيشينان دروست كردن بەناوی ((ميرنشينيه لاتينييەكان)) بەهۆی رەگەزی هاوبەش له جەنگەكه.**

**تا ئەو رادەی بەيتی موقەدەسيان گرت و زۆر له وڵاتی شام، و هێرشيان دەكردە سەر ئەندەلوس له رۆژئاوا..**

زانایان لەو سەردەمیدا مکوڕبوون لەسەر زانین، بزووتنەوەیەکی زانستی بەردەوام هەبوو، بەڵام ئەوان زانستیان بۆ زانست دەخوێند، هەندێ لەو زانایانە ئامانجیان، ناو و خۆشگوزەرانی بوو. هەر لەبەر ئەم هۆیەش هەندێ لە زانایان لە دەرباری سەرۆکەکان نزیك دەبوونەوە، بەتایبەتی لە سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە.

لە هەمانکات سەرۆکەکان- فەرمانداران پێویستیان بە پشتگیری زانایان هەبوو، لەبەرئەوەی ئایین تاکە ئامرازبوو لەو کاتیدا بۆ پێکهێنانی پادشایەتی و لەناوبردنی یەکێکی دیکە. ئایین ئامرازێکی سیاسی بوو.

سەلجووقییەکان- فەرمانداارانی ئەوکاتی خوێندنگەیان لە بەغداو نەیشابوور، دروستدەکرد تیایدا بنەماکانی سوونەت و جەماعەتیان دەوتەوە- لەبەرئەوەی ئەوان سوونی مەزهەب بوون.

هەر لەم چاخەدا خوێندنگەی نیزامیە، بەناوی نیزام و لمولك دروست کران، کوانووی خوێندن و هزر بوو، دارایی بۆ دابینکردن، شوێنی حەوانەوەو نیشتەجێبوونی بۆ خوێندکاران ئامادەکرد ئەم خوێندنگەیانە غەزالیان پێگەیاند، لە خوێندنگەی نیشابوور خوێندی، لە بەغدا بووە وانەگۆ.

بەتایبەتی ((نیزامولمولك)) وەزیری ئال سەلجووق، خاوەنی ئەم خوێندنگەیانە کە بەخششی زۆری پێدەدان، تێچوویان ساڵانە دەگەیشتە 600,000 دیناری ئەو سەردەمی، غەزالی لە کتێبی ((فاتحة العلوم)) (ل 47) ئاماژەی بەم راستییە کردووە.

ئەم پارە زۆرە لە مامۆستاو خوێندکاران خەرج دەکرا، بەمجۆرە بازاڕی

زانست بە هەرمێن بوو، زانایان نیزامولمولکیان خۆشدەویست، لە کۆڕەکەی دادەنیشتن و ببووە مەکۆی زانایان.

لە نیزا مولمولك دەگێڕنەوە سۆفیگەرانی خۆشدەویست.

دەگێڕنەوە، پیرێکی هەژاری هەبوو، کە دەهاتە لای لەبەری هەڵدەستاو لە شوێنی خۆی دایدەنا، لەبەردەمی دادەنیشت، کە لەمبارەیەوە لێیان پرسی، گوتی: ((ئەم پیرە خەوشەکانی خۆم دێنێتەوە یاد))([90])

هەتا کە سکاڵای ئەوەیان بردە لای ((مەلیك شاه)) و پێیان وت ئەو پارەیەی نیزا مولمولك لە خوێندگەکانی خەرج دەکات سوپایەکی پێ پێکدێت، ئاڵای لەسەر دیوارەکانی (قوستەنتینیە))دا هەڵدەکات، نیزا مولمولك بە مەلیك شاهی وت: من سوپایەکم بۆ دروستکردی پێی دەڵێن سوپای شەو، گەر سوپاکانت بەشەو خەوتن ، سوپاکانی شەو لەسەر پا دەوستن ریز بە ریز لەبەردەم خودای مەزن دەوەستن، بە فرمێسك و زمان، دەست بەرزدەکەنەوەو نزا دەکەن بۆ تۆ و سوپاکەت، تۆو سوپاکەت لەبەر ئێشکگری ئەواندا دەژین، بە نزاکانیان دەخەون، بە پلەو پایەی ئەوان باران و بژێوتان بەسەردا دەبارێت)) ([91])

ئەم پەیوەندییەی نێوان دەسەڵاتداران و زانایان لەو هەڕەشە هاوبەشەوە هات کە لەلایەن فەیلەسووفان و موعتەزیلەییەکانەوە سەری هەڵدابوو،

---

[90] الاخلاق، للدكتور زكى مبارك، ل19

[91] (الاخلاق، ل 16).

لەم سەردەمەدا سەلجووقییەکان خوێندگەی ئیسلامییان دادەمەزراندو تۆڕی گفتوگۆیان گەرم دەکەرد لە رۆژهەلاّت و فاتیمییەکان- لە رۆژئاوا وایان دەکرد، ئەمانە هەوڵی سەلماندنی رێنوێنییە شیعیەکانیان دەدا و ئەوانیش پشتگیری راڕەو ی سوونننییەکان هەردووکیان ترسیان لە فەیلەسووفان و بێ دینەکان بوو (هیچ زانایەکی موسڵمان بایەخیان نەدا بە چەکی بیری ئازادو رەخنەی بوێر دژی ئەوان ([92])). لەم سەرو بەندەدا کفراندن و بێدینداناں بوو بە چەکی دژی زاناو توێژەرەکان، بازاڕی گێژاوە بە هەرمێن بوو، زانایان لە خۆیان دەترسان، بیروڕاکانیان بە شاراوەیی دەهێشتەوە، یا بە دزی بە شاگردە هەرە نزیکەکانیان دەوت یا دەیانخستە نێو دوو توێی بەرگی کتێبەکانیانەوە.

بنواڕە ژیاننامەی ئەبی موزەفەری ئەبیوەری ( لە (507)ی کۆچی مردووە، لەلای ئیمامی حەرەمەین خوێندوویەتی، دەبینی نووسراوە: (هاوسەردەمەکەی گەواهی باش و دروستی باوەڕەکەیان بۆ داوە))([93])
واتە باوەڕداریی زانایان ببووە جێی مشتومڕوگومان.
بەمجۆرە زانایان بیرو بۆچوون و راکانیان دەشاردەوە، بەتایبەتی لە بواری فەلسەفەو عیلمی کەلام.
سیاسەت لای غەزالی

---

[92] الغزالي ، المنقذ، ص82 ، طع2- دمشق.
[93] الاخلاق- د. زکی مبارك، ص44).

سەدەی پێنجەمی کۆچی- سەردەمی غەزالی- سەرەتای داهێزانی دەوڵەتی عەباسی بوو کە ئیمپراتۆریەتی عەباسی روو لە پارچە پارچە بوون بوو. (بەڵکو، سەرکردەیەکی فاتیمی هەوڵیدا خەلیفە (القائم بالله) لەسەر تەخت لاببات، ئەویش پەنای بردە بەر سەرۆکی سەلجووقییەکان کە گێڕایەوە سەر تەخت، خەلیفەش نازناوی سوڵتانی پێبەخش) ( [94] )

خەلافەتی عەباسی لە رۆژهەلاّت فارسەکان و لە رۆژئاوا فاتیمیەکان و خاجپارێزەکان هەڵمەتیان بەردەوام بوو بۆ سەرو ولاّتانی ئیسلامی.

ئیبن خەلدوون لەمبارەوە دەڵێت: ((مضطربة بالفتن، كثر فيها المفسدون والدعارو العيارون-.. وربما دثت الفتن بين اهل المذاهب من اهل السنة والشيعة، من الخلافة في الامامة ومذاهبها، وبين الحنابلة والشافعية و غيرهم)) ( [95] )

— (العيارين) رێگرەکان: کۆمەڵەیەك بوون لە بەغدا دەرکەوتن، هەر لە سەدەی دووهەمی کۆچییەوە، کاری وێرانکاریان دەکرد.

واتە پڕ شەڕو ناشووبە خراپکارو رێگرو تالأنچی بلأون.. سووننەو شیعە دژی یەکن، لە شەڕو پێکدادان لەسەر خەلافەت، حەنبەلی و شافیعی نە یارو ناکۆکن..))

بەمشێوەیە غەزالی لەم سەردەمە دوو قۆناخی بینی:

---

[94] احمد الشر باصي: الغزالي، دار الهلال، بيروت، د. ت. ص11

[95] ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون. منشورات مؤسسة الاعلمى للمطبوعات، بيروت، 1988، ج3، ص477

یەکەم: تیایدا سەلجووقییەکانی حەنەفی یە تورکمانەکان، لە خوراسان بلاّوبۆوە بە پشتگیری وەزیرە گەورەکەیان (عمید الملك منصور ابن احمد الكندري) زێدەڕۆیی کرد لەو پشتگیریکردنە.

ماوەی دووەم: ماوەی هەڵگەڕانەوە بوو لە رارەوی حەنەفی و پشتگیری راڕەوی شافیعی بوو لەلایەن (نظام الملك).([96])

ململانێ لەسەر دەسەلاّت پێویستی بە چەکی ئایدیۆلۆژی هەبوو، لە دژی (المأمون) راڕەوی سونیانەی ئەشعەری بەکارهات، راڕەوی شافیعی دژی راڕەوی حەنەفی بەکارهات (هەر لەناو رووکاری سونیەکانەوە).

رووکاری شیعی- لە رێگەی فەرمانداریی فاتیمیان هەڕەشە بوو بۆ سەر خیلافەتی عەباسی- رووکاری سوونی- رووکاری شیعی چەکی کەلەپووری کۆنی و فەلسەفەی یۆنانی بەکاردێنا- کە لەو ماوەیەدا زۆر بە توندی بوونی هەبوو- نیزامولولك بەرنامەیەکی ئایدیۆلۆژی چڕوپڕی هەبوو بۆ ئەو مەبەستە:

خویندنگەی دانا لە فارسی و لە بەغدا، وەك دەزگای پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆژی بۆ دەوڵەتی سەلجووقی. و خەلەفەتی عەباسی بۆ شەریعەت دان بەم دەسەلاّتە بەناوی ئایین.

[96] نیزامولولك (نظام الملك): حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق کوڕی عەباسی تووس، لە ساڵی 408ك لە (نووقان)ی تووس لە دایکبووە، لەلای شێخ موەفەقی نەیشابووری خوێندوویەتی، زانست دۆست بوو، نزیك بوو لە یارانی سۆفیگەری. لەسەردەمی سوڵتان ئەلب ئەرسەلانی و کوڕەکەی مەلیکشا بوو وەزیر، بەناوبانگترین کارەکانی بنیاتنانی خوێندنگەی نیزامیەیە، بە رێکوپێکی ولاّتی بەڕێوەدەبرد. لەسەر دەستی لاوێکی ئیسماعیلی- باتینی- لە ساڵی 485 کوژرا.

**هەر لەم چوارچێوەیەدا نیزامولمولك غەزالی (هاوپۆلی خۆی) سەرنجی ڕاكێشا بۆ لە ئەستۆگرتنی ئەم ئەركە مەزنە.**

**ئەم ئەركەی (زانستی ئایینی = العلوم الدینی) دەیگێڕێت لە شەرعیەت دان بە دەسەلاتی سیاسی، ڕەهەندی مێژوویی هەیە، كە لەو ساتەوە دەستپێدەكات لە (نووسینەوەی زانستی ئایینی دەستیپێكرد) بەتایبەتی لەو تررووكەیەی دەستكرا بە نووسینەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (د.خ)، دوای ئەوەی لەسەردەمی خۆی ڕێینەدابوو بنووسرێتەوە تەنیا نووسینەوەی قورئانی پیرۆز ڕێی پێدرابوو كە دەسپێكی نووسینەوەی دەقی ئایینی یە لە ئیسلامدا. و خاڵ گواستنەوەی زانستی ئایینیە لە شێوازی زارەكی (شفویی) بۆ نووسراوە.**

**یەكەم كەسێك كە فەرموودەی نووسیەوە (محمد بن شهاب الزهري) (م 124 ك كە پەیوەندی پتەوی بە دوو خەلیفەی ئەمەوی هەبوو (عبدالملك وابنه هشام)( [97] )**

**لەبەرئەم هۆیە:**

**((زۆر سروشتی بوو میرە ئەمەوییەكان نووسینەوی ئەم فەرموودەو هەوالأنە هان بدەن كە زارەكی دەوترانەوە، كە لەبەرژەوەندی خۆیان**

---

[97] محمد ابت وعلی- الفلسفة السياسية عند ابی حامد الغزالي- ص23 -).

دابوو. ئاشکرایە گەڕان بەدوای فەرموودەو هەواڵی پەیوەست بە هۆکارێکی ململانێی سیاسی لەو رۆژگاریدا گرنگ بوو)) ([98])
ئەمەش بەڵگەی ئەو بۆچوونەیە کەوا ئەوانەی فەرموودەکانیان کۆکردۆتەوە یا باس و هەواڵەکانی پێغەمبەر (د.خ) و باسی شەڕ-غەزوەکانی ئەویان کردووە ، وەك (محمد بن اسحاق (م 150ك) ئەم کارەیان بە هاندەری سیاسی و فەرمانی دەسەڵات کردووە یا بۆ خۆنزیککردنەوە لە دەسەڵات کردووە.

دیارە لەم بارودۆخە دەستوەردان لە هەواڵەکان زۆر ئاسان بوو وەك: ئەو هەواڵانەی باس بە دەستوەردان و گۆڕینی (ابن اسحق) دەکات لە هەواڵەکانی باسیان دەکات ([99])

دەسەڵاتی ئەمەوی دەسپێشخەربوو لە نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د. خ) بۆ ئەوەی گەنگەشەی پێ بکات لە دژی شیعەکان، بەتایبەتی ئەو فەرموودانەی پەیوەستن بە یەکەم گیروگرفتی سیاسی پەیوەست بە مافداری ئیمامی عەلی لە بوونە خەلیفەو لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) هاتووە.
سیاسەتی ئیسلامی دەبێ بەپێی شەرع بێت، فیقهزان کە بەرگری دەسەڵات دەکردو وتاری سیاسی بەرهەم دێنا دەسەڵاتی زانستی بوو- زانستیی ئایینی.

---

[98] علي اومليك: الخطاب التاريخي، معهد الانماء العربي، بيروت، د. ت ص19
[99] ابن النديم: الفهرست، دار المعرفة، بيروت 1978، ص92

((پێغەمبەر (د.خ) تەنیا خاوەن دەسەڵاتی گیانی نەبوو، بەڵکو فەرمانڕەوا بوو (حاکم)، واتە هەردوو دەسەڵاتی بەدەست بوو دنیایی و گیانی، لەبەرئەمە شتێکی ئاساییە موسڵمان بپرسن ئایە سروشتی ئەم دەسەڵاتە چییە کە خەلیفەکەی پەیڕەوی دەکات))([100])

پرسیاری هەرە گرنگ ئەوەبوو تا چەند لەگەڵ شەرع دەگونجێت.

ئەم رەهەندانە بە درێژایی مێژووی سیاسی ئیسلامی بەردەوام بوو کاریگەربوو لە رووداوە سیاسییەکان، سەرباری ئەمەش کەلەپووری ئەو نەتەوانەی لە فتوحاتی ئیسلامی هاتنە نێو دەسەڵاتی ئیسلامی رۆڵی خۆیان بینی.

بەتایبەتی لەسەردەمی عەباسی، بەتایبەتی رووکاری شیعی کە سوودی لەم کەلەپوورە وەرگرت کە لە (سەردەمی هلینستی و فەلسەفەی دینی هرمسی) مابۆوە ([101])

لەبەر ئەم هۆیە دەوڵەتی عەباسی بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم لایەنە کە عیرفان و گنوس -ن (غنوس) و بە نهێنی پەرەی سەند بوو، پەنای بردە بەر فەلسەفەی یۆنانی- عەقلی یۆنانی- بۆ ئەم مەبەستە- بیت الحكمة-ی دامەزراند بۆ وەرگێڕانی زانستی بەراییەکان- یۆنانی- بەتایبەت. واتە ململانێی سیاسی هۆکاری دەرەکی کەوتە ناو جگە لە (قورئان و سوونەت- فەرمووده، فیقهزانی، راڤەو تەفسیر..). لەمبارەیەوە (ابن الندیم) باسێك دەگێڕێتەوە گوایە:

---

[100] یحی هویدي؛ دراسات فی علم الكلام و الفلسفة الاسلامیة، دار الثقافة، القاهرة، 1986، ص85

[101] - محمد أیت- ص30

((مەئموون لە خەوندا پیاوێکی سپی ڕەنگی سوورکەڵەی نێوچەوان پانی بینیوە. برۆ ئەستوور، سەرلووس، چاوگەورە، ڕێکوپێك لەسەر تەخت دانیشتبوو.

مەئموون دەڵێ: منیش وەك شاگرد لەبەردەمی بەسامەوە تەماشام دەکرد، وتم تۆ کێی؟ وتی: من، ئەرستۆتاڵیسی-م زۆر پێی شادبووم.. ئەم خەونە سەرەتای دەستکردن بوو بە (وەرگێڕان) و بەرهەمهێنان کتێبان)) ([102])

هەر لە رۆژانی یەکەم خەلیفە عەباسی (ابي العباس السفاح (132- 136) و مەنسور (المنصور) (136-158) موعتەزیلەکان پلەو پایەی بڵندیان هەبوو، بەڵگە هەیە لەسەردەمی خەلیفە مەهدی (158-169) دژی زەندیقەکان لەشەڕدابوون و لەکارگێڕیدا بالأدەست بوون لەسەردەمی خەلیفە مەئمون (198- 128) ویستیان یەك ئاڕاستەی هزری بەسەر دەوڵەت بسەپێنن هەمووی دژی رووکاری شیعەو (زانستی ئاییني) کە شیعە پشتی پێ دەبەست.

کەواتە بایەخدان بە فەلسەفە بایەخدانە بە لایەنی هۆش پەسندی هەمان کولتوور دژی وتاری ئاییني شیعە بوو بەتایبەتی ئەرستۆ.

بەلأم ئەم لووزەوە هۆشپەسندییە بەهۆی ئەوەی پەیوەست بوو- خۆی پەیوەست کرد- بە دەسەلأتی سیاسی- چارەنووسی خۆی بەدەسەلأتی سیاسی بەستەوەو بوو بە تەوەرێکی ئایدیۆلۆژی دەسەلأتی عەباسی، کەشوهەوای خۆش کرد بۆ (هەڵگەڕانەوەی سونیانە)، کەواتە یەکەم

---

[102] - ابن النديم، الفهرست. دار المعرفة، بيروت، 1988، ص339

ئاوڕدانەوە لە کلتووری کۆن روو لەلایەنی عیرفانی کرد ((ژیاندنەوەی کولتوری فارس و چەمکەکانی، کە لە ئایینی مەجوسی مانی و مەزدەکی و زرادەشتی وەرگیرابوون..)) ([103])

لە سێبەر دەسەڵاتی عەباسی ئەم بوارە رەخسا دوای ئەوەی دەسەڵاتی ئەمەوی سەرکوتی کردبوون.

دووهەم ئاوڕدانەوە لە کولتوور، ئاڕاستەی فەلسەفەی یۆنانی کرا واتە رووکارو ئاڕاستەی هۆشپەسندانەو بەفەرمی- بیت الحکمە-ی بۆ دانـدراو، وەرگێڕانی لە راوشگرت و بەدەست کراوەیی پارەی بۆ خەرجکرا.

سەلجووقییەکان هەستیان بەوەکرد کەوا ئامانجەکە سیاسییە، زوو لەگەڵ فیقهزانا پەیمانیان بەست سەرەتا لەگەڵ فیقهزانە حەنەفییەکان بۆ ئەوەی بەئاسانی بگەن بە بەغداو دەسەڵات لە بەغدا- کە تیایدا حەنبەلیەکان دژی ئەشعەرییەکان دەجەنگان. ([104])

دواتر خەلیفەو سوڵتانی سەلجووقی لەگەڵ زانا شافیعییەکان پەیمانیان بدات، ئەوەیش بۆ دابینکردنی شەرعیەت بۆ دەسەڵات، کەواتە (زانستی ئاینی- العلوم الدین) هەمان رۆڵی دەگێڕا کە ئەمڕۆ ئایدیۆلۆژیا لە هزری سیاسی هاوچاخ دەیگێڕێت ([105])

دەسەڵاتی هەر دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) بوو بە دەسەڵاتی گیانی (ئایینی) و دەسەڵاتی دنیایی (سیاسی)، لەسەردەمی خەلیفە

---

[103] عبدالعزیز الدوری: التکوین التأریخي للامة العربیة، دار المستقبل العربي، القاهرة، 1985، ص9

[104] رضوان السید: الامة والجماعة والسلطة، ص273) (ص33، محمد ابن وعلى

[105] محمد فرید حجاب: الفلسفة السیاسیة عند اخوان الصفا، الهیئة المصریة العامة للکتاب، ص13

**راشدیەکان ئەوەندە بەرچاو نەبوو وەك سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکان، غەزالی لەمبارەیەوە دەڵێت: خەلیفە راشدییەکان خۆیان میرو زانابوون فیقهزان بوون کەم پەنایان بۆ فیقهزانان دەبرد، ((کانوا أئمة علماء بالله، فقهاء في احکامه... لایستعینون بالفقهاء الا نادراً))** ([106])

**دواتر کە ململانێی سیاسی توندبوو لەبارەی بوونە خەلیفە دەسەڵاتی سیاسی پێویستی بە فیقهزانان بوو، غەزالی لەمبارەیەوە دەڵێت:**

**((فالفقیه هو العالم بقانون السیاسة، وطریق التوسط بین الخلق اذا تنازعوا بحکم الشهوات، فکان الفقیه معلم السلطان و مرشده الی طریق سیاسة الخلق.. ولایتم الدین الا بالدنیا، والملك والدین توامان، فالدین اصل والسلطان حارس، ومالا اصل له فمهدوم وما لاحارس له فضائع))** ([107])

**خەلافەتی عەباسی بەو هاوپەیمانییە لەگەڵ فیقهزانان دەسەڵاتی پتەوبوو، لە هەمانکات چالاکی شیعەکان زیادی کردو باتینییەکان دوای گەڕانەوەی (حسن الصباح) لە میسر لە (480ك/ 1087ز) وەك بانگدێرێکی فاتیمی دەسەڵاتی پەیداکرد.**

**لەم کەشوهەوایەدا (نظام الملك) هەستی کرد تەنیا چەك بەس نییە بۆ دژایەتیکردنی شیعە، بۆیە فێرگەکانی نیزامیەی دروستکرد، وەك چۆن**

---

[106] ابو حامد الغزالي: احیاء علوم الدین، مکتبة زهران، القاهرة، د. ت. ج1، ص67

[107] ابو حامد الغزالي: إحیاء علوم الدین، ج1، ص67

**فاتیمییه شیعەکان مزگەوتی ئەزهەریان له ناوەندەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی بۆ پشتگیری راڕەوی شیعی دروست کرد،**
**(نیزامولمولك) فێرگە نیزامییەکانی دامەزراند بۆ پشتگیری راڕەوی سوونی.**

**((زانست، بەهێزترین چەکە بۆ پاککردنەوەی قرپێژی سینە، سیاسەتیش فێڵدار گزیدارترین بوارە ئەم دەرفەتە بقۆزنەوەو ئەم چەکە چالاك بکات)) ([108])**

**غەزالی له هەمان ئەم خوێندگەیانەی خوێندووە هەر دوای مردنی (جويني)- چووە خزمەتی (نظام الملك) له ساڵی (478ك/ 1085ز) لەو سەردەمەدا نیزامولمولك وەزیری سوڵتانی سەلجووقی مەلیکشا بوو، زۆر دژایەتی بزووتنەوەی شیعەکان (ئیسماعیلییە)کانی دەکرد که خەلافەتی فاتیمی له قاهیرەی- میسر لەسەری دەڕۆیشتن.**

**نیزامولمولك بۆ سوود وەرگرتن لەم دەرفەتە پێشوازی لێکردو رایسپارد بەوانەوتنەوە له نیزامیەی بەغدا. ئیبن خەلەکان دەڵێت: ((له نەیشابوور دەرکەوت چوو بۆ ئۆردوو و (العسكر)، وەزیر نیزامولمولك پێشوازی لێکردو رێزی گرت.. رایسپارد له خوێندنگەی نیزامییە وانە بڵێتەوە، گەیشتە بەغداو دەستی بە وانەوتنەوە کرد له جەمادی یەکەمی ساڵی 484ك.خەڵکی عێراق زۆر پەسندیان کرد))([109])**

---

[108] زكي مبارك: الاخلاق عند الغزالي، دار الشعب، القاهرة، د.ت، ص28

[109] ابن خلكان: وفيات الاعيان، تحقيق احسان عباس، دار الثقافة، بيروت، ج3، ص217

**ئاماژە بەوە دەدات کەوا فەلسەفە مەبەستی ئەو ناپێکێت و هۆش بە هەموو وەڵامەکان راناگات، و دەرخوونەی هەموو کێشەکان ناکاتەوە.**

**غەزالی رووی کردە راڕەو ی فێرخوازی (التعليميه)، ئەم راڕەو ە چی دەڵێن؟**

**دەڵێن هۆش دەشێ هەڵە بکات، لەبەرئەمە نابێت راستییەکانی ئایین لەوەوە وەربگیرێت، غەزالیش وا دەڵێت تا ئێرە، رێکە لەگەڵیان، بەڵام ئایا راستییەکانی ئایین بەدڵنیایی لەکێ وەربگرن؟**

**ئەوان لەو باوەڕەدان دەبێت لە پێشەوای لە هەڵە پارێزراو (الامام المعصوم)ی وەربگرن، کە راستەوخۆ لە خوداوەند وە ئەم بەخششەی پێدراوە، غەزالی لە بۆچوون و راکانیانی کۆڵیەوە، نەگەیشتە ئەم ئیمامی مەعسومە، ناچار دووبارە دەستی بە گەڕان کردەوە، بەدوای راڕەو ێك زانستی بەقینی دڵنیاکەرەوەی پێبدات لەبارەی راستی (حەقیقەت).**

**ئێستا چوارەم گرووپ ماوە کە غەزالی لەلایاندا بەدوای راستیدا بگەڕێ: ئەوانیش سۆفیگەرانن، ئەوانەی باس لە رۆشنایی (كشف) و دۆزینەوەو، چاودان (المعاينه)، دەکەن بە باس لە پەیوەندیکردن بە گەردوون (مەلەکوت) دەکەن، دەڵێن راستەوخۆ لەوەوە وەردەگرین، پەیوەستین بەوەوە، ئاگاداری دەبێ پارێزراوبن (اللوح المحفوض) بە هەموو نهێنییەکانیەوە.**

**ئایا رێگەی دۆزینەوەو چاودان چییە؟! دەڵێن زانین و کارکردنە، ئەویش (غەزالی) دەڵێت: (المنقذ)- ل121).**

(ولما كان العلم أيسر على من العمل، ابتدات بتحصيل علومهم، من مطالعة كتبهم، مثل قوت القلوب لابي طالب ايمكي رحمة الله، وكتب الحارث المحاسبي، واعتفرقات الماثورة، عن الجنيد، واشبلي، وابي يزيد البسطامي، قدس الله ارواحهم- وغير ذلك من كلام مشايخهم، حتى اطلعت علي كنة مقاصدهم العلمية، وقد حصلت ما يمكن ان يحصل من طريقهيم، بالتعلم واسماع) (المنقذ- ص121)

غەزالی هەموو لەم زانیاریانەی خوێند، بەڵام کارپێکردن ماوە، لەوەدا لە (المنقذ) ل123)

دەڵێت: (فظهر لى أن اخصى خواصهم، مالا يمكن الوصول اليه بالتعلم، بل بالذوق والحال وتبدل الصفات، وكم من الفرق بين ان يعلم (الانسان) حد الصحة، وحد الشبع، واسبابهما وثروطهما، وبين ان يكون صحيحا وشبعان.. فكذلك فرق بين أن تعرف حقيقية الزهد، وثروطها، واسبابها، وبين أن يكون مالك الزهد، وعزوف النفس عن الدنيا.

وعلمت يقينا انهم ارباب احوالي، لا اصحاب اقوال، وان ما يمكن تحصيلة بطريق العلم فقد حصلتة، ولم يبق الاما لا سبيل الية، باسماع و التعلم، بل بالذوق واسلوك). (المنقذ- ص123)

واتە غەزالی دەڵێ: بینیم ئەوەی ئەوان دەڵێن بەفێربوون پێی ناگەین، بەڵکو بە چێژو رەوش و گۆڕینی ئاکار (صفات) ئینجا نموونەیەک دێنێتەوە: چەند جیاوازی هەیە لەنێوان کەسێک بزانێت مەرجی تەندروستی چییە، و مەرجی تێربوون چییە لەگەڵ کەسی تەندروست و

تێر. بەهەمانشێوە، جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی مەرجی خۆنەویستی (الزهد) بزانیت لەگەڵ ئەوەی خۆنەویست بیت.

بەدڵنیاییی زانیم، سۆفیگەران خاوەن رەوشن (حال) نەك گوتە (اقوال)، ئەوەی بکرێ لە رێگەی زانین پێی بگەم.

زانیومە ئەوەی نە بە گوێگرتن و فێربوون پێی دەگەیت ئەوەی ماوە ئەویش بەچێژو رەفتارو رەوشتە.

ئا لێرەدا با بزانین ئەو زانستەی غەزالی پێی گەیشتووە چییە؟ و ئەو زانستەی دەیەوێت لە رێگای رۆشنایی (کشف) پێی بگاتە چییە؟

یەکەم: زانستی کارەکییە کە زانینی چۆنەتی کارکردنە، پایەی لەکار کەمترە، لەبەرئەوەی ئامرازی گەیشتنە بەکار، ئامرازیش لە مەبەست بالاتر نییە(1)

غەزالی لە (میزان العمل) ص51:

دەڵێت: ((ومن العمل العلم العملي، اعنى ما يعرف به كيفيته، فإن العلم العملي ليس بأشرف من العمل، بل هودونه فهو مراد له)) واتە: زانینی کارەکی، واتە بەو زانینەی چۆنەتیەکەی دەزانیت، کە لە کارەکە بالاتر نییە.

دووەم: زانینی تیۆرییە، وەك زانینی رەوشەکانی دەروون لە گەڕانەوەی دوایی (المعاد الاخرويى) (قیامەت) وە ئەم جۆرە شتانە:

سۆفیگەران زانستەکان دەکەنە دوو بەش، زانستەکانی کاریاری (معامله) و زانستەکانی رۆشنبینی (مكاشفه)، ئامانجی زانستەکانی کاریاری کارپێکردنە، هەر لە کاریشی ناوەکەی وەرگیراوە.

کاریاری دابەش دەبێت بۆ زانستانی پەیوەست بە ئەندامە دیارەکان، وەك زانستی ئایینزایی (فقە)، کە بە زانستی رواڵەت ناسراوە، هەروەها بۆ زانستەکانی پەیوەست بە دڵ، بۆ نەهێشتنی ئاکار (سیفەت)ە، خراپەکانی و چاندن ئاکاری باش تیایدا، بەزانستی (باطن) ناوەوە (هندور) ناسراوە.
زانستی کاریاری بە هەردوو بەش ئامرازن بۆ یەك ئامانج کە کارە، لەو بالآترە، کاریش خۆی ئامرازە بۆ زانستەکانی رۆشنبینی (مکاشفە)، کە تیۆرییەکی پوختە، لەم رێیەشەوەیە گەیشتن بە ئەوپەڕی بەختەوەری، لەبەرئەوەی بەڵێن بە مرۆ دەدات لە خوداوەند ی مەزن نزیك بێتەوە، نزیکییەك بە واتاو شکۆ، نەك بە شوێن و مەودا.
زانستەکانی کاریاری دڵ ئامادە دەکا بۆ تێرژانی (افاضة) ئەم دەرکەوتانە (تجلیات)
واتە زانستەکانی رۆشنبینی (علوم المكاشفه)- لەلایەن بەخشندەی میهرەبان کە هەردەم دەرگای والآیە، رێگر هەبێت لەلایەنی وەرگرەوەیە، غەزالی لە (میزان العمل- ص18)دا دەڵێت: (واتفقوا- یعنی المنصوفة- علی ان العلم اشرف من العمل، كأن العمل متمع له، وسائق بالعلم الی أن یقع موقعة، ولأجله قال تعالی: (الیه یصعد الكلم الطیب، والعمل الصالح یرفعه)).
والكلم الطیب یرجع الی العلم عند البحث: فهو الذی یصعد ویقع الموقع: والعمل كانما دم له، یرفعه و یحمله، وهذا یدل علی علو رتبة العلم).
واتە سۆفیگەران لەسەر ئەو رایەن زانست لەکار بالآترە، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە دەڵێت: وشەی چاکە بۆ لای ئەو بەرەو بالا دەچێت و

کاری چاك بەرزی دەكاتەوە، وا لێكدەداتەوە كەوا، وشەی چاك زانستە، ئەوە بۆ لای خوداوەند بەرزدەبێتەوەو كاری چاك وەك خزمەتكارە، هەڵیدەگرێت.

كەواتە ئامرازی زانین لە دیدی سۆفیگەران لە دوو قۆناخ پێكدێت:

یەكەم قۆناخ: كاری كارەكی- كردەنی كە ئەویش زانینی چۆنیەتی كارە.

دووەم قۆناخ: كارەكە خۆی، چی ئەو كارە داماڵین بێت، وەك داماڵین لە ئاكاری خراپ، یا كاری رازاندنەوە بێت وەك بەكاری باش رازاندنەوە.

غەزالی تا ئەم قۆناخە زانستی كاریاری دەردەست كردبوو، وەك باسی كرد، قۆناخی دووەمی مابوو، ئەویش لادانی سیفەتە خراپەكانە لە دڵدا.

وەك: بەخۆنازین و خۆدەرخستن و دوو رووی و خۆنواندن و چكۆس و دنیاخوازی و ماڵ خوازی و شانازی بە بنەماڵەو مندال كردن، پڕكردنەویە دڵ بە ئاكاری باش، رەوشتی بەرز، لە شوێنیاندا وەك: خۆڕاگری دڵنیایی، رازی وبون پشت بە خوداوەند بەستن.

هەمووی لەم چەند دێرە دەربڕی (المنقذ- ص125)

(رأسی ذلك كله قطع علاقة القلب عن الدنیا، بالتجا في عن دار الغرور، والانابة الی دار الخلود، والاقبال بكنه الهمة علی الله تعالی، وذلك لایتع الا بالاء عراض عن الجاه، واعمال، والهرب من الشواغل و العلائق).

لة (الاحیاء)دا (جـ8 ص33- طبع لجنه نشراثقافه) دةلَیَت: ((بل یصیر قلبه الی حالة یستوی فیها وجود كل شئ وعدمه).

غەزالی دەڵێت: سەر هەموو ئەم ئاكارانەش، پەیوەستەگی دڵ بە جیهان ببڕیت، بە پشتكردنە ماڵی سەرەڕۆیی و فیز، گەڕانەوە بۆ ماڵی نەمری،

رووکردنە خوداوەند ی مەزن، ئەوەیش نایەتەدی مەگەر بە پشتکردنە شانازی بە پلەو پایە، بە دارایی و ماڵ، هەڵاتن لە مایەی خەریك بوون و پەیوەستەکان، بەڵکو دڵ بگاتە ئاستێك بوونی هەموو شتێك و نەبوونی لایەکسان بێت.

چۆن دڵی مرۆڤ بەم پایە دەگاتە هەموو شتێك لە دڵ داماڵێت؟!

هەتا غەزالیش تا ئەم قۆناخە، هەرچەندە پڕ زانستە، دوورە لە لاسایی کردنەوەو کەوتنە دوای خەڵك، لە کاروباری جیهانیدا مرۆڤێکی ئاساییە وەك هەر مرۆڤێکی دیکەی دەروونی لە رواڵەتەکانی بۆش نەبێت، هەست دەکات ناوبانگ خوازە، پایەخوازە، ماڵ بۆ خۆی رایدەکێشێت، سەرۆك بوون دڵکێشی دەکات، ئەوەتا دەڵێت:

(ثم لاحظت أحوالی، فإذا أنا منغمس في العلائق، وقد أحدقت بی من الجوانب، ولاحظت أعمالی- وأحسنها التدريس و التعليم، فإذا أنا مقبل على علوم غير مهمة، ولا نافعة في طريق الاخرة، ثم تفكرت في ينتي في التدريس.

فإذا هی غير خالصة لوجه الله تعالى، بل باعثها و محركها طلب الجاه وانتشار الصيت).

واتە لەخۆم روانی، بینیم کەوتوومەتە تۆڕی پەیوەستییەکان، لە هەموو لایەك دەوریان داوم، لە کارەکانم وردبوومەوە، کە فێرکاری باشترینیانە- بینیم رووم لە زانستی زۆر گرنگ نەکردووە، بێ سوودن بۆ رێی رۆژی پەسلانێ، لە نیازم وردبووەوە لەوانە وتنەوە، بینیم پوخت و پاك نییە

بۆ خوداوەند ی مەزن، بزوێنێ و هاندەری موڵك خوازی و ناوبانگ دەرکردنە.

ئایا غەزالی چۆن لەو پەیوەستییانە رزگاری بێت، چۆن پایەی لە وانە وتنەوە جێبێڵێت، پایەیەك لەو رۆژگاریدا هەمووان چاویان تێبڕییوو؟

چۆن ماڵ و سامان واز لێبێنێت کە تا رادەیەك هەیبوو خۆی ئاماژە بەوە دەکات کە ویستی لە بەغدا دەردەچێت، هەندێ لەم ماڵ و سامانەی بۆ خۆی و منداڵانی گلدایەوە، هەندێ مایەوە کردیە خێرو سەدەقە، نیشتمان و ماڵ و منداڵ چۆن جێ بێڵێت؟! چۆن بەغداو خۆشییەکانی جێبێڵێت، ئەوکاتی غەزالی لەسەر سفرەی نیزام و لمولك و دەوڵەمەندانی دیکە میوان بوو، برسیەتی لەنێو شوورەی بەغدادا نەبوو، چۆن فێرگەی نیزامیە واز لێبێنێت، خۆی گەورە مامۆستایانی بوو؟!

فێرگەی نیزامیە لەسەر کەناری زێی دیجلە، لەتەك بەندەرو بازاڕ دروستکرابوو.

کارێکە سەخت و دژوارە، ئەوەتا خۆی لەباری هەست و نەستی لەم تroوکانەدا دەڵێت: (المنقذ-ص126):

(فلم أزل أتفكر في الامر مدة، وأنا بعد على مقام الاختيار، أصمم العزم على الخروج من بغداد، و مغارقة تلك الاحوال، يوماً، وأحل العزم يوماً، وأخدم فيه رجلاً، و أؤخر فيه اخرى، لاتصدق لي رغبة في طلب الآخرة بكرة، الاو يحمل عليها جند الشهوة فيفترها عشية، فصارت شهوات الدنيا تجاذبني بسلاسلها الي المقاح، ومنادي الايمان ينادي الرحيل الرحيل! فلم يبق من

العمر الا قليل، وبين يديك السفر السطويل، جميع ما انت فيه من العلم والعمل رياء و تخبيل، فان لم تستعد الان للاخرة فمتي تستعد؟
وان لم تقطع الآن هذه العلائق فمتى تثطع؟ فعند ذلك تتبعت الداعية، وينجزم العزم على الهرب والفرار، ثم يعود الشيطان ويقول: هذه حال عارضة، إياك أن تطاو لها، فإنها سريعة الزوال، فإن أنت أذ عنت لها، وتركت هذا الجاه العريض، واشأن المنظوم الخالى عن التكدير والتنغيص، والامن و السلم الصافي عن منازعة الخصوم، ربما التفتت اليه نفسك ولا تتيسر لك المعاودة.
واتە: بەردەوام بیرم لەم حاڵەتە دەکردەوە، بڕیار دەدەم لە بەغدا دەربچم، لەم رەوشە رزگارم بێت، رۆژێك بڕیار دەدەم و رۆژی دواتر پەشیمان دەبمەوە، رۆژێك هەنگاوێك داوێم بۆ پێشەوە دواتر هەنگاوێك دەگەڕێمەوە، هەرچەند خوازیارم بۆ دوارۆژ کار بکەم، هەوەس بەسەر زاڵ دەبێت و پەشیمان دەبمەوە، خۆشییەکانی ژیان بە زنجیر بۆ خۆیم راکێشی دەکات.
هەندێجار بانگەوازی دەرچوون دەبیستم! تەمەت کەمی ماوە، گەر ئێستا بۆ رۆژی قیامەت خۆ ئامادە نەکەی کەی دەیکەی! بڕیار دەدەم، بەڵام شەیتان پێشم لێدەگرێت و دەڵێت: ئەم رەوشە کاتییە، بەگوێی مەکە، زوو نامێنێت، تۆ گەر ملکەچی بوو دواتر گەر خوازیاری گەڕانەوەبووی هەمووی لە دەست دەدەی.
(فلم أزل بين تجاذ ب شهوات الدنياو دواعي الاخرة، قريباً من ستة أشهر، اولها رجب سنة ثمان و ثمانين واربعمائة (1095م) ).

، وفي هذا الشهر جاوز الامر حد الاختيار الى الاضطرار، اذ اقفل الله اسانی، حتی اعتقل عن التدريس، فكنت احا هد نفسی أن أدرس يوماً واحداً، تطيباً لقلوب المختلفة إلي، فكان لا ينطق لساني بكلمة واحدة، ولا استطيها ألبتة.

حتي اورنت هذه العقدة في اللسان، حزناً في القلب، بطلت معة قوة الهصنم، ومراءة الطعام و الشراب، فكان لاينساغ لي ثريد، ولا تنهضم لي لقمة، وتعدي الى ضعف القوی، حتي قطع الاطباء طمعهم في العلاج، وقالوا: هذا أمر نزل بالقلب و منة سري الي المزاج، فلا سبيل الية بالعلاج..)

واته تا ماوەی شەش مانگ لە سەرەتای مانگی رەجەبی ساڵی (488 کۆچی) واتە (1095)ی زایینی لەم رەوشەدا بووم، دواتر لێی توند کردم زمانی گرتم، حەزم دەکرد وانە بڵێمەوە نەم دەتوانی ئەم بارە ناهەموارەی دڵ کاری کردە سەر گەدەم خواردن و خواردنەوەم نەما پزیشکان دەستەوەستان بوون لە چارەکردنم..

(ثم لما أحسست بعجزي، وسقط بالكلية اختياری، التجأت الي الله التجاء المضطر، الذي لا حيله له، فاجا بني الذي يجيب المضطر اذا دعاة، وسهل علي قلبی الاعراض عن الجاة، واعمال والاولاد، والاصحاب، واظهرت عزم الخروج الي مكة وانا ادير في نفسي سفر الشام حذار ان يطلع الخليفة وجملة الاصحاب على عزمي في المقام في بالشام.

غەزالی دەڵێ: لە دواكایە پەنام برد بۆ خوداوەند ی مەزن ، دڵی لەسەر ماڵ و سامان و منداڵ ئاسان کردم، بڕیاری دەرچوونم دا بۆ مەکە، لە

ناخەوە مەبەستم چوونە شام بوو، بەڵام نەوەك خەلیفە و كۆمەڵە بارێك بە بڕیارم بزانن سەبارەت مانەوەم لە شام.
(فتلطفت بلطائف الحيل في الخروج من بغداد على عزم ألا أعاودها أبداً، واستهدفت لأئمة اهل الطرق كافة، اذ لم يكن فيهم من يجوز ان يكون الاعراض كما كنت فيه سبباً دينياً، اذ ظنوا أن ذلك هو المنصب الا على في الدين، وكان ذلك مبلغهم من العلم، ثم ارتبك الناس في الاستنباطات، وظن من بعَد عن العراق، ان ذلك كان لاستشعار من جهة الولاة، واما من قرب من الولاة، وكان يشاهد الحاحهم في التعلق بي، والانكباب علي، واعراضي عنهم، وعن الا لتفات إلى قولهم، فيقولون هذا امر سماوي، وليس له الاعين اصابت الاسلام و زمرة العلم، ففارقت بغداد).
هەوڵی زۆرمدا بۆ دەرچوون و نیازم وابوو نەگەڕێمەوە، كەس لە زانایانی عێراق دەرچوونەكەمی بە هۆكاری ئایینی لێك نەدەدایەوە، وایان دەزانی بۆ پلەو پایەی هەرە بەرزی ئایینییە، خەڵك بەجۆرێكی دیكە لێكیان دەدایەوە، ئەوانەی لە عێراق دوورن وایان دەزانی هۆیەكەی والیە، ئەوەی نزیك بوو لەوان و دەیزان چۆن گوێ بە داخوازییەكانیان نادەم، دەیوت ئاسمانە، چاوێكی پیسەو جیهانی ئیسلام و زانایانی گرتۆتەوە، لە بەغدا دەرچووم.
بەمجۆرە غەزالی بەرگی خۆشكی دنیای داكەندو رێگەو رێبازو رووكەی سۆفیگەرانی هەڵبژارد، بەهیوای ئەوەی دڵنیایی و ئاسوودەیی زانینی بەدەستكەوێت.

غەزالی ئەوەش دەزانی کەوا ڕاڕەو ەکەیان پێویستی بە (أن تخلو بنفسك في زاويه، تقتصر من العباده على الفرائج والرواتب، تجلس فارغ القلب، مجموع الهم، مقبلاً بزكرك عل الله..) واتە دەبێت خۆت تەرخان کەیت و گۆشەگیری هەڵبژێریت و لە پەرستندا فەرزو ڕاستییەکان بکەیت و دانیشیت دڵ بە تاڵ، ئامادە، ڕوو لە یادی خوداوەند کردن..

(وذلك في اول الامر، بأن تواظب باللسان على ذكر الله تعالى، فلا تزالي تقول: ((الله، الله)) مع دضور القلب وإدراكة، الى ان تشتهي الى حالة: لو تركت تحريك اللسان، لرأيت كأن الكلمة جارية على لسانك! لكثرة اعتيادة، ثم تصير معراظباً عليه الى أن لا يبقي المعنى المجرد حاضراً في قلبك على اللزوم والدوام...)

ئینجا غەزالی دێتە سەر پراکتیککردنی ڕێبازێکی زیکری سۆفیگەری ئەویش وتنەوەی بێژەی (الله)یە بە زەیندان، تا ئەو رادەی گەر مانیش ڕاگریت دەبینیت دەڵێی وشەکان هەر دەوترێن بەهۆی زۆر دووبارەبوونەوە. تا ئەو رادە دووبارەی دەکەیتەوە کە تەنیا واتای وازەکە لە دڵتدا دەمێنێت..

(ولك اختيار الي هذا الحد فقط، ولا إختيار لك بعدة الا في الاستدامة لدفع الوساوس الصارفة، ثم ينقطع اختيارك فلا يبقي لك الا الانتظار لمايظهر من فتوح مثلة للاولياء، وهو بعض ما يظهر للانبياء. وقد يكون امراً كالبرق الخاطف، لا يثبت ثم يعود، وقديتأخر، فإن عاد فقد يثبت، وقد يكون مختطفاً. وان يثبت امتد ثباته..

**تا ئەم رادە دەتوانیت کاری لەسەر بکەیت، دەتوانیت بۆ وەلانانی ختووکە (وسوسە)ی دوورخەرەوە لە زێتر بەردەوام بیت، دواتر دەکەویتە چاوەڕوانی، ئەو کرانەوە (فتوح)ی ئەولیاکان دەیبینن، هەر ئەویشە بەشێکە لەوەی پێغەمبەران دەیبینن.**

**دەشێ شتێك بێت وەك برووسك ناکاو، جێگیرنابێت، دیسان دێتەوە، دەشێ دواکەوێت، دەشێ جێگیربێت، دەشێ ناکاو بێت.**

**(وقد يتظاهر أمثاله على التلاحق، وقد لا يقتصر على فن و احد. و منازل اولياء الله فيه لا تحصى، لتفاوت خلقهم و أخلاقهم.**

**فهذا منهج الصوفية، وقد رد الامر فيه الى تطهير محض من جانبك و تصفية وجلاء، ثم استعداد وانتظار فقط) (ميزان العمل ص44)**

**دەشێ لە دوایەکدا بێن، یەك هونەر نییە، یەك شێواز نییە، پێگەی ئەولیایان تیایدا بێ ژمارەیە، بەهۆی جیاوازی سروشت و رەوشت و ئاکاریان.**

**ئەمەیە راڕەو ی سۆفیگەران، سەرچاوەی کارەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پاك گری پوخت لەلای تۆوەو روونکردنەوەو تەنیا ناوەنیاکردن و ئامادەگی و چاوەڕێکردن.**

**ئەوەیە ئەم بەرنامەو رێڕەوەی غەزالی بەغدای بۆ بەجێهێشت، هەموو سامان و ماڵی و پلەو پایەی بۆ بەجێهێشت، بەهیوای ئەوەی بگاتە راستیی دڵنیاکەرەوە (الحقيقه اليقنيه) کە شەیدای بوو.**

لە شام و وڵاتانی حیجازدا

غەزالی بەغدای جێهێشت، ئایا منداڵەکانی لەگەڵ خۆی برد، محەمەد ڕەزا (محمد رضا) لەکتێبەکەی لە بارەی غەزالی ص13) دەڵێت:

(غەزالی بەغدا جێهێشت و سامان و ماڵ هەیبوو، ئەوەندەی بۆ خۆی و منداڵانی هێشتەوە کە پێویستە بۆ ژیان ئەوەی دیکەی بەخشی).

بە ڕواڵەت دەشێ بیربۆئەوە بچێ منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بردبێت، بەڵام ڕاستی وانییە ئەوەتە غەزالی دوای ئەوەی گەشتەکەی تەواو دەکات دەڵێت: (ثم جذبتني الهمم و دعوات الاطفال الي الوطن)

واتە: بەهۆی نزای منداڵانم ڕووم لە نیشتمان کردەوە.

سەرەڕای ئەوەی ڕاڕەو ی سۆفیگەری داوا دەکات لە پەیوەستەگی بەدنیا خۆی داماڵێن هاوکات لە خزم و منداڵ و نیشتمان.

دیارە غەزالیش لەم قۆناخەدا ئەم ڕاڕەو ەی پەیڕەو دەکات.

هەر چۆنێکی بێت غەزالی لە کۆتایی ساڵی 488ی کۆچی بەرانبەر 1095ی زایین لە بەغدا دەرچوو بەرەو شام، تا تەنها بێت و بتوانێت ڕاڕەو ی سۆفیگەری بەکردەوە پەیڕەو بکات، لە (المنقذ- ص129)دا دەڵێت:

(ثم دخلت الشام، وأقمت بها قريباً من سنتين، لاشغل لي الا العزلة والخلوة والرياضةو المجاهدة، اشتغالا بتزكية النفس، وتهذيب الا خلاق، وتصفية القلب لذكر الله تعالي، كما كنت حصلتة من علم الصوفية. فكنت اعتكف مدة في مسجد دمشق، اصعد منارة المسجد طول النهار، واغلق با بها على نفسي).

دەڵێت چووم بۆ شام نزیکەی دوو ساڵ تیایدا مامەوە هەر خەریکی گۆشەگیری و تەنیاگەری (الخلوە) و راهاتن و کۆششی بووم، بۆ دەروون پاککردنەوەو ئاکارپاکی، دڵپاککردنەوە بۆ زیکری خوداوەند ، یادی خوداوەند کردن.

وەك چۆن لە زانستی سۆفیگەری خوێندبووم. ماوەیەك لە مزگەوتی دیمەشق پەنام دەگرت (الاعتکاف)، بەسەر منارەکەی دەکەوتم بەدرێژایی رۆژ، دەرگام لەسەر خۆم دادەخست.

شایانی باسە ئەم پەناگیری و گۆشەگیرییەی غەزالی گشت کات و ساتەکانی نەگرتبۆوە، لە مزگەوتی دیمەش وانەی دەگوتەوە (دواتر لە (بیت المقدس) و (ئەسکەندەریە) ش دیارە ئەمەش دەرچوونە لەسەر رارەو ی سۆفیگەری و پەناگیری، یان کە ویستی بچێتە ئەندەلوس و سەردانی سوڵتانی رۆژئاوا، ئەویش دەرچوونێك بوو لەم پەناگیرییە.

خاوەنی کتێبی (عقودا الجوهر) لەبارەی جل و بەرگی غەزالی دەڵێت: (عەلا ئەدینی سەیرەفی (الصیرفی) لە کتێبەکەی (زاد السالکین) دەڵێت: قازی ئەبابەکری کوڕی عەرەبی (ابابکر بن العربی) گوتوویەتی: پێشەوا غەزالیم لە چۆلەوانی بینیوە، پەشمینەیەکی پینەکراوی لەبەر بوو، دۆلکەیەکی بەشانەوە بوو، کەچی لە بەغدادا بینیبووم، چوار سەد عەمامە بەسەر لە وانەیدا ئامادە دەبوون، لە گەورە کەسایەتی و باشەکانیان، زانستی لێ فێردەبوون، گوتی: لێی نزیك بوومەوە، سڵاوم لێکرد، گوتم: ئەی پێشەوا ئایا وانە وتنەوە لە بەغدا لەوە باشتر نەبوو بۆ تۆ لەمە؟ گوتی: بە تووڕەیی لێی روانیم و گوتی:

لما طلع بدرالسعادة، في فلك الارادة، وجنحت شمس الوصال، في مغار ب الوصول:

تركت هوي ليل وسعدي بمعزل

وعدت الى مصحوب اول منزل

ونادت بي الاشواق مهلا فهذه

منازل من تهوى رويدك فانزل

غزلت لهم غزلا رقيقاً فلم أجد

لغزلى نساجاً فكسرت مغزلي

مەبەست ئەوەیە، من کەوتوومەتە دوای خۆشەویستەکەم کە هیواو ئاواتمە، کە گەیشتنە راستیی یەقینییە گلەیی ئەوەش دەکات کەوا کەسی نەدیوە بتوانێت لە تیۆرییەکانی بگات، تەونەکەی شکاندووە. غەزالی لە (المنقذ ص129) دەڵێت:

(ثم رحلت منها الى بيت المقدس، أدخل كل يوم الصخرة، واقفل با بها علي نفسى. ثم تحركت في داعية فريضة الحج، والاتمداد من برطات مكة والمدينة وزيارة رسول الله صلى الله عليه وسلم) بعد الفراغ من زيارة الخليل صلوات الله علية فسرت الي الحجاز..)

دوای شام چووم بۆ قودس هەموو رۆژێك دەچوومە گومبەتی بەردەکە (الصخرە)، دەرگام لەسەر خۆ دادەخست، دواتر سەردانی مەکە لە دڵم رووا و سەردانی پێغەمبەر (د.خ) دوای سەردانی ئیبراهیم خەلیل (د.خ) بەرەو حیجاز بەڕێ کەوتم.

(ثم جذبتني الهمم و دعوات الاطفال الى الوطن، فعاودتة بعد ان كنت ابعد الخلق عن الجوع الية، فاثرت العزلة بة ايضاً، حرصاً على الخلوة وتصفية القلب للذكر، وكانت حوادث الزمان ومهمات العيال و ضرورات المعاش تغير في وجة المراد، وتشوش صفوة الخلوة، وكان لا يصفر لي الحال الافي اوكان متفرقة، لكنني مع ذلك لا أقطع طمعي منها، فتدفعني عنها العوائق وأعود اليها ودمت علي ذلك مقدار عشر سنين).

غەزالی باسی مانەوەی لە ئاوارەیی تا ئەوکاتەی لەسەر داوای لایەنگرانی و مندڵەکانی رووی کردەوە وڵات، کەچی بەهیچ شێوەیەك لەو باوەڕەدا نەبووم بگەڕێمەوە، بەڵام رووداوی رۆژگارو ئەرکی منداڵان و پێداویستی گوزەران، ئاڕاستەی خواستەکانم دەگۆڕن، ئاسوودەیی تەنیا ببم لێ تێکدەدەن، کەم جار وادەبێت ئاسوودەبم بە تەنیایی، بەڵام هەر خوازیاری ئەم ترووکە ئاسوودەییانەم و دە ساڵان بەمشێوەیەم بەسەر برد.

غەزالی باس لەوە دەکات دوو ساڵ لە شام ماوەتەوە، باسی ئەوەی نەکردووە چەند لە قودس ماوەتەوە، یان ئایا چووە بۆ میسر- قاهیرە یان نەچووە، گەر چووبێت ئەوا بەهۆی ئەوەی ئەو رۆژگاری راڕەو ی فاتیمی-شیعی باڵا دەست بوو لەژێر سێبەری دەوڵەتی فاتیمی- کەواتە هەتا لە ئەزهەریش وەك پێویست پێشوازی لێنەکراوە یان چەند حیجاز بووە، یا چەند لە تووی ماوەتەوە دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە تووی، بە دە ساڵ دەیخەملێنێت و لە شوێنێکی دیکە بە (11) ساڵ (ص53، المنقذ).

لەم ماوەیەدا کە غەزالی لە تەنیاگەری و گۆشەگیریدا بوو ئەم راستییەی بۆ دەرکەوت کە بەدوایدا شەیدا بوو. دەروونی هێمن بووەوە، نا ئارامی

ئەما، زانستی ڕاڕەو  و ڕێگای سۆفیگەری ڕێی ڕاستییە، بەمجۆرە لەسەرگەردانی ڕزگاری بوو.

ئەوەی خوازیاری بوو دەستی کەوت، ئیدی بەدوای بەرنامەی دڵنیایی و یەقین ناگەڕێت سۆفیگەری دۆزییەوە، لە (ص131 لە (المنقذ) دا دەڵێت:

(أنهم هم السالكون لطريق الله تعالى خاصة، وأن سيرتهم أحسن اليسر، وطريقهم اصوب الطرق، واخلاقهم ازكى الاخلاق، بل لو جمع عقل العقلاء، و حكمة الحكماء، وعلم الواقفين على أسرار الشرع من العلماء ليغيروا شيئاً من سيرهم وأخلاقهم، ويبدلوه بما هو خير منه، لم يجدوا اليه سبيلاً، فإن جميع حركاتهم وسكناتهم في ظاهر هم و باطنهم مقتبسة من نور مشكاة النبوة، وليس وراء نور النبوة على و جه الارض نور يستضاء به).

لەم دەقەی سەرەوەدا غەزالی ئەوەندە ڕەفتارو ئاكارو ڕەویەی سۆفیگەران پەسند دەكات لە دواكایە دەڵێت: هەموو جووڵەو سرەوتیان لە ڕواڵەت و شاراوەیان لە ڕووناكی (نور)ی پێغەمبەرایەتی وەرگیراوە، لەسەر ڕووی دنیادا شتێك نییە لەودیو ڕووناكی پێغەمبەرایەتی  ڕووناك كەرەوە بێت.

بەمجۆرە غەزالی لە دواكایە ڕۆی گەشتێكی نائارام ئەوەی بەدڵ بوو سۆفیگەریی بوو. غەزالی بە لۆجیكی هۆشپەسندانە و پێویستی هۆشەكی ڕێگای سۆفیگەری هەڵبژارد، بەڵێ: ئەوەتا مرۆڤ لە خەودا كە هەستەكانی (لەكار دەكەون). دەروونی تەنیا دەبێت لەگەڵ خۆی، ئاگاداری هەندێ شت و كاروبار دەبێت لە پاشەڕۆژ ڕوودەدەن، وەك چۆن لە خەونەكەیدا بینیویە.

گەر دەروون بتوانێت ئاگادارو دۆزەرەوەی جیهانی گەردوون (مەلەکوت= الملکوت) بێت لەگەڵ بێئاگایی هەستەکان، ئەوا مرۆڤ گەلێك هەن هەستەکانیان فەرامۆش دەکەن بە تەواوی لەباری ئاگاییدا، کەواتە هیچ رێگرێك نییە لەو رەوشەدا دەروونیان ئاگادارو دۆزەرەوەو رۆشنبینی مەلەکوت بێت. پێغەمبەرانیش لەبارەی کاروبارێك هەواڵدەدەن لە پاشەڕۆژ روودەدات، پێغەمبەریش مرۆڤێکە پەردەی نادیاری بۆ کراوەتەوەو راسپێردراوە خەڵك رێنوێنی بکات و رێبەری بکات. کەواتە شتێکی نەکردە نییە (مستحیل) مرۆڤێك هەبێت نادیاری بۆ رۆشنکرابێتەوەو راستی کاروبارەکان ببینێ، راسپێردراو نەبێت و رێبەری نەکات. واتە پێغەمبەر نەبێت.

ئەوەی باوەڕی بە خەونبینی دروست هەبێت، پێشبینییەکان، زۆر ئاسانە باوەڕی هەبێت بەمەی کە باوەڕ بێنێت کە رێگەی سۆفیگەری لە زانین رێگەی هۆشەکییە، پێویستی هۆش دەیسەلمێنێت. تا ئێرە پێویستی هۆش ئەرکی خۆی بەجێ هێنا. وەك غەزالی بۆی چووەو متمانەی پێ پەیداکردووەو بەم رێگایەی زانیووە کە جێی متمانەیە بۆ دۆزینەوەو رۆشنبینی راستەقیە. غەزالی خۆی دایە دەست ئەم رێگایە، زانیاری پێویستی لێوە هەڵێنجا.

سەرەڕای ئەمەش ئەم هۆشدۆزییە، لای غەزالی رۆڵێکی دیکەی گێڕا ئەویش راڤەکردنی دۆزراوییەکانی و خورپەکانی بوو.

غەزالی لەم گەڕانەیدا، لەم گەشتەیدا یەك هۆکاری تایبەت هاندەری بوو ئەویش ئایین بوو، هەر بۆ ئایین بوو. ئەم لێکۆڵینەوەو گەڕان و

خوێندنەوانەی بۆ دۆزینەوەی دەرگایەك بوو بۆ رزگاربوون لە گومان کە هۆش دروستی کردبوو، مەبەستی نەبوو بگاتە دۆزینەوەی دیاردە گەردوونییەکان، بەڵکو دەیویست دڵنیابێت و راستی بزانێت.
هەر بەناوی ئایین، غەزالی هەندێ زانیاری پەسندکردو هەندێکی وەلانا، بیرکاری پەسندکرد لەبەرئەوەی پەیوەستە بە بەڵگەکاری، لەگەڵ بەراییەکانی بیرکردنەوە رێکە نەساز نییە، بەڵام لەوە دەترسا ئەوەی دەیخوێنێتەوە هەموو ئەم متمانەیە بدات بە زانستە فەلسەفییەکان.
غەزالی خوێنەر بوو دانەر بوو، بە زێدەڕۆییشەوە، بەڵام بۆ ئایین، گومانی کردو زێدەڕۆیی کرد لە گومانەکانی، بەڵام هاندەرەکەی ئایین بوو، لەبەر ئەمە دانراوەکانی هەر چەند زۆرن یەك سروشتیان هەبوو ئەویش روونی بیرۆکە بنچینەییەکە بوو، هێزی داڕشتن لە بەرگریکردن لە تیۆرییەکانی، غەزالی شێوازێکی هەبوو وشەی لێ هەڵدەقوڵا پڕ ژیان، دوور لە وشەکاری، ئاشکراو لێبڕاوانە، خوێنەر هەست دەکات دڵێك و هزرێکی لە پشتە و خواستێکی پتەو.
بارودۆخێ بەرایی غەزالی، دەبێ لەبەرچاو بگیرێت، باوکێکی سۆفیگەر، راسپێردراوێکی سۆفیگەر، مامێکی سۆفیگەر، برایەکی سۆفیگەر، مامۆستایانی سۆفیگەر، و ((نظام الملك))ی سۆفیگەرو هاوڕێی سۆفیان، سەردەمێکی سۆفیگەر، دواکایە دەروونی غەزالی گەشاوە، سۆزدار، مۆرکێکی تایبەتی بە غەزالیدا، مۆرکی ئاینداری و خۆ تەیارکردن بۆ رۆژی پەسلان و پاداشت.

غەزالی لە سەرەتای گەشتی ژیانیدا بە تەواوی ئەمەی نەزانیوە، بە بەڵگە ئەوەی هەندێ جار هەوای نەفسی یاری پێکردووە، ناوبانگردو دنیا راکێش کردووەو لەم پێگەدا بووە وەك خۆی باسیان دەکات.
ئەوەندەی نەبردووە، هۆکارەکانی بەرایی، شاراوە لە دەروونیدا، سەریان هەڵداوەتەوەو بەهێز بووین، ئاڵای سۆفیگەریان هەڵداوەتەوە، پاش ئەوەی ئامرازی بەرگری پێویست دابینکراون.
سۆفیگەری لە پێش غەزالیش هەبوو، بەڵام وا تەماشاکراوە، وەك شتێك نەیار لەگەڵ شەرع، بەڵام  کە لە مەیدانی ژیان سەری هەڵدا، سۆفیگەری پتەوکرد، شەرع لەسەر بەجێهێنا، ئەوی لەسەر شەرع بەجێهێنا بەرتری کردەوە، تا ئەو رادەی سۆفیگەری پایەکی بەرزی پەیدا کرد. لەنێو هەموو گرووپە ئیسلامییەکانی لەوکاتیدا.
بێگومان غەزالی لەم تەنیاگەریانەیدا زۆر شتی بۆ رۆشن بووەوە، کە بە ئامرازەکانی دیکەی دەست نەدەکەوت.
ئەوەتا لە ( ل130ی- المنقذ)دا دەڵێت:
(وانكشف لى أثناء هذه الخلوات أمور لايكمن إحصاؤهاو استقصاؤها)
لەم پەناگری و تەنیاگرییانەدا زۆر شت و کاروبارم بۆ رۆشن بوونەوە، بۆم دەرکەوتن، لە ئەژمارو بەکۆتایی نایەن.
ئایا غەزالی لەم ماوەیەدا چی لا رۆشن بۆتەوە؟
ئەم مەسەلانە چی بوون گومانی لێدەکردن بۆ دۆزینەوەیان وڵاتان گەڕا؟
بێگومان غەزالی ماوەیەك گومانی لە هۆش و هەست دەکرد، لەم ماوەیەدا باوەڕی بەهیچ نەبوو، سۆفستائی بوو وەك خۆی دەیوت.

**مەبەستمان ئەو ماوە نییە، پێش ئەو ماوەی دواتر تا ڕێبازی سۆفیگەری گرتەبەر.**

کەواتە دوو ماوە بوون:

**1- ماوەی پێشی نۆرە گومانە توندەکە.**

**2- ماوەی دوای نۆرە گومانەکەو تا کەوتە سەر سۆفیگەری.**

**لە ماوەی یەکەمدا گومانی لە پێوەرەکانی راستی نەبوو هۆش و هەست و کێشە بەناوبانگەکان و روالەتی دەقەکانی لەبەر دەستبوون.**

**گومان لە هەر تیمێك دەکرد گومانی لە راستیدا بکردبا؟!**

**ماوەی دووەم، گومانەکەی دوور بوو لە پێوەری راستی، تەنیا پێویستی هۆشپەسندی هەبوو، گومانی هەبوو کامیان لەسەر راستیدان؟!**

**هۆش و ئەوانەی دیکە لە ماوەی یەکەم و هۆش بەتەنیا لە ماوەی دووەم بەس بوون لای غەزالی بۆ سەلماندنی خوداوەند و راست و دروستی پەیامبەرو بە رێگەی پەیامبەرەوە باوەڕ بە رۆژی دوایی پەیدا دەبێت. ئەمەیش بنجەکانی ئیمانە.**

**غەزالی باس لەوە دەکات کە لە هەردوو چەشنی زانستە هۆشەکی و شەرعییەکان گەڕاوە زانستی یەقینی دەسکەوتووە، بە بەلگە گەلێك ناژمێردرێن، بەخوداوەند پێغەمبەرایەتی ، رۆژی دوایی.**

**لەو مەسەلانەی غەزالی گومانی بۆ پەیداکرد، مەسەلەی دەروون (نەفسی) بوو: رەهابوونی، جەوهەری (کاکل بوون) بوونی، دێرین و نوێ بوونی، مانەوەی، لەناوچوونی.**

ئەم مەسەلانە غەزالی لە (معراج السالكين) باس كردوون دەڵێت:
((انها أس العلوم، و مفتاح معرفة الله، وطريق معرفة العالم، وانها المسألة التى لها يعمل العاملون، ويجتهدا المجتهدون، وانها اذا ثبت بقاؤها، امكن تصديق الانبياء في كل ما أتوبه، مما يتعلق باليوم الآخر.
من ثواب و عقاب، وسؤال وجواب، وبعث و نثور.. أنح وأما اذا لم يثبت بقاؤها، انهدمت النبوات، وبطل كل ما أنت به، من حديث عن امور الاخرة)).
ئەم مەسەلەیش وەك غەزالی دەڵێ: شەرع باسی وردەكارییەكانی نەكردووە، لەبەرئەوەی زۆر ئاڵۆزە، بیر تیایاندا لاوازە، لەبەر ئەمە كە لە پێغەمبەر (د.خ) پرسیار كرا لەبارەیەوە، وەڵامەكە چی بوو!
((قل الروح من امر ربى)) بڵێ گیان (دەروون) لەكاروبارەكانی خوداوەند یە، بەر فەرمانی خوداوەند یە، ئیدی وەستا چی دەیكەی لەبارەوە نەوتراوە.
تیمە جیاجیاكان لەبارەی دەروون، ڕاڕەو ی جیاجیان هەیە، هەیە دەڵێ: دێرین (قدیم) هەیە دەڵێ (نویٚ= محدپ) كردە، هەیە دەڵێ دەمێنێتەوە، هەیە دەڵێ لەناو دەچیٚ، هەیە دەڵێ ڕەهایە، هەیە دەڵێ بەرجەستەیە، هەیە دەڵێ گەوهەری تاكە.
كەواتە، مەسەلەكە زۆر گرنگە، شەرع وردەكاری لەبارەوە نەداوە، تیم و گرووپە جیاجیاكان نەگەیشتوونەتە رایەك، لەسەری كۆك بن و دڵنیایی تێدابێت، كەواتە غەزالی بە ئەركی خۆی زانیوە بایەخی پێبدات، بە

هێمنی لێی بكۆڵێتەوە، هەموو ئەو رایانە بخاتەڕوو كە لە بارەیانەوە وتراوە، تا ئەو رادەی هزری دەگەیەنێتە رای راست تیایدا.

كەواتە دەروون (النفسی) یەكێك بووە لەو مەسەلانەی غەزالی گومانی تێدا كردووە. لەبەرئەوەی دەروون بنچینەیە بۆ دڵنیایی لە رۆژی دوایی، كەواتە غەزالی گومانی لە رۆژی دوایش كردووە، كەواتە بە راست زانینی پێغەمبەران پێویستی بەم زنجیرە باوەڕەو دڵنیاییە هەیە، كەواتە غەزالی لەم دوو ماوەیەدا گومانی لە پێغەمبەرایەتی و رۆژی دواییش هەبووە، ئەم بەڵگەگری و لێهەڵێنجانە لۆجیكییە، هەرچەند دەقیشی لەبارەوە نەبێت.

بەهەمان شێوە هەندێ مەسەلەی خودازانییەكان (الالهیات) غەزالی گومانی لێكردوون وەك: مەسەلەی زێدەیی ئاكارەكان (سیفەتەكان) و زیادنەبوونیان، (زیادنەكردنیان)، هەروەها مەسەلەی توانستی خودا (قدرة الالة) و تێكەڵ و خزاوەتە وردو درشتی گەردوون؟ یا مەسەلەی ژیانی ئاسمانەكان، وەك بوونەوەری زیندوو، یا نازیندوو؟.. هتد لە مەسەلەی دیكەی تیۆری.

ئەم مەسەلە تیۆرییانەیە غەزالی بەدوایاندا گەڕاوە.

غەزالی گومانی بە ئامرازێك دەزانێ بۆ پەیداكردنی زانستی دروست لەمبارەیەوە لە (المنقذ من الضلال)دا دەڵێت:

(والمقصود من هذه الحكايات، أن يعمل كمال المجد في الطلب، حتي ينتهي الى طلب ما لا يطلب، فإن الاوليات ليست مطلوبة، بل هى حاضرة، والحاضر

اذا طلب فقد واحتضى، ومن طلب مالا يطلب فلا يتهم بالتقصير في طلب ما يطلب).

واتە، مەبەست لەم چیرۆکانە کارکردنە بۆ زانست خوازی زانستێك، دەرگای راستییەکان بکاتەوە. لە (ميزان العمل)دا دەڵێت:

(فجانب الالتفات الى المذاهب، واطلب الحق بطريق النظر، لتكون صاحب مذهب، ولاتكن في صورة أعمى، تطلب قائداً يرشدك الى الطريق، وحواليك ألف مثل قائدك، ينادون عليك بأنه أهلك وأضلك عن سواء السبيل، وستعلم في عاقبة أمرك ظلم قائدك فلا خص الا بالاستقلال.

خذ ماتراه ودع شيئاً سمعت به

في طلعة البدر مايغنيك عن زحل

ولو لم يكن في مجارى هذه الكلمات، الا مايشكك في اعتقادك الموروث، لتنتدب للطلب، فنا هيك به نغمعاً، اذ الشكوك هي الموصلة الى الحق، فمن لم يشك لم ينظر، ومن لم ينظر لم يبصر، ومن لم يبصر بقي في العمي و الضلال).

واتە، وازە لە راڕەو ەکان (المذاهب) بێنە خۆت رێچکە بدۆزەوە بۆ گەیشتن بە راستی سەربەخۆ بە پێویستت بە رێبەر نییە.

لە (معراج السالكين) دا دەڵێت:

(واعلم يا أخى، انك متى كنت ذاهباً الى تعرف الحق بالرجال، من غير ان تتكل على بصيرتك، فقد ضل سعيك، فإن العالم من الرجال، إنما هو كالشمس أو كالسراج: يعطي الضوء، ثم انظر ببصيرتك فان كنت أعمى فما يغني عنك السراج و الشمس، فمن عول علي التقليد هلك هلاكاً مطلقاً).

واتە، بزانە، گرنگ تۆی، گەر ڕێبەرو زانا وەك خۆرو چرا وابوون تۆ چاوت نەبوو ڕووناكی پێببینی بێسوودە.
خۆت بڕوانە مەسەلەكان بیریان لێبكەوە..
یان لە مەزنترین كتێبیدا لەبارەی پشتگیریكردنی (ئەشعەرییەكان) بەناوی (الاقتصاد فی الاعتماد).
(إن إقدام الخلق و احجامهم في اقوالهم وعقائدهم و افعالهم تابع للأدهام. وأما أتباع العقل الصرف، فلا يقوى عليه الا أولياء الله تعالى، الذين أراهم الحق حقاً، وقواهم على اتباعه.
وان أردت ان تجرب هذا في الاعتقادات، فأورد علي فهم العامي المعتزلي مسألة معقولة، فيسارع الى قبولها، فلو قلت له: إنه مذهب الاشعري، رضي الله عنه، لنفروا متنع عن القبول، وانقلب مكذباً بما هو مصدق به، مهما كان سيئ الظن بالآشعري، أو كان قبح ذلك في نفسه منذ الصب.
وكذ اتقرر أمراً معقولاً عند العامي الاشعري، ثم تقول له: إن هذا قول المعتزلي فينضر عن قبوله، والتصديق بة ويعود الي التكذيب، ولست اقول هذا طبع العوام، بل طبع اكثر من رأيته من المتوسمين باسم العلم، فإنهم لم يفارقوا العوام.
في اصل الاعتقاد، بل اضافوا الى تقليد المذهب، تقليد الدليل، فهم في نظرهم لايطلبون الحق، بل يطلبون طريق الحيلة في نصرة ما اعتقدوه حقاً بالسماع والتقليد، فإن صادفوا في نظرهم ما يؤكد المتقادهم قالوا: لقد ظفرنا بالدليل، وان ظهر لهم ما يضعف مذهبهم قالوا: قد عرضت لناشبهة.

فیضعون الاعتقاد المثلف بالتقلید اصلاً، وینبذون بالشبعة کل مایخالفة، وبالدلیل کل مایوافقة.

وانما الحق ضده، وهو ألا یعتقد شیئاً أصلاً، وینظر الی الدلیل، ویسمی مقتضاه حقاً، ونقیضه باطلاً).

واتە گوتەو هەڵوێست و را پەیداکردن لای زۆران تەنیا لاسایی کردنەوەیە، دەمارگرییە بۆ نەریت ئینجا دەمارگری بۆ ڕاڕەو (مذهب)ی هاتۆتە سەر هەریەکە ڕاڕەو ی خۆی پێ چاکە بێ گوێدانە راستی و ناڕاستی بۆچوونەکە، بۆ نموونە: گەر مەسەلەیەکی ماقول بە موعتەزیلیەك بڵێی، بەڕاستی دادەنێ مەقبوڵیەتی، بەڵام کە بڵێی ئەوە ڕاڕەو ی ئەشعەرییە، دەست بەجێ پاشگەزدەبێتەوەو بە ناڕاستی دادەنێت، هەرچەند خۆی قبوولی بوو، بەهەمانشێوە بۆ قسەکەی ئەشعەری، هەمان هەڵوێست دەوترێت. تەنیا لای خەڵکی ئاسایی وانییە، بەڵکو لای زانایانیشی ئەم دەمارگرییە بۆ ڕاڕەو باوە سەرەڕای دەمارگری بۆ بەڵگە، جۆری بەڵگە، گرنگ ئەوەی بە بیستن و لاسایی بە راستیان زانیوە ئەو سەرکەوێ، گرنگ نییە لای ئەوان چ بەڵگەیەك لە ئارادایە.

غەزالی هەواڵی مردنی یوسفی کوڕی تاشفینی پێگەیشتوە و، گەڕاوەتەوە. یاقوت لە (معجم اللبدان) (ط (لایبزیغ، مجلد 3 ص561) دەڵێت: ((دەڵێن (غەزالی) لە منارەی ئەسکەندەریە مایەوە)).

ئەبو فیداش لە (تاریخ ابو الفدا، جـ2 ص226) دەڵێت: چووە دیمەشق و ماوەیەك لەوێ مایەوە دواتر چوو بۆ قودس و پەرستشی زۆری کرد، دواتر چوو بۆ میسر و ماوەیەك لە ئەسکەندەریە مایەوە..).

**<u>دیسان له نهیشابوور</u>**

**زانیمان خواستی مندالآنی وایانکرد غهزالی بچێتهوه تووس، دوای ئهوهی وایدانابوو قهت ناگهڕێتهوه، ههر له تووس بهردهوام بوو لهسهر تهنیاگهری، ههرچهنده ناوهناوه بهکاروباری ژیان خهریك دهبوو.**

**لهو بارهدا بیستی خراپهکاری بلآوبۆتهوه، خراپه وای لێهاتبوو باوهڕیشی دهههژاند، بیری لهوه کردهوه لهم گۆشهگیرییه لاچێت، خهڵك بانگ بکات بۆ راستی و دادپهروهری، بهڵام ئهوهندی نهبرد بینی: (وهك له (المنقذ-ص153)دا هاتووه، ئهم کاروباره:**

**(لایتم الا بزمان مساعد، وسلطان متدین قاهر، فترخصت فیما بیني و بین الله بالاستمرار على العزلة، تعلیلاً عن اظهار الحق بالجمة، فقد الله تعالى أن حرك داعیة سلطان الوقت من نفسه، لا بتحریك من الخارج، فأمر أمر إلزام بانهوض الي ((نهیشابوور)) لتدارك هذه الفترة، وبلغ الامر حداً كاد ینتهي- لو أصرات علي الخلاف- الى حد الوحشة، فخطرلي أن سبب الرفصة قد ضعف، فلا ینبغي أن یكون باعثك على طلب العزلة الكسل، والاستراحة، وطلب عز النفس و صونها عن اذي الخلق).**

**واته: کاری وا پێویستی رۆژگارێکی یاریدهدهر ههیه، هاوکات دهسهڵاتدارێکی دینداری بهتوانا، خوداوهند ی گهوره ئهم دهرفهتهی رێکخست، غهزالی چوو بۆ نهیشابوور، نهزانراوه کهی چوو بۆ نهیشابوور**

یا کەی گەڕایەوە، غەزالی چوو بۆ ئەوەی لە خوێندنگەکەی وانە بڵێتەوە، ئەمە دووەم جارە دەچێت بۆ نەیشابوور: جاری یەکەم لە ژیانی ئیمامی حەرەمین، ئەم جارەش دووەم جاریەتی و جیاوازە لە جاری یەکەم، لە (المنقذ- ص154)دا هاتووە:

(وأنا اعلم أنى وان رجعت الى نشر العلم، فمارجعت، فإن الرجوع عود الى ما كان، وكنت في ذلك الزمان أنشر العلم الذي به يكسب الجاه، وأدعو اليه بقولى وعملي، وكان ذلك قصدي و نيتي..)

دەزانم کە دەگەڕێمە خوێندن، بەڵام وەك جاری بەرایی نییە، کە تیایدا خەریکی زانست بووم بۆ پلەو پایەو بە ئاخاوتن و کردەنی خەریك بووم، هەر ئەوەش بوو مەبەست و نیازم.

(وأما الآن فأدعوا الى العلم الذي به يترك الجاه، ويعرف به سقوط رتبة الجاه، هذ هو الآن نيتى وقصدى وامنيتى، يعلم الله ذلك مني).

بەڵام ئێستا خوداوەند دەزانێ، مەبەست و نیازم فێرکردنی ئەو زانستەیە تیایدا پلەو پایە مەبەست نییە، بەڵکو شکستی پلەوپایە.

غەزالی لە نەیشابوور ماوەیەك مایەوە، دواتر گەڕایەوە تووس، ئیدی هەر لەوێ سەری نایەوە، لە تەكماڵەکەی خوێندنگەیەکی بۆ فەقێیان دروستکردو، هەوارگەیەك بۆ سۆفیگەران، تا لە 14ی جەمادی دووەمی ساڵی 505ك، کۆچی دوایی کرد. بە ئامادەبوونی براکەی ئەحمەد، دواتر لە ڕۆژهەڵاتی قەڵا لە گۆڕستانی (تابران) نێژرا، نزیك لە شاعیری ئێرانی مەزن فیردەوسی بەناوبانگ.

بەم جۆرە غەزالی گیانی سپاردە خودای مەزن و، جەستەی لە تووس بەخاك سپێردراو ناوی نەوە دوای نەوە بڵاوبۆوە تا گەیشتە هەموو نەتەوەکان.

**بنیاتی سۆفیزم لای غەزالی**

بنیاتی سۆفیزم لای غەزالی لەسەر بنچینەی لە یەك جیاکردنەوەی زانست و ئایین دامەزراوە بە بۆچوونی ئەو راستی سەر بە باوەڕی ئایینییە:
((ان الحقیقة بصورة عامة تابعة عنده القائد الدینیة)) (المنقذ ص56-57
یەکەمیان (زانست) پشت بە ئەزموون و هۆش دەبەستێت؟
دووەم (ئایین) (ینبجس من القلب) (المنقذ ص55) لە دڵەوە هەڵدەقوڵێت.
ئاشکرایە دڵ پێگەیەکی گەورەی هەیە لە هزری ئیسلامیدا، لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)ئەمە دەرکەوتووە.
غەزالی بایەخی بەم لایەنەدا کە (یتصل بهذا والقلب الذی هو محل المعرفة) (المنقذ ص144).
کەواتە دڵ سەرچاوەی زانینە، هۆکارو ناوەندێکە بۆ پێغەمبەرایەتی بە زەوق و حاڵ- چێژو بار (المنقذ ص132) کە پەیوەستە بە وەحی. کەواتە دڵ هێمای زانینی چێژ یارییە (المعرفه الذوقیة)ی هاوشێوەی زانینی پێغەمبەرایەتی یە.
غەزالی ئاماژەی بەوەدا مەبەست ئەم ئەندامە نییە لە نێو جەستەدایە (المنقذ ص144)، بەڵکو (طوروراء العقل)، (المنقذ ص156) چەشنێکە لەو دیو هۆشدا.

لەبەرئەوەی هۆش، لە بنجدا، (غیر (کاشف للغطاء عن جمیع المعضلات) (المنقذ ص108) هۆش هەموو گرفتەکان چارە ناکات کەچی پێغەمبەرایەتی هەموو ئاشکرا دەکات.
دڵ، کە دەگاتە تەواوی زانین، بەختەوەری و خۆشی لێ دەڕژێت، کە بە باڵاچوون دێتە دی، کە تیایدا زانینی پێغەمبەرایەتی یانە یەکسان دەبێت بە زانینی دڵ، کات و شوێن نامێنێت، نزیکی دەوری ناهێڵێت، (اذ ذاك یتحقق المقصود بظهور الحق)) (میزان العمل، القاهره، 1328ه، ص30).
ئەم هزرە لە (احیاء علوم الدین) نەهاتۆتە دی، لەبەرئەوەی لە سەرەتای سۆفیگەری نووسیویەتی. بەلأم لە کتێبەکانی دیکە بەرچاون.
لێرەدا بایەخ بە دوو شت دەدەین باوەڕدار (سۆفیکار)، دووەم تیۆری نزیك بوونەوە لە خودا (= ئەزموونی سۆفیکاری).
باوەڕدار: باوەڕدار (المؤمن) لە سۆفیزمدا بەگشتی و لای غەزالی بەتایبەتی، سۆفیکارێکە خاوەنی رەوش وبارە (الاحوال) کەدوای پاککردنەوەی دڵ پێیگەیشتووە، لە کۆششێکی زۆردا رێوانی رێگا بووە لای ماموستایەکی لەم زانستەدا کە باڵاترین زانستە؟ زانستی خوداوەند ناسی، رەو بەرەو خوداوەند .
هەروەها باوەڕدار لە دیدی غەزالی ئەو کەسەیە کەوا رێنوێنی کراوە، هیدایەتی دراوە، ئەوەی خوداوەند هیدایەتی بدات هەر ئەو هیدایەت کراوە، هیدایەت لەبەرئەوەی کاکڵی زانستە، دەکەوێتە بەر دیاریدە فرەجۆری لێکدژی، وەك: سەرەتاو کۆتایی، دیارو پەنهان، ئاشکراو شاراوە،

باوەردار (المؤمين) ناگاتە کۆتایی مەگەر سەرەتایی هەبێت، لە شاراوە ناگات گەر ئاگاداری ئاشکراو دیارەکە نەبێت:

((لن یصل المؤمین الی النهایة الا اذا تمکن من البدایة، ولن یدرك الباطن الا بعد ان یطلع علی الظاهر (الغزالی، بدایة الهدایة ص224

ئەم رایەی غەزالی بۆ سەلماندنی (أن وراء الا دراك الحسی والعقلي إدراكاً أصح وآمن وأدعی للشقة)) (الطویل: أسی الفلعة ص370)

ئەوەیە کەوا لە پشت پێزانینی هەستی و هۆشەکی پێزانێنێکی دروستی و ئەولەهی تر هەیە کە پتر جێی متمانەیە.

ئا لێرەوە، لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەی گیروگرفت و ئاڵۆزاوییەکان، غەزالی زانستی ئایینی دابەش دەکات بۆ:

1- زانستی کارسازی (علم المعامله) زانستی کارسازی پەیوەستەبە کاروباری ژیانە، پەیوەستە بە دەروون (بەلەبەرچاوگرتنی دەروونی لۆمەکراو باش واتە لەگەڵ زانینی (معرفة النفسی المذموعةو المحمودة)) (الکشف والتبین. ص204).

واتە هەموو ئەو زانیاریانەی پەیوەستن بە ناسینی دەروون لێرەدانی، هاوکات پەیوەستن بە گوناهەکانی دەروون و لێ رزگاربوونیان لەم هەگبەدان (کل ما هو کفیل بمعرفة النفس، وذنوبها واتخلص من عملیة اقترافها) (منهاج العابدین ص15).

دیارە ئەم گوناهانە، زانینیان، ئەوکاتە دروست و کارایە کەوا دۆزینەوەی ناوەوەیی (الکشف الباطنی )لە زانستی روونبینی (علم المکاشفه) بەدی دێنێت. روونبینی یا حەدەس ئایینی لای سۆفیکاران، جۆرێکە لە پێزانینی

بالاّ لای ئەوانە دەرسکێ کەوا ((مثله الا على كان أسمى من هذه الدنيا)) (المنقذ ص27). واتە نموونەی بالاّی لەم دنیایە بەرزتربێت.
ئینجا- زانستی روونبینی (علم المكاشفه)، ئەو زانستەی پەیوەست و تایبەتە بە بنجەکانی خوداوەند ناسی و پێزانینی سیفەتەکانی (الكشف والتبين ص204).
لەبەرئەوەی ناسینی خوداوەند بەرهەمی خۆشەویستییەتی (الكشف والتبيين ص207). هەروەها خۆشەویستی ئەفرێنراوەکانی.
کاکڵ ئەم زانستە رێکهێنانی زانستی کاروباری ژیانە، واتە زانستی کارسازییە.
ئەو مەسەلەی پەیوەندی زانستی کارسازی و روونبینی دەی وروژێنێت پەرستنە (العباده).
غەزالی پلانێکی گشتگری دانا بۆ پەرستن، بە پشتبەستن بە زاهیرو باتن (منهاج العابدين. ص146). غەزالی بەرگری لە هزرو بۆچوونێك دەکرد کەوا بەڕاستی- بەپێی بالاّچوونی لە سۆفیکاریدا- لێی دڵنیابوو کەوا پەستنی ڕواڵەتی بەس نییە بۆ ئەوەی تەرازووی چاکە (الحسنات) سەنگین بێت لەبەرئەوەی پەیوەستە بە روونبینی (المكاشفه) و ئەرکی پەرستنی باتینییە. (الكشف والتبيين. ص214).
هەروەها دەتوانێت ((الخروج عن الذنوب واالتخلص منها)). (منهاج العابدين ص15).
گوناهەکانیش غەزالی بە سێ جۆرێ داناون:

1- ئەو گوناهانەی باوەڕدار بەهۆی نەکردنی ئەرکەکانی خودا (ترکه واجبات الله) دەیکات.

2- ئەو گوناهانەی لە نێوان باوەڕدارو خودادان.

3- گوناهی نێوان باوەڕدار و خەڵك.

دواتر کاروبارەکان لا غەزالی بە پێوەری دنیا نەویستی دەپێورا، کە بە سادەیی دەستپێدەکات دواتر توند دەبێت و دەبێتە (نسك) واتە سۆفیکاری.

واتە کۆششی دەروون لە مرۆڤدا یەکەیەکی پتەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤ یەکەیەکی تێکبەستەیە لە بیرکردنەوەو رەفتارو ویست و کار (احیاء علوم الدین 5/3).

لە پلە سۆفیکاریدا، لە ئارامی گیانی، باوەڕدار دەگاتە زانستێکی تایبەت، سیفەتی بالآترین زانستی هەیە، زانستی پێزانینی گشت، کە ئەفرێنەرو دروستکەرو تاك و بالآو... هتد.

ئەوەشیان بە پەرستکاریی باتینی دێتەدی بە پابەندبوون بە پەرستکاریی رواڵەتی لەسەر بنەڕەتی هەست کردن بە تەنیایی دڵ لەگەڵ خوداوەند (بدایه النهایه ص244).

لەوکاتەیدا، باوەڕدار بەهای خۆی دەزانێت لەبەردەك ئەم دەریا گەورەیەی جیهانیان، کە دەکەوێتە گۆشەگیری راستەقینە لە پەستکارییەکاندا.

غەزالی ئامرازەکەی بە هیدایەت دەزانێت هیدایەتی تەواو و لەسەر رێبازی یاساکاری لە ((استبطان عملیة الکشف عن طریق الالهام)) (العثمان: الدراسات انفیة. ص35).

لە ڕێگەی سرووش پرۆسەی روونبینی باتینی پەیداکردن.
لێرەدا غەزالی دەگاتە ئەوەی بڵێین ئەو زانستە ئەرکە فەرزە گەر یەکێك بێت لەم زانستانە:
1- علم التوحيد/ زانستی خوداوەند ناسی.
2- علم السر/ (پەیوەست بە دڵ) زانستی نهێنی.
3- علم شريعه/ زانستی شەریعەت.
یەکەم و دووەمی تایبەت کرد بە زانستی روونبینی (علم المكاشفه)، سێیەم لە زانستی کارسازیدا بوو ( علم المعاملات)، کە ڕێکخەری پەرستکاریی رواڵەتییە، کەچی زانستی نهێنی (پەیوەست بە دڵ) ئەم پەرستنە دەگوازێتەوە بۆ ناوەوە، بۆ ئەوەی زانستی خوداناسی بێتەدی بە هەستی داهاتوو، یا نەست، بەپێی سرووش (الالهام) (منهاج العابدين ص7).
بۆ ئەوەی پەیوەندی تەواو بێت لە پەرستکاریی (عبادە)ی باوەڕداردا بەخودا، لەکاری دڵدا کە تیایدا (شیرینی نهێنیی ئاخاوتن) (حلاوه المناجاه) هەیە.
(منهاج العابدين ص31).
لێرەدا هزرەکان بۆ هۆش دەردەکەون (وضوح الافكار وانكشافها للعقل انكشافاً بديهياً) (المنقز ص46-47).
دوای ئەوەی باوەڕدار بەچێژ (الذوق)، لە قۆناخی دواتر، رەت دەبێت لە بڕیارە لێکدژەکان بواری زانست و شەریعەت.
دواتر هاتنە پێشەوەی عیرفان، زیاتر لە زانست لە گەیشتن بە یەقین (المنقذ ص57)

(تغليب الضريعة بالعرفان، على العلم عن تحقق اليقين)

گەیشتنە یەقینیش ((هەموو ئیمانە (باوەڕە) کە تیایدا تەواوی روون دەبێتەوە تا دەگاتە ئاکاردارببوون بە ئاکاری خودا (اخلاق الله) (فاتحه العلوم، القاهره 1322هـ، المقدمه)

(ئەم بیرۆکەیە فارابی، پێی زانیوەو پەیوەستی کردووە بە توانای مرۆڤ- مباحث فلسفة الفارابي، ط. ديتريشي، ليدن. 1890 ص53) (ص116- عبدالامیر الاعسم).

تەنیا خودا ئامانجی غەزالی بووە لە باوەڕەکەیدا- دوای ملدان- بەرەهایی بۆ ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە- لەبەرئەوەی غەزالی دەیزانی پەرستکاری باوەڕداران دەبێ هەردوو دیارو نادیار دەرەوەو ناوخۆ بگرێتەوە ئەم دوانەییە رێگایە بۆ گەیشتن بە روونبینی (الكشف) کە ئیماندار مەبەستییەتی.

کەواتە پێویستی قووڵبێتەوە لە واتاکانی (اسماء الله) (المقصد الاسنى فى شرح اسماو الله الحسنى، القاهره، 1322هـ، ص23).

بەبەردەوام یادکردنەوەی، چونکە یادکردنی بەردەوام دێتە دی بە ((تطهير القلب فهو تقوي الباطن)) (بداية الهداية ص265) واتە بە پاککردنەوەی دڵ دێتەدی.

**غەزالی لە (الاحیاء) و راو بۆچوونەکانی**

**لەبارەی سۆفیگەری**

**د. عبدالامیر الاعسم:**

**غەزالی رێگای سۆفیگەری هەڵبژارد، گۆڕانێگی دراماتیکی لە ژیانی روویدا، هۆکاری کۆمەلآیەتی، سیاسی، ئاینی، کەسی لە پشتەوە بوو لە کاروباری ژیان کشایەوە، لە بەغداد دەرچوو (448ك). گەشتێکی دە ساڵەی دەست پێکرد. دواتر (498ك) کە گەڕایەوە بەغدا ئەو کتێبەی لەم گەشتەدا داینا دەیوتەوە (إحیاء علوم الدین) لە خوێندنگەی نیزامیە دەیوتەوە. ئەو کتێبەی لە دیمەشق دانابوو. 1**

**لە (الاحیاء) غەزالی جیایە لە کتێبەکانی دیکەیدا، تیایدا بەرنامەیەکی دیار رێگایەکی روونی هەیە کە سۆفیگەرییە، ئاشکرای دەکات لە سۆفیگەری پەیڕەو دەکات، هاوکات زانیارستانێکە بۆ هەموو زانستەکانی ئایین لە قالبی سۆفیگەریدا، هاوکات کۆششی توند دەکات بۆ پەیڕەوکردنی رێنوێنییە سۆفیگەرییەکان د. عەبدولڕەحمان بەدەوی- ئاماژە بە خاڵێك دەکات کەوا غەزالی نەیتوانیوە لەم کتێبەشدا لە کاریگەری بۆچوونە ئەفلاتوونیە نوێکان رزگاری بێت. 2**

**1-الضیلوف الغزالي- اعادة تقویم لمنحنی تطوره الروصي، 1998، دار قباء- مصر.**

2-(بدوی: الغزالي و مصادره اليونانية (ضمن كتاب مهرجان الغزالي) رقم 8، ص 221-237).

ئەو فەلسەفەیەی کاریگەری هەبوو لە گەشەسەندن و پەرەپێدانی سۆفیگەری رۆژهەلآت بەگشتی.

تا دەڵێت: دەتوانین بڕیار بدەین – بە دڵنیاییەوە- کەوا غەزالی وازی لە فەلسەفە نەهێناوە، تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە فەلسەفەیەکی دیکەی هەڵبژاردووە، ، بەگشتی، بەڵام تا دوا تەمەنی هەر دڵسۆزی ئەفلاتونێتی نویٚ بوو))(1)

(1- بدوی: الغزالي و مصادره اليونانية، ص236)

(الصلح بين الصوفيةو المذهب الافلاطوني الجديد تقوم على اساس السلوك الذاتي في المعرفة الالهية )- بەردی ئاماژە بەو پەیوەندییە دەکات کە لە نێوان فەلسەفەی ئەفلاتونێتی نویٚ و سۆفیگەری هەیە ئەویش رەفتاری خودیانەیی بۆ خوداوەند ناس).

بەهۆی ئەوەی (احياء علوم الدين)، بنەڕەت و سەرەتای بەرنامەی و رێبازی غەزالیە لە سۆفیگەریدا، پێویستە هەندیٚ تایبەتمەندییەکانی بەرچاو بخەین، سەرەڕای ئەوەی ترۆپکە لە کەلەپووری ئاکاریی ئیسلامی، تێبینی دەکریٚ

(د. زەكی مبارك- كتێبەكەي (الاخلاق عند الغزالي)- ط- القاهرة 1925- هەمووی لەسەر بنچینەی ئەم کتێبی (احياء علوم الدين) بنیاتناوە. کتێبێکە ئاکارناسیانە، و دانەرەکەی گەورەترین تیۆردانەری ئاکارناسییە.

د. فیلیب حتی دەیخاتە ریزی (الکتب العقلیە الصوفیە- کتێبە هۆشپەسندییە سۆفیگەرییەکان) (حتی، فیلیب: تاریخ العرب، ج2 ص488).

نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو زانیارستانێکی (ئینسایکلوپیدیا) ئیسلامی گەورەیە.هەموو توێژێکی کۆمەڵگە بەشی خۆی تێدایە.

ئایینداران بە راستترین کتێبی دادەنێن بەرگری لە ئیسلام کردبێ دژی توێکڵە پووچەکانی شارستانی، فیقهزانان ئەم کتێبە بە بنجینەی بنجە ئیسلامییەکان و لکەکانی دادەنێن. کەلامناسان- لە خوێندنگەی ئەشعەری تێکەڵ بە بیری سۆفیگەری بەتایبەتی- بە باشترین سەرچاوەکانی راڕەو ەکەیان دەزانن و بە باشترین بەڵگەی بەرپەرچ دانەوەی هۆشگەران (العقلیون) دەزانن.

سۆفیگەران، لە دواکایە ئەم کتێبە (احیاو علوم الدین) بە بە نرخترین پڕ بەهاترین کتێبی سۆفیگەری دەزانن کە دەبێ رێوان پەیڕەوی بکات.

ئا لێرەوەیە کۆی زانایان لە مێژووی ئیسلامدا بایەخیان بەم کتێبە داوە، بەتایبەتی هەوڵیانداوە کورتەو پوختەو ئاسانکاری بۆ بنووسنەوە، شایانی باسە (احیاء علوم الدین) (26) بیست و شەش کورتکراوەی هەیە، د. بەدەوی باسی کردووە لە (مؤلفات الغزالی)، (ص114-118) ).

هەرچەند نەیاری هەبوون ئەوانیش کورتەیان بۆ نووسیوە وەك کاشانی (محمد بن مرتضي محسن الفیض الکاشاني)، لە 1081/ 1680 کچی دوایی کردووە، یان ئەو زانایەی وای دانەوە غەزالی لە رێساکانی فیقهزانی

دەرچووە وەك ابن الجوزی) (ابو الفرج عبدالرحمن بن علی، المشهور بابن الجوزی، لە ساڵی 597/ 1200- 1201 کۆچی دوایی کرد).

کە رەخنەی لە رێبازی غەزالی گرت لە دانانی کتێبی (احیاء علوم الدین)، رەخنەکەش لە بنچینەیی ئەوە رۆناوە گوایە غەزالی کاریگەری زۆری سۆفیگەری لەسەرە بەتایبەتی مامۆستاکەی (الفارمدی) و کتێبەکانی (أبی طالب المکی- (ت 386(996) بەتایبەت (قوت القلوب).

غەزالی خۆشی، وەڵامی زۆر لەو رەخنانەی دایەوە کە ئاراستەی کتێبەکەی کران، لە کتێبێکدا بەناوی (الاملاء علي اشکالات الاحیاء) (کە هەمان کتێبی (الاجوبە المسکتە عن الاسئلە المبهتە).

لەو کاتەیدا کەوا کۆمەڵە فیقهزانێکی (ئەندەلوسی) لەبارەی (احیاو علوم الدین) نارەزاییان دەربڕی گوایە ئاستی فیقهزانان کەم دەکاتەوە لەبەرئەوە (قاضي قرطبة) و هاورێیانی فتوایەکیان دەرکرد تیایدا غەزالی بە نوێیار (مبتد) و هەر تەقە (لە ئایین لادەر) ناویان برد، (دیارە هۆکاری سیاسیش لەپشت بووە لەبەرئەوەی غەزالی فتوای دابوو کەوا (ابن تاشفین) شایانی ئەوەی ببێتە سوڵتان لە وڵاتەکەی (لەسەردەمی (المقتدی بامراللە) ئەویش رازی بوو نازناوی (امیر المسلمین)ی دایێ.

لەسەر ئەم رووداوانە کتێبی (احیاو علوم الدین) لە ئەندەلوس سووتێندرا، بەبەرچاوی خەڵك و سزای کوشتن داندرا بۆ هەر کەسێك کە بیخوێنێتەوە لە سەرتاسەری مەملەکەت (بروکدمان: تاریخ الشعوب الاسلامیە ج2 ص188).

جێی سەرسوڕمانە ئەم هەلوێستانەی دژی کتێبی غەزالی (الاحیاء) بەتایبەتی لە ئەندەلوس و لەسەر دەستی ((سووننە توندڕەوەکان)) بوو. (بروکلمان 2/ 130) کتێبەکانی غەزالی گەیشتبوونە مەغریب لە رێگەی ئەسکەندەریە، لەکاتی گەشتەکەی کە دەیویست بچێتە لای یوسف بن تاشفین.

سەرەڕای ئەوەی هەندێ قوتابیان غەزالی خەڵکی مەغریب بوون وەك: ئەبوبەکری ئیبن ئەلعەرەبی (ئیبن عەرەبی سۆفی و بەناوبنگ جیایە لەمە). سەیر لەوەدایە ئەوەی فەرمانی بە سووتاندنی کتێبی (الاحیاء) کردووە، عەلی کوڕی یوسف کوڕی تاشفین، بوو  بە بیانووی خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەبێتەهۆی لەبەرچاوکەوتنی فیقهزانان و بەتایبەتی مالیکیەکان (تنتقص الفقهاء، ومنهك أتباع مالك) (1)

(1- حتی: تاریخ العرب 2/ 645)

(ابن الجوزی) دەنووسێت لە (المنتظم: حوادث سنة (505): غەزالی لە (الاحیاو) زۆر فەرموودەی هەڵبەستراوی هێناوەتەوەو هەندێ فەرموودەی نادروست. ئەوەیش لەبەر ئەوە بووە کە شارەزا نەبوو لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ).

واباش بوو ئەم فەرموودانەی پێشانی شارەزایەك بدابوایە، هەر لە گۆترە گواستوونەتیەوە!!

غەزالی کتێبی (الاحیاء)ی دانا، کە لە سەرەتای گەشتە سۆفیگەرییەکەیدا بوو دوای کۆششێکی زۆرز هەست بە ئاسوودەیی دەروون و هێمنایی گەڕاوە تووس، ئەم چەند زێدەگۆییە (شطحات)ی لە ئەحیادا هەیە ئاکامی

**ئەم كۆششەیە، (الاحیاء) ئێستاش ڕێچكەیەكی توندی تێدایە لەبارەی خۆ لێپرسینەوە. غەزالی لە سۆفیگەریدا هەوڵی داوە ئاكاری خودای مەزن پەیڕەو بكات ((التخلق باخلاق الله)) لە (فاتحە العلوم، القاهرە، 1322هـ: المقدمە) دا دەڵێت: (ان كمل العبد وسعادتە، هو التخلق باخلاق الله تعالی، والتحملي بمعاني صفاتە وأسمائە)).**

**دیارە مەبەست قووڵبوونەوەیە لە واتای ناوە جوانەكانی خوداوەند (اسماء الله الحسنی) ( المقصد الاسنی في شرح اسماء الله الحسنی للغزال، ص23 و دواتر).**

**ئەگەر بە دوو مێژووی سۆفیزمدا بگەڕێین دەبینین دوو جۆرن:**

**1- شوێنكەوتووی شەریعەت.**

**2- شەریعەت ڕەتكەرەوە.**

**غەزالی جۆرێك لە هەمۆفیز ڕەتكردەوە كە توندڕەوبوون لە سۆفیزم ئەویش سۆفیزمی فەلسەفییە (معراج السالكین ص76).**

**هەندێ لە سۆفیكاران چەندان توخمی فەلسەفیان لە بۆچوونەكانیان حەشاردابوو جگە لە چەندان توخمی پڕوپووچ، و خورافات، و ڕێنە.. غەزالی لە هەوڵ لابردنی ئەم لایەنەدا بوو.**

**سۆفیزم لای غەزالی واتای دوڕو دیوی ناوەوەی مرۆڤ بووە، كە قووڵاییەكەی بێ كۆتاییە لە دەروونی مرۆڤدا.**

لەم سۆنگەیەوە، غەزالی دەستی بە شەرع گرت لە رێبازە سۆفیزمییەکەی، کەولە لەسەر بنچینەیی (على اساس الإلهام فى حالات من الغيبوبەو اللاشعور) واتە: سرووش لەباری ناوریایی و نەستگەریدا دامەزراوە (الخال، ابراهيم: الغزالي، مجلة الافلام، السنة الاول، ج(10) ص69).

بۆ کۆششی بەردەوام بۆ هێنانەدی نزیکی ل خوداوەند ی مەزن بە روانینەکی (العيان).

غەزالی پێی ولبوو (أبايزيد البسگامی) لە سۆفیزمدا رۆچووەو لە خواناسی پلەی بەرزەو بە نوری خوداوەند ئاشنایە. (منهاج العابدين. ص163).

غەزالی، شەفاعەت رەتدەکاتەوە، کە بەستامی بۆی چووبوو.

هەرچەندە (ابوطالب المكي)- لەو کەسانەیە کە غەزالی پشتی پێ بەستووەو لێی فێربووە، بەتایبەت کتێبەکەی (قوت القلوب) کە زۆر شتی لەبارەی سۆفیزم لێ فێربووە، بۆ ئەوە چووە کەوا شەفاعەت تایبەتمەندە بە پێغەمبەر (د.خ)ەو زاناو شەهیدان (المكي، ابوطالب: قوت القلوب، القاهرة 1933، 1212).

هۆکاری ئەم هەڵوێستەی غەزالی ئەوەیە، ئەدی لەبەرچی پێغەمبەر (د.خ) بە فاتمەی گوت: مەعسیەت مەکە (لما نهى الرسول (ص) فاطمة رض الله عنها عن المعصية) (احياء علوم الدين، مط، اتجارية، 3/ 203).

واتە: ئەم رووداوەی کردۆتە بەڵگە بۆ نادروستی و ناڕەوایی بوونی شەفاعەت.

غەزالی (الحلول والفناء والاتحاد) رەتدەکاتەوە، حلول- تێخزان، نموونە هەرە بەرچاوەکەی (الحلاج- لە (الطواسين، تحقيق ماسينيون، باريس

1913) لەبەرئەوەی یەکەم کەس بوو لە پراکتیکدا (حلول)ی ئاشکراکرد، کە ئەبوزەیدی بەستامیش هەمان بۆچوونی هەبوو لەبارەی (حلول) وەك حەلاج.

هەر لێرەدایە کەوا ئەم جۆرە سۆفیکارانەی بەخۆبەزلزان و لەخۆبایی ناو بردووە (1)

(1- الکشف واتبیین. ص197، احیاء علوم الدین 3/ 344 و دواتر).

لەبەرئەوەی گوایە (خوداوەند یان خۆشدەوێ پێش ناسینی- یدعون (حب الله قبل معرفته) (1)

(1- الکشف و التبیین، ص221).

هەر ئەم خۆشەویستییە وایکردووە ئەم جۆرە سۆفیکارانە لە شەریعەت لابدەن، بەڵکو گاڵتەی پێبکەن، هەندێ جار، کەچی غەزالی بە پێچەوانەی ئەم جۆرە سۆفیکارانە چەمکەکانی سۆفیزم لە بنجەکانی باوەڕی ئایینی نزیك دەخاتەوە.

بەمجۆرە هیچ ناکۆکی نەهێشت لە نێوان کاکڵی سۆفیزم و ئیسلام.

غەزالی کە دەڵێت، سۆفیکاران مافدارن، لە پەندیاری و حیکمەتدا لە پێشن و لە هۆش و ئاوەزدا بالأن (المنقذ ص55)، بەلأم رەخنەی لە بۆچوونەکانیان گرت کە لەگەڵ ئایین ناگونجێن. بەم جۆرە بانگەوازی بۆ سۆفیزمی رەوا دەدا، کە باوەڕی ئەوانەیە کە

((هم السالکون لطریق الله تعالی خاصة))، (واتە رێدانانی رێگاخوداوەند ن).

**بەم جۆرە سۆفیگەری بەستەوە بە ڕاڕەو ی یارانی سوونئەت، بەم جۆرە سۆفیگەری ڕەوای - شەرعی چەسپاند!**

کتێبەکانی غەزالی

**لە ژیاننامەی غەزالی زانیمان بە سێ قۆناخ تێپەڕیوە، قۆناخی یەکەم: تیایدا خوێندکار بوو، پێگەیشتنی هزری لەو ئاستەدا نەبوو بەرهەمی سەربەخۆی هەبێت.**

**قۆناخی دووەم: کەمێك درێژبوو، لەبەرئەوەی هەر لە مێردمنداڵییەوە دەستیپێکردووە، غەزالی گوتەنی: گومان هەر زوو دایگرت، نزیك تەمەنی مێردمنداڵی، ئەم قۆناخە لە ژیانی غەزالی درێژخایەن بوو. غەزالی لە (المنقذ من الضلال) دەڵێت، لەم ماوەیەدا سەبارەت (علم الكلام) نووسیویەتی و لەبارەی ڕەخنەگرتن لە فەلسەفە، و ڕەخنەگرتن لە ڕاڕەو ی فێرخوازی- باتینییەکان، لە بەغداش وانەی دەوتەوە لە زانستە شەرعییەکان.**

**سەبارەت بە کتێبی (تهافت) غەزالی نووسیویەتی لە (ل88- تهافت) (ونحن لم نلتزم في هذا الكتاب الا تكذيب مذهبهم.. وأما إثبات المذهب الحق فسنصنف فيه كتاباً بعدالفراغ من هذا، إن ساعد التوفيق إن شاء الله، نسميه ((قواعد العقائد)) ونعتنى فيه بالاثبات كما اعتنينا في هذا بالهدم). خوێنەری کتێبی تەهافوت، دەبینێت خاوەنەکەی هەوڵدەدات بنچینەکانی ئەم ڕاڕەوە بڕووخێنێت لە تەك ئەویشدا دیارە دەیەوێت لەسەر بنچینەیەکی دیکە بنیاتێکی هزریی دیکە ڕۆنبێت، غەزالی دەڵێت: لەم**

کتێبەدا پابەندنەبووین تەنیا بە بەدرۆزانینی راڕەو ەکەیان نەبێت..
بەڵام سەلماندنی راڕەو ی راست، کتێبێکی دیکەی بۆ تەرخان دەکەین، خوا یار بێت ناوی دەنێین (قواعد العقائد- رێساکانی باوەڕەکان) تیایدا گرنگی بە سەلماندن دەدەین وەك چۆ لێرەدا بایەخمان بە رووخاندنی داوە.
فەلسەفە لەو رۆژگاریدا نەسازو دژی زۆر راڕەو ی ئاخاوتنگەرایی بوو- مژهب کلامی- لەوانەش ئەو راڕەو ەی غەزالی باوەڕی پێ هەبوو کە دژی بۆچوونە فەلسەفییەکان بوو.
راڕەو  لای غەزالی دەگرێت سێ بەش.
یەکەم: راڕەو ێك مرۆ دەمارگری بۆ دەکات، لەبەرئەوەی راڕەو ی وڵاتەکەیەتی کە تیایدا ژیاوەو پەروەردە بووە، یا راڕەو ی خزم و خێزانی بووە، ئەو رۆژکاری راڕەو ی ئەشعەری یا موعتەزلی بووە..
دووەم: راڕەو ی شوێنکەوتووەکان، کە بەپێی رەوشەکەیان جیاوازن.
سێیەم: راڕەو ی کە مرۆڤ بەتایبەت باوەڕی پێ هەیە، لەسەر ئەم راڕەو ە روو لە خوداوەند  دەکات.
دیارە غەزالی بەدوای راستەقینەدا دەگەڕا، لە لەسەر ئەم راڕەو ەیدا روو لە خوداوەند  بکات و ماڵئاوایی لە دنیا بکات، دیارە لەم راڕەو ەدا راڕەو ی سێیەم- جێی راڕەو ی فەرمی دەبێتەوە- غەزالی لەوانەو دانراوەکانیدا وەك کتێبی (تهافت) راڕەو ە فەرمییەکەی دەنواند، وەك یارانی سوونەت تێی دەگەن خۆی ئەم ناوەی لەم جۆرە کتێبانەی نا ((راڕەو ی فەرمی- المذهب الرسمیی))

لەبەرئەوەی ڕاڕەو ی یارانی سوونەت (اهل السنه)، کە ڕاڕەو ی دەوڵەت بوو کە ئەو لە سێبەریا ژیا، ڕاڕەو ی ئەم خوێندنگەیانە بوو کە تیایاندا خوێندوویەتی، ڕاڕەو ی ئەم مامۆستایانە بوو کە پەروەردەیان دەکرد تا ماوەیەکی زۆری تەمەنی.

لە پێشەکی کتێبی ((لاقتصاد)) دەڵێت:

(الحمدالله لذى إجتبي من صفوة عباده عصابة الحق واهل السنة)

لە پێشەکی ((قواعد العقائد)) دەڵێت: (الفصل الاول في ترجمه عقيده أهل السنه))

لە پێشەکی کتێبی (( الرساله القدسيه)) دەڵێت:

(الحمدلله الذى ميز عصابة السنة بأنوار اليقين).

و لە نامەکەی بۆ ((ملك شاه)) ڕاڕەو ی یارانی سوونە دەنوێنێت.

سێیەم قۆناخ: قۆناخی سۆفیگەری بوو، ئەو قۆناخەی تیایدا کەوتە سەر تیۆری ڕۆشنبینی و دۆزیاری (کشف) سۆفیگەری غەزالی ئاگاداری ئەوەش داوە کەوا هەندێ نووسراوی هەیە تایبەت، بۆ هەمووان نییە، تیایدا پوختەی ڕاستی و زانینی ئاشکرای تێدایە.

لایەنێکی گرنگ لە کتێبەکانی غەزالی بەرچاو دەکەوێت پەیوەستە بە هەڵوێستی لە دەسەڵاتداران و خەڵك، دیارە لە ڕەوشی سەردەمەکەی بەدەر نییە، لە داخوازی پلەو پایەو خۆ نزیککردنەوە لە دەسەڵاتداران- دیارە پێشی قۆناخی سۆفیگەری- دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمی لەسەر ڕاڕەو ی سوونی بوون، دیارە زۆربەی دانراوەکانی غەزالی پشگیری باوەڕی یارانی سوونە دەکات و بەرگریان لێدەکات.

دەسەڵاتداران و یارانی سووننە بەگشتی ئەوکاتی دژی موعتەزیلەو فاتیمی فەیلەسوفان بوون، بەڵام کەسیان نەدەدۆزیەوە بەتایبەتی دژی فەیلەسوفان بدوێت یا بەلای ئەم بەرگریان لێبکات، دیارە غەزالی ئەم بوارەی بەهەل زانی ئەسپی خۆی تێدا تاوبدات هێرشی کردە سەر فەیلەسوفان، هەر ئەوەش وایکرد ناوبانگی جیهانی ئیسلامی دابگرێت.
لەو سەردەمیدا (نزیکەی حەفتاو دوو فیرقە) کە لە ئارادابوون هەریەکە ئەوەی دیکەی بەلادان لە دین تاوانبار دەکردو بەکافرو زندیق ناوی دەبرد، غەزالی هەستی بەگیانی سەردەم کرد، زۆر لەوە پارێزی دەکرد، بۆ نموونە: لە نووسراوەکانی لەبارەی لۆجیك= ژیربێژی، نموونەکانی ژیربێژان- المناگقە، نموونەی فیقیهی دەهێنایەوە بۆ ئەوەی ژیربێژی بە تارایەکی ئایینی داپۆشێ، ئەم کەلێنەی نێوان پیاوانی ئایین و لۆجیك کەمبکاتەوە.
بەڵکو غەزالی ژیربێژی زۆر پەسندکرد تا ئەو رادەی بەزانستێکی ئیسلامی دانا، لەمبارەیەوە لە (مقاسد الفلاسفه)دا لەلاپەڕە (3)دا دەڵێت:
(وأما المنطقيات فأ كثرها على منهج الصواب، والخطأ فيها نادر، وإنما يخالفون اهل الحق فيها بالاصطلاحات والايرادات دون المعاني و المقاصد).
واتە باسە ژیربێژییەکان زۆربەیان رێبازێکی دروستن، هەڵەی دەگمەنە، بەڵام لە زاراوەو بەڵگە هێنانەوە جیاوازن لە یارانی حەق نەك لە واتاو مەبەست.
یان لە (تهافت)دا لاپەڕە (240) دەڵێت:

(ولكن المنطق ليس مخصوصاً بهم- يعني الفلاسفة- وانما هو الاصل الذي نسمية في فن ((الكلام)) ((كتاب النظر))، فغيروا عبارتة تهويلاً، وقد نسمية كتاب الجدل، وقد نسمية مدارك العقول. فاذا اسمع المتكايس والمستضعف اسم المنطق، ظن انة فن غريب لا يعرفة المتكلمون ولا يطلع علية الا الفلاسفة).

دیسان پەسندی لۆجیك دەكات و نزیكی دەكاتەوە لە هزرتی ئیسلامی و دەڵێ: دەشێ ناوبنێین- بەزاراوەی ئیسلامی- بە كتێبی روانین- یا كتێبی جەدەل= بێژیاری، یا كتێبی (مدارك العقول= پێزانینی هۆش)، گلەیی لەوانە دەكات كە گوێبیستی زاراوەكانی لۆجیك دەبن بە هونەرێكی نامۆیی فەیلەسوف انی دەزانن، بەڵكو ئەوەندە ژیربێژی پەسندكردبوو لۆجیكی گێڕایەوە بۆ قورئانی پیرۆزو پێغەمبەران و كتێبە ئاسمانییەكان وەك لە كتێبی (القسطاس المستقيم) سەبارەت بەم بۆچوونە دواوە. وەك لە لاپەڕە (45)یدا دەڵێت:

( قال- يعني مناظره من اهل التعليم- هذه الاسامى أنت ابتدعتها، وهذه الموازين انت القردت باستخراجها؟!

قلت: أما هذه الاساسي فاني ابتدعتها، واما الموازين فانا استخرجتها من القران. ومان عندي أنى سبقت إلى استخراجها من القران، لكن اصل الموازين قد سبقت الي استخراجها، ولها عند مستخرجها من المتأخرين أسماء اخري سوي ماذكرتة، وعند بعض الامم السابقة علي بعثة محمد و عيسي عليهما الصلاة واسلام. وقد بعثني علي استبدال أسمائها بأسام اخرى غير ماسموها به، ما عرفت من ضعف قريحتك، وطاعة نفسك الى الاوهام، فإنى رأيتك

من الاغترار بالظاهر بحيث لوسقيت عسلاً في قارورة حجام لم تطق تناولة، لنفور طبعك من المحجمة وصعف عقلك عن أن يعرفك أن العسل طاهر في اي زجاجة كان. وكذلك لاتنظر الي القول من نفسي القول و ذاته، بل من حسن صنعتة، او حسن ظنك بقائله.

فإذا كانت عبارتة مشكرهة عندك، او قائلةو قبيح الحال في اعتقادك، ردد القول، وان كان في نفسة حسناو حقاً.

فلو قيل لك: كل لااله الا الله عيس رسول الله، نفرعن ذلك طبعك، وقلت: هذا هو قول النصاري، فكيف اقولة!! ولم يكن لك من العقل ما تعرف به أن هذا القول في نفسه حق، وان النصراني ما مقت لهذه الكلمة، ولالسائر الكلمات بل لكلمتين فقط: احداهما: الله ثالث ثلاثة، والثانية. قوله محمد رسول الله، وسائر اقواله وراء ذلك حق)

بەمشێوەیە گیانی سەردەمی خۆی و وێنا دەکات، وەستاوی و دەمارگری (عصبیە) بۆ گرووپ و لایەنێك لە دژی لایەنەکانی دیکە، ئەو گرووپەی دەمارگری بۆ دەکەن، هەموو شتێکی لێ وەردەگرن راست و هەڵە، ئەو گرووپەی دژی دەوەستن، هەموو شتێکی رەتدەکەنەوە راست و ناڕاست.

ئاو تەرادەی گەر هەنگوین لە شوشە ی کەڵەشاخ کردن= الحجامە بدەی بەم دەمارگرانە نایانەوێت، رواڵەت خوازی، کەچی هەنگوین پاك و بێگەردە لە هەر شوشە یەك پێشکەشی بکرێت، بەهەمانشێوە ئاخاوتن و را وەرناگرن تەنیا لەو شێوازو قاڵبە نەبێت کە ئەوان دەمارگری بۆ دەکەن.

یا گەر پێیان بڵێیت، بڵێ: شایەتمانی دەدەم عیسی پێغەمبەر (د.خ)ی خودایە، دەسڵەمنەوە، چۆن وا بڵێم ئەوە قسەی کریستیانانە! وایە بەڵام خۆی لە خۆیدا ئەم ئاخاوتنە راستە، کریستیانی لەبەر ئەمە نییە، جیاوازە، بەڵکو لەبەر دوو وشەی دیکەیە: یەك: خوداوەند یەکێکە لە سێیان، دوو: محەمەد پێغەمبەر (د.خ)ی خوداوەند نییە، لەولای ئەم دوو قسانە، ئەوانەی دیکەیان شتی دین.

غەزالی لەوەدا نەرمی دەنوێنێ هەتا لە کتێبی ژیربێژیدا، ناو و زاراوەکان دەگۆڕێ هاوشێوەیان بە زاراوەی ئایینی بۆ دادەنێت تا وەربگیرێن، بەڵکو لەگەڵ قورئاندا ئاشنایان دەکات، واتاکانی مەنتیق لە ئاستەکانی قورئانی پیرۆزدەدۆزێتەوە. ناوی دیکە دادەنێت بۆ زاراوەو باسە ژیربێژییەکان. هەموو ئەم کارانە بۆ رۆیشتنە لەگەڵ رۆژگاری خۆی.

ئاو ئەو رادەی کە رەخنەگرێك لە بارەی کتێبی (الاحیاء) شتێکی وتبوو زۆر نیگەران بوو، هەڵچوو خرۆشا، بەهۆی رەچاوکردنی رای خەڵك و پشگیری خەڵك.

بەگشتی کتێب و نووسینەکانی غەزالی ئەم تەوەرانەی لەخۆ گرتووە:

1- ئاخاوتنزانی= علم الكلام.

2- فەلسەفە. رەخنەی زۆری لەمە نووسیوە.

3- راڕەو یارانی فێرخوازی- باتینیەکان، رەخنەی زۆری لەمەڕ نووسیون.

4- سۆفیگەری یا فەلسەفەی گیان، زۆری لەمەڕ پشگیری و لایەنگری ئەم راڕەو ە نووسیوە.

**کتێبی (میزان العمل)، غەزالی لە سەرەتایدا دەنووسێت کەوا لەسەر شێوازی کتێبێکی دیکەی خۆی نووسیویەتی بەناوی (معیار العلم)، دیارە ئەم کتێبە پێشی (میزان العمل) نووسراوەو لە تەك دانانی کتێبی (تهافت) ئەم کتێبەش لە ژێربێژی (المنطق) داناوە بەناوی (میزان العمل).**

**کتێبی تەهافوت (تهافت) کەی نووسراوە، غەزالی لە (المنقذ)دا دەڵێتە ئەم کتێبەی لە بەغدا بۆ رەتدانەوەی فەیلەسوفە هۆشپەسندەکان داناوە.**

**کەواتە کتێبی (میزان العمل) ئەویش لە بەغدا نووسراوە.**

**کتێبی (میزان العمل) راڤەو پشگیری راڕەو ی سۆفیگەرییە، کەواتە لە دواییەکانی ژیانی دایناوە. دوای ئەوەی کەوتە سەر باوەڕو تیۆری رۆشنبینی سۆفیگەری (الکشف الصوفی)خ و دوای ئەوەی رازی بوو بە رێبازیان لە گەڕان بەدوای راستی، هەوڵی پشگیری و بڵاوکردنەوەی دا بەکتێبی جیاجیاو وانەی فرەجۆر.**

**هەرچەندە تیۆری رۆشنبینی سۆفیگەری، وا دەخوازێت، لە ئاستی بەرزدا بن و ئاگاداری (اللوح المحفوظ) بن، بەگیانی پێغەمبەران ئاشنا بن، لەگەڵ مەلائیکەتان بدوێن، مەسەلەکانی ئەودیو سروشت بە رۆشنبینی سۆفیگەریانە چارەسەر دەکات.**

**غەزالی هۆشی لەبیر نەکرد، زۆرجاران تێکەڵی کتێبەکانی دەکاتەوە وەك کتێبی (معارج القدس) و کتێبی (المقصد الاسنی).**

**غەزالی باس لە مەسەلەی گرنگ دەکات وەك: تێخزان و یەکبوون (الحلول والانحاد) لە سۆفیگەری و لە فەلسەفەدا، لە (لاپەڕە 32 لە ((المنقذ)) دەڵێت: (علی الجملة ینتهی الامر الی قرب- یعنی بین الواصل و بین الله-**

يكاد يتخيل معه طائفة الحلول، و طائيفة الاتحاد، وطائفة الوصول، وكل ذلك خطأ، وقد بيناو جة الخطأ فيه في كتاب (المقصد الاسنى) ).

دیاره ئاماژه به کتێبی (المقصد الاسنى) دەکات کە باس لەو مەسەلە فەلسەفی و سۆفیگەریە گرنگانە دەکات. غەزالی لەم کتێبەدا (امقصد الاسنى) (ص73) لەبارەی یەکبوون (الاتحاد) دەڵێت:

(ان قول القائل، انشيئاً صار شيئاً آخر، محال علي و جة الاطلاق، بالأنا نقول: اذا عقل زيد وحده، وعمرو وحده، ثم قبل، ان زيداً صار عمراً، واتحربة، فلا يخلو- اي الحال- عند الاتحاد:

إما ان يكون كلاهما موجودين

او كلاهما معدو مين

او زيد موجوداً، وعمر معدوماً

أو بالعكس

ولايمكن قسم وراء هذه الاربعة.

فإن كانا موجودين، فلم يصر أحدهما عين الآخر، بل عين كل واحد منهما موجود.

وان كانا معدومين، فما اتحدا، بل عدما، ولعل الحادث شيئ ثالث.

وان كان احدهما معدوماً، والآخر موجودً، فلا اتحاد، اذ لا يتحد موجود بمعدوم.

فالاتحاد بين الشيئين مطلقاً محال).

ئەم توێژینەوەی سەرەوە پرۆسەیەکی هۆشەکی پوختنە، پەنابردنە بەر هۆش و لۆجیك (ژیربێژی) پوخت، هەرچەندە لە (المنقذ) دەڵێت، بەوەی زانیوە لە ڕێگەی رۆشنبینی (الکشف).

لەبارەی یەکبوون دەڵێ:

رەوشی یەکبوون لەم شێوازانە بەدەر نییە:

یا هەردوویان هەن.

یا هەردوویان نین.

یا زەید هەیە، عەمر نییە.

یا بە پێچەوانە

لە پشت ئەم چوار رەوشە هیچی دیکە نییە، کەواتە یەکبوونی رەها کردەنی نییەو موستەحیلە.

هەر لە هەمان کتێب لە لاپەڕە (75) لەبارەی تێخزان (الحلول) شتێکی ئاوا دەنووسێت:

هەرچەندە هەر خۆی وتوویەتی خۆش لە مەسەلەکانی ئەودیو سروشت جێی نابێتەوە، جگە لە سەلماندنی خودی نێرەر، لەگەڵ روانینە بەڵگەی موعجیزەکە، لەودیو ئەم ئاستەش هۆش لەو بوارە بەتەواوی دابڕاوە.

غەزالی ئاگای لەم لایەنەش هەیە، بۆیە هەر لە هەمان کتێب دەڵێت: (ان العقل لا يصطدم مع الكشف في شيئ، غاية ما هنالك، ان العقل لضعفة وقصوره، يعجز أصياناً عن ان يبدي الرأى في مسألة ما، فيسعفة الوحي او الالهام بتبيانها فتارة يدرك العقل و جة الحكمة فيها، وهنا يسشطيع أن يشد من أزر الوجي والالهام، بما يمكنة من فنون الادلة الفكرية، وضروب

المحاولات العقلية، وتارة لايدرك وجة الحكمة، فيقف صامتاً لا يملك المساعدة، وليس معني هذا، القول باستحالة المسألة عندة، ففرق كبير بين ما يعجز العقل عن ادراكه، وبين ما يدرك و جه استحالته).

واتە عەقل، بەرای غەزالی بەهۆی بێهێزی و کەموکورتی عەقل، هەندێجار ناتوانێ رادەربڕێت لەبارەی مەسەلەیەك، وەحی و ئیلهام= سرووش و پێدان وەڵامەکە دەداتەوە، گەر هۆش= عقل توانی رووی دروستی و لەباری وەڵامەکە بزانێ ئەوا پشتگیری دەکات گەر نا، بێدەنگ دەمێنێ و ناتوانێ یاریدەدەر بێت.

غەزالی وێنای ئەوەی نەکرد کە هۆش دەتوانێت رەخنەگر بێت گەر لەگەڵ بنەماو بنچینە هۆشەکی و هۆشپەسندییەکان نەگونجا.

واتە غەزالی هۆش دەخاتە دەرباری خزمەتکردنی رۆشنبینی و ئیلهام و راڤەکاری ئەو.

هەر ئەم تیۆرییە وایکردووە؟ هەندێ لە کتێبەکانی غەزالی وەك- معارج القدسی- تیایدا هۆش پشگیری ئەو بۆچوونانە دەکات کە غەزالی نووسیویەتی لە دوا رۆژەکانی ژیان دوای ئەوەی بە تیۆری رۆشنبینی سۆفیگەری زانی- نظرية الكشف الصوطية. غەزالی لە برِی ئەوەی بلێ ئەم رۆشناییەم پێدراوە یا ئەمەم بینی یا روانیمە ئەمە، هاتووە مەسەلەو تیۆرییەکانی بە لۆجیکی هۆشەکی دەورەداوە، وەك ئەوەی بەرهەمی هۆش بن.

کەواتە هەڵوێستی هۆش لەم مەسەلانە، هەڵوێستی داهێنەرو دروستکار نییە، بەڵکو یاریدەدەرە رۆڵی سەرەکی رۆشنبینی و روانین بینیویەتی.

واتە غەزالی هۆش دەکاتە راڤەکاری رۆشنبینی و ئیلهامەکانی، دەشێ هەر لەبەر ئەم هۆیەشە غەزالی ژیربێژی (لۆجیك) (المنطق) بە پێویست دەزانێت بۆ زانین، هەتا بۆ پێغەمبەر (د.خ)و پێشەوا (وەلی).

هەندێ تایبەتمەندی کتێبەکانی:

1- دووبارەکردنەوە:

نموونەیا، دەقێکی کاریگەری، زۆرجاران لە کتێبەکانی وەك خۆی دووبارەدەبنەوە، یەکسەر خوێنەر دەزانێ ئەم کتێبە ئی غەزالییە، لە رێگەی ئەم دووبارەکردنەوانەش:

بۆ نموونە کە دەڵێت: (وکم احمق یتکایس، فیقایس نفسه بصاحب الشرع، مقایسة الملائكة بالحدادین، فیهلك من حیث لایدری)).

ئەم دەربڕینە لە زۆر جێ لە کتێبی (احیاء)دا هاتووە، لە کتێبی (معارج القدس) لاپەڕە (95)دا هاتووە، هەروەها لە کتێبی (میزان العمل) لە لاپەڕە (89)دا.

هەندێجار بەشێك بە تەواوی بەناونیشانەوە دووبارە دەبنەوە:

لە کتێبی (احیاو) بەشێك هەیە بۆ (لبیان معنی النفسی، والروح و القلب، والعقل) هەمان شت لە (معارج القدسی)دا هەیە.

یا بەش (لبیان امثلة القلب مع الباطنیه) لە (احیاء) و لە (معارج القدس)دا هاتووە. بەهەمانشێوە بەش (معنی رویه الله) لە کتێبی (الاقتصاد فی الاعتقاد) هەر خۆی لە ((معارج القدسی)دا هاتووە.

بەهەمانشێوە ئەو بەشەی لە(احیاء) باسی دڵ سەرەڕای زانستەکان، تیایدا باس لە ئەو تارایەی لە پێنج شت پێکهاتووە دەکات، کە ناوبڕن لەنێوان ئاوێنەی دڵ و لەوحی مەحفوز، هەمان شت لە (معارج القدس)دا هاتووە. هەندێجار کتێبی وەك یەك دادەنێت، کتێبی (الاربعین فی اصول الدین) وەك: (احیاء) داندراوە هەتا لە بەش و ناوی بەشەکانیشی تەنیا ئەوەنێت لە کورتکردنەوە یا درێژەپێدان جیاوازن.

2- هێنانەوەی نموونەی ئایینی: هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی هەموو بابەتەکان، هەتا فەلسەفییەکانیش بۆ بنجێکی ئایینی ،خوێنەر وادەزانێت بابەتێکی ئایینییە. بۆ نموونە، تیۆرییەکەی ئەفلاتوون لە دابەشکردنی دەروون بۆ سێ هێز، و چاکەو خراپە گێڕانەوە بۆیان، لای غەزالی زۆر ئاسانە ئەم تیۆرییە لە ئایەتی قورئانی پیرۆز هەڵێنجێت:

(انما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله، ثم لم يرتابوا، وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله، اولئك هم الصادقون).

غەزالی لە (احیاء)دا لە لاپەڕە (100) بەشی (8) دەڵێت:

(فالايمان بالله و برسوله من غير ارتياب، هو قوة اليقين، وهو ثمرة العقل و منتهى الحكمة، والمجاهدة بالمال هو السنحاء، الذى يرجع الى ضبط قوة الشهوة والمجاهدة بالنفسى هى الشجاعة التى ترجع الي استعمال قوة الغضب على شرط العقل).

واتە ئیمانی هێزو توانایە، بەرهەمی هۆش و پەندیارییە (حکمە)، ماڵ بەختکردن بەخشندەییە، واتە کۆنترۆڵی هێزی چێژکراوە، خۆبەختکردن ئازایەتییە بەشێوەیەکی هۆشپەسندانە).

هەتا تیۆری ناوەندگری (الوسط)؛ ئەم تیۆرییەش بە ئاسانی دەگێڕێتەوە بۆ ئایەت و فەرموودەکان ئەوەتا لە (احیاء) لاپەڕە (4) بەشی (8)دا هاتووە:

(والذي يدل علي ان المطلوب هو الوسط في الاخلاق دون الطرفين، أن اسنحاء خلق محمود شرعاً، وهو وسط بين طرفي التقتير والتبذير، وقد اثني اللة تعالي علية فقال:

(والذين اذا أنفقوا لم يسرفوا، ولم يقتروا، وكان بين ذلك قواماً، وقال تعالي: (ولا تجعل يدك مغلولة الي عنقك، ولا تبسطها كل البسط). وكذلك المطلوب في شهوة الطعام الاعتدال، دون الشرةو الجمود، قال تعالي:

(وكلوا، واشربوا، ولا تسرفوا، انه لا يحب المسرفين)، وقال في الغضب: (اشداء علي الكفار، رحماء بينهم(( وقال صلى الله عليه وسلم: (خير الامور او سطها). وهذا له سر وتحقيق، وهو ان اسعادة منوطة بسلامة القلب، عن عوارض هذا العالم. قال تعالى: (الامن اتى الله بقلب سليم))، وابتحل من عوارض الدين، والتبذير أيضاً من عوارض الدنيا، وشرط القلب أن يكون سليماً منهما، اى لايكون ملتفتاً الى المال، ولا يكون حريصاً على إنفاقة، ولا علي امساكة، فان الحريص علي الانفاق مصروف القلب الي الانفاق، كما ان الحريص علي الامساك، مصروف القلب الي الامساك، فكان كماي القلب ان يصفو عن الوصقين جميعاً.

واذ لم يمكن ذلك في الدنيا، طلبنا ما هو الاشبة بعدم الوصفين، وابعد عن الطرفين، وهو الوسط، فإن الفاتر لا حارو لا بارد، بل هو وسط بينهما،

فكأنة خال من الوصفين، فكذلك السنحاء بين التبذير والتقتير، والشجالة بين الجبن والتهور، والصفة بين الشره والجمود، وكذلك سائر الاخلاق).
لە بواری ئاكارو رەوشتدا غەزالی پشت بەم تیۆرییە دەبەستێت و ئایەت و فەرموودەی بۆ دێنێتەوە كەوا باشترین ئاكار ئەوەیە ناوەندگر بێت، نە توندڕەو نە سست، لەنێو هەردوویان میانەڕەو بێت، نە توندگر (قرچۆك، رەزیل) و نە دەست بڵاو، بەڵكو ناوەندگر بێت بەخشندە (نحی) بێت.
نە زۆرخۆر بێت و نەهیچ نەخۆر، ناوەندگربێت، پێویست خۆر بێت، نە ترسنۆك بێت و نەسەرەڕۆ، بەڵكو ناوەندگربێت واتە ئازابێت، نە چڵێس بێت و نە رەقەكار، خۆگر بێت..هتد دوای لە هەڵوێستە ئاكاری و رەفتارییەكان.
3- ئاماژەدان بە كتێبەكانی: لە زۆر لە كتێبەكانیدا ئاماژە بە كتێبەكانی رابردووی دەدات و بەبابەت و مژارەكان واتە هەموو كتێبەكانی لەبارچاوە كە هەر بابەتێك دەنووسێت.
4- شێوازی نووسین: غەزالی بەهۆی ئەوەی هەمیشە لە گەڕان و ئەم شارو ئەو شار كردن بوو، ناجێگیربوو دانراوەكانی لەم رووەوە رەخنەیان لێگیراوە، بەڵام وەك د. زكی مبارك لە كتێبەكەی ((الاخلاق عند الغزالی)) ل (121)دا دەڵێت: ئەم پیاوە بەهانەدار، لەبەرئەوەی لەبارودۆخێكدا دەسنووسی بۆ نووسین نەدەشیا، لەبەرئەوەی نووسین وەك دادوەری پێویستی بە: تەندروستی و هێمنی و ئاسوودەیی هەیە).
غەزالی لە كتێبەكانیدا كە بۆ خەڵكی دەنووسی رەچاوی باری دەروونی و هۆشەكی خەڵكی دەكرد، خەڵك لە دیدی غەزالیدا جیاوازن لە ئامادەگی

بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن لەبەرئەوە لە کتێبی (معراج السالکین) (ص95)دا دەڵێت:

(قال الله تعالى: (ادع الي سبيل ربك، بالحكمة، والموعظة الحسنة، وجاد لهم بالتى هى أحسن)) فعلم ان الموعو اله الله تعالى بالحكمة قوم، وبالموعظة قوم، وبا لمجادلة قوم، فإن الحكمة ان غذي بها اهل الموعظة، أضرت بهم، كما تضر بالطفل الرضيع، التغذية بلحم الطير.

وان المجادلة ان استعملت الحكمة، اشمازوا منها، كما يشمئز طبع الرجل القوي، من الارتضاع بلبن الآدمي. وان من استعمل الجدال مع اهل الجدال، لا بالطريق الاحسن، كما تعلم من القران، كان كمن غذي البدوي، بخبز البر، وهو لم يألف الا التمر، او البلدي بالتمر، وهو لم يألف الا البر).

واتە غەزالی لەبەر رۆشنایی ئایەتی قورئانی پیرۆزدا خەڵك دەکاتە سێ جۆر ئەوانەی شایانی پەند دادانن (الحكمه) و ئەوانەی شایانی ئامۆژگاریکردنن بە چاکە، و ئەوانەی شایانی گەنگەشە لەگەڵ کردنن بە باشتر لەوەی ئەوان.

دیارە ئەوەی شایانی پەنددادانە وەك ئەو منداڵە شیرە خۆرە وایە کە گۆشت پێدانی زیانی پێدەگەیەنێت و ئەوەی شایانی ئامۆژگاری کردنە ئاستێکی دیکە لە ئاخاوتنی دەوێت.. هتد.

غەزالی لە کتێبی (القسطاس المستقیم) لاپەڕە (86) دەڵێت: (الناس ثلاثة اصناف)

(أ) اعوام، وهم اهل السلامة البله، وهم اهل الجنة،

(ب) خواص، وهم اهل الذكاء والبصيرة.

(جـ) ويتولد بينهم طائفة، هم اهل الجدل والشغب، فيتبعون ماتشابة من الكتاب البتغاء الفتنة.
اما الخواص فإني أحالجهم بأن أعلمهم الميزان القسط، وكيفية الوزن بة، فيرتفع الخلاف علي قرب، وهؤلاء قوم اجتمع فيهم ثلاث خصال.
احداهما: القريحة النافذة، والفطنة القوية، وهذه عطية فطرية وغريزة جبلية، لايمكن كسبها.
والثانية: خلو باطنهم عن تقليد، وتعصي لمذهب موروث مسموع، فان المقلد لا يصفي، وابليد وان أصغي فلا يفهم.
والثالثة: ان يعتقد في اني من اهل البصيرة بالميزان، ومن لم يومن بأنك تعرف الحساب، لايمكن ان يتعلم منك)).
ئەمەیە ئەو مەرجانەی غەزالی بە باشیان دەزانێت بۆ گفتوگۆکو بانگەوازو گەنگەشە، هەر چەشنەی بەپێی ئاستی خۆی لەگەڵی بدوێی و زانیاری پێبدەی.
خەڵکی ئاسایی (عوام) گشتی، ئەوانەی بەهەشتین، تەنیا بە ئامۆژگاری ئاڕاستە دەکرێت. دووەم: تایبەتەکانی خاوەن زیرەکی و را ئەوانە بە پەندیاری ئاڕاستە دەکرێن. سێهەم: ئەوانەی خاوەن گەنگەشەو لێکدانەوەو ژیربێژین. ئەوانەش بە مجادلە بەشێوازی باشتر لە شێوازی ئەوان دەئاخێورێت.
سەبارەت بەم جۆرە کەسانە یارانی گەنگەشە (اهل الجدل) لە لاپەڕە (94)ی هەمان کتێبدا دەڵێن: (وأما الصنف الثالث: وهم اهل الجدل، فإني

أدعوهم بالتلطف الي الحق.. واجادل بالتى هي احسن و كذلك امر الله و رسوله صلى عليه وسلم.

ومعنى المجادلة بالا حسن، ان آخذ الا صعرل التى يسلمها الجدلي، واستنتج منها الحق بالميزان المحقق، على الوجة الذي أوردته في كتاب ((الاقتصاد في الاعتقاد)).

والى ذلك الحد. أي اقف) لێرەدا دیارە بایەخ و گرنگی کتێبی (الاقتصاد فى الاعتقاد) لای غەزالی و زانیاری کە تیایدایە گرنگە، بەرزترین کتێبی علمی کەلامە لای ئەو.

(فإن لم يقنعة ذلك، لتشوقه بفطنته الي مزيد من كشف، رقيتة الي تعليم الميزان) واتە بەفێرکردنی پێوانە= الميزان بەرزتر دەبێتەوەو دێتە ریز خاوەنی پەندیاری (المحكمه)، واتە غەزالی بەپێی ئاست و تێگەیشتنی ئەو کەسە زانیاری پێدەبەخشێ، زۆرجاران لە کتێبەکانیدا ئەم فەرموودەیە دێنێتەوە:

((خاطبوا الناس علي قدر عقو لهم، أتريدون ان يكذب الله و رسوله))
بەپێی ئاستی هۆش خەڵك بدوێن، ئایا دەتانەوێ خودا و پێغەمبەر (د.خ) بەدرۆ بخرێنەوە.

وەك ئەو پزیشکەی نەخۆش گەلێکی دێنە لای، کە بەرێیان دەکات، هەریەکە جۆرەدەرمانو چارەسەرییەکی بۆ داناوە ، جیاوازە لەوەی دیکەی بەپێی جۆری نەخۆشییەکەی نابێت بڵێی هەموویان نەخۆشن کەواتە دەبێ هەمان جۆرە دەرمانیان بدەیتێ؟!

غەزالی لەمبارەیەوە لەلاپەڕە (60)ی القسطاس المستقيم):

**(فلما رأيتك و رأيت رفقاء من اهل المتعليم، ضعفاء العقول نزلت الي حدك، فسقيتك الدواء في كوز الماء، وسقتك بة الى الشفا، وتلطفت بك تلطف الطبيب بمريضه، ولو ذكرت لك انه دواء، و عرضته في قدح الدواء، لكان يشمئز عن قبوله طبعك، ولاتكاد تسيغه.**

**فهذ غرضي في ابدال تلك الاسامي (واتە زاراوە لۆجیکییەکانی خۆی گۆڕیوە بۆ زاراوەی دیکەی بەر تێگەیشتن وەك ((مميزات العدل)) و ((ميزان التلازم، ومميزات التعاند)) (لاپەڕە 27) .**

**بەمشێوازە غەزالی کتێبەکانی نووسیوەتەوەو کولتوورێکی گەورەی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی جێهێشتووە.**



دووەم چرای جیهانی سۆفیگەری

بن عەرەبی

باسی دووەم:

## ژیاننامەی بن عەرەبی

**بەشی یەکەم:ناساندن:**

**ناوی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی حاتەمی تائییە,بە بن عەرەبی بەناوبانگە. لەسۆفییەئەدیب و فەیلەسوف ەمەزنەکانە.**

**لەدایک بوون:**

**لە شەوی دوشە می (17)ی مانگی رەمەزانی ساڵی 558ی کۆچی بەرانبەر 1164ی زایینی لەشاری (مورسییە)ی ئیسپانی لەدایک بووە. مورسییە, بەئیسپانی(Murcia) پایتەختی ناوچەی مورسییەیە لەخوارووی رۆژهەلاتی ئیسپانیا لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست. ئەم شارە لەساڵی 825ی زایینی لەلایەن (عەبدولرەحمانی داخل) دروستکراوە. لەدیمەشق لەساڵی 638ی کۆچی, بەرامبەر 1240ی زایینی کۆچی دوایی کردووە و لەچیای قاسیون نێژراوە.**

**ژیاننامە:**

**محێدین بن عەرەبی شێخی گەورە, لەخانەوادەیەکی دەوڵەمەندو خاوەن پلەوپایەی سیاسی لەدایک بوو, هاوکات گیانی ئایینی و سۆفیگەری باوبوو, لەهەشت ساڵی (568ی کۆچی) چوون بۆ ئیشبیلییە, دوای ئەوەی مورسیە کەوتە دەست موەحیدەکان , کەوا بنەماڵەی محێدین نەیاری ئەوان بووە. لەم قۆناغەدا باوکی ناردییە بەر خوێندن, لەسەر دەستی**

گەورە زانایانی ئیشبیلییە ((Sevilla) هەموو زانستەکانی خوێند ,
عەرەب ساڵی 712ك دەستیانبەسەردا گرت, فردیناندی سێیەم لە
1248ز دەستی بەسەر داگرتەوە .
هەر زوو رووی لەرامان و گیانگەرایی کرد لەوکاتیدا باوکی کۆچی دوایی
کرد, یەکجاری رووی کردە سۆفیگەری(   ), باوك و باپیرانی لەو
ناوچانە ژیاون کەپێیان دەوتن (کور) ولەنێو گرووپە
سۆفیگەریەکاندا.لەوکاتەی بەنو عەباس (عەباسییەکان) هاتنە سەر
تەخت و بوون بە فەرمانڕەوای دەوڵەتی ئیسلامی , سۆفیەکان لەهەموو
ولأتاندا بلأوبوون, ئەندەلوس ئەوکاتی ,پایتەختەکەی قورتبە بوو ,
سەرەبە میری ئەفەریقا بوو. دەوڵەتی
(مولەسەمین=الملثمین=رووپۆشدارەکان) فەرماندار بوون, یوسف کوڕی
تاشفین فەرماندار بوو.
باتینیەکان لەمەغریبدا:
باتینییەکان لەزۆر ولأتاندا بلأو بوو بوونەوە , بەتایبەتی ئەوانەی لەژێر
دەستەلأتی سەلجووقییەکان دەستەلأتیان بەسەر ولأتی رۆم(ئەرمینیاو
ئەنادۆڵ رادەگەیشت, لەقونیێ دوڵەتێکی گەورەی سەلجوقی
دامەزرا,لەوکاتیدا سوڵتان قلیج ئەرسلان داود بن قتلمش (485-500)
فەرمانڕەوا بوو.سوریاشی گرتەوە, سوڵتانەکەی رەزوان بن تشی کوڕی
ئەلب ئەرسەلان بوو, لەمیسر فاتیمییەکان فەرمانڕەوا بوون.

---

[152] -اية الله السيد محمد الحسيني الشيرازي, فلسفة التاريخ , مؤسسة الوعي الاسلامي, دار العلوم للتحقيق والطباعة والتوزيع , بيروت, لبنان, ط1, 2003م,ص255-263.

لەوماوەیەدا شەڕی خاچپارێزان دەستی پێکرد 490ی کۆچی تا 690ی کۆچی خایاند. لەم بارۆخەدا محێدین بن عەرەبی ژیا.

گەنگەشەو گفتوگۆو دانوستانی لەگەڵ گرووپە جیاجیاکان و راڕەوە و تایفە جیاجیاکان هەبوو.

-ناکۆك بوو لەگەڵ (گۆشەگیران –المعتزلە)

-ناکۆك بوو لەگەڵ  فەیلەسوفان .

-ناکۆك بوو لەگەڵ فیقهزانان.

-ناکۆك بوو لەگەڵ خوانەناسان.

-ناکۆك بوو لەگەڵ بەرنامەی هەستخوازیی فیقهزانان کەپشت بەرواڵەتی دەق دەبەستن , واتای پشت دەقەکە فەرامۆش دەکەن.

-ناکۆك بوو لەگەڵ بەرنامەی هۆشگەری لای  فەیلەسوف    و ئاخێوەرەکان (موتکەلیمەکان), کەرێبازی لێکدانەوەی دەقە بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لەگەڵ بەڵگەی هۆشەکی.

ناکۆك بوو لەگەڵ دەستەلأت (جگەلە پەیوەندییەکەی لەگەڵ (مەلیك ظاهر) کە خوازیار (مرید) یێکی وی بوو, ناکۆك بوو لەگەڵ سوڵتانی موەحیدان (یەعقوب مەنسور) لەمەغریب , بەرگری لە پیری خۆی(ئەبی مەدین) کرد کەسوڵتان ئازاری دەدا. کەگەیشتە مەکە هەندێ بەناو فیقهزان پلانیان بۆدانا بۆ کوشتنی, داوای لەسێدارەدانیان کرد.

بۆماوەیەك گیرا, دواتر برادەرەکەی شێخ (ئەبو حەسەن بجائی) هاتە قسەو هەندێ لەم راوبۆچوونانەی خستە روو بۆ (الملك العادل) و ئەویش رەهای کرد,(الملك العادل) برای سەلاحەددینی ئەیوبی بوو. دواتر چوو بۆ

قاهیرەو ئەسکەندەرییە. لەبەغداش لەساڵی 608ی کۆچی, گەشتەکەی دەنگی دایەوە.
شا(کەیکاوس) زۆر هەوڵیدا بن عەرەبی بۆخۆی راکێشێت , بەڵام بێ سوود بوو. لەهزری خۆیدا دەوڵەتی ئەولیایانی دامەزراند بوو خۆی سەردەستەیان بوو, بەڵکو وەك خۆی دەڵێت (خاتم الاولیاء )
بوو.لەرۆژگارێکدا بوو کێشەو ململانێی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و هزری هەتا زمانەکەیشی لەنێوان عەرەب و فەرەنگ و تەتارو بەربەر لەپۆپەی بەهێزیدا بوو.
بن عەرەبی لە 598ی کۆچی بۆ یەکەمجار گەیشتە مەکە, ئیتر نەگەڕاوە بۆئەندەلوس.لەمەکەی پیرۆزدا دەرگای زانستە هۆشەکیەکانی بۆکرایەوە, ناوی نووسینەکانی نا (الفتوحات المکیە) , نووسینی ئەم کتێبە بۆ(37) ساڵ بەردەوام بوو لەساڵی 598 دەستی پێکرد تا ساڵی 635ی کۆچی.
لەدواقۆناغدا بن عەربی, لەشاری دیمەشق بەتەواوی نیشتەجێ بوو , ڕاڕەوەکەی تیایدا سیمای خۆی وەرگرت, لەساڵحیەی دیمەشق دەساڵان جێگیر بوو هەر لەساڵی 629ی کۆچیەوە لە دوا ساڵەکانی تەمەنی پەنای بردە لای (مالباتی) بن زەکی (ابن الزکی) و کەسانێك لە خانەوادەی ئەیوبی , کە فەرمانداربوون ,دوای ئەوەی هەندێ لە فیقهزانان رەخنە و تانەیان لێگرت و بە خوانەناسیان لە قەڵەمدا ! لەم ماوەیەدا کتێبی (فصوص الحکم) ی دانا لە ماڵی (القاچی ابن الزکی) و ماڵئاوایی لە دنیا کرد, تا لەشەوی هەینی 28/ربیع الاخری ساڵی 638ی کۆچی ,کۆچی دوایی کرد.

لەبناری چیای قاسیون لەسالْحیەی دیمەشق لە گۆرستانی خانەوادەی بن زەکی لە بناری چیای قاسیون نێژرا . لە دیمەشق خۆی تەرخانکرد بۆ نووسین, زۆر لەنووسراوەکانی لێرەدا تەواوکرد, گرنگترین بەرهەمی هزری خۆی هەرلێرە تەواوکرد کەنقێمەکانی پەندیاری(فصوص الحکم)یە, بوێرترین راوبۆچوونی تێدایە لەهزری ئیسلامیدا.

## بەشی دووەم:

## فەلسەفەی سۆفیگەری لای بن عەرەبی

ئیبن عەرەبی لەتەمەنی لاوییەوە کەوتە جیهانی سۆفیگەری, بەڵام خێرا دەنگ و ناوبانگی بڵاوبۆوە.. لەسەر ڕێبازی قادری بوو دواتر ڕێبازی تایبەتی خۆی پەیدا کرد کە بە (الاکبریة) (ئەکبەریە) ناسراوە. لەگەورە موریدانی ناوی (سەدرەدین قونیەوی) دەهێندرێت. ئیبن عەرەبی بەرهەمی گرنگ و دانسقەی داهێنا, سۆفیگەری و زوهدی کردە جۆرێك لەفەلسەفەو , لەکتێبەکانی دا بۆچوونی بوێرو نوێی خستە روو.
زنجیرەی ڕێبازەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (سری سقطی) و مەعروفی کەرخی و (ئیمام رەزا) (ر. خ).

پەروەردەی گیانی:
ئەم کەش و هەوا ئاڵۆزە , لەلایەك وبنەماڵەیەکی ئایین پەروەر لەلایەکی دیکەو لە قوتابخانەیەکی فەلسەفەی خوێندن, وایکرد هەر لە لاوییەوە بکەوێتە جیهانی سۆفیگەری , تەمەنی بیست ساڵ نەدەبوو دەیوت: ((نهێنییەکانی ژیانی سۆفیگەری دەزانم و چەندان نهێنی گەردوونیم لارِوونە)) وژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئەم ئامادەگییە خۆڕسکە. بەردەوام بوو لەسەر هەوڵ و کۆشش و زۆر نهێنی لائاشکرا بوو.
هێشتا لەقورتوبە بوو شارەزای بیروبۆچوونی گەورە فەیلەسوف و زانایان و حەکیمانی گریکی وەك فیساگۆرسی و ئەمبیزوقلیسی و ئەفلاتوون و حەکیمانی فارس بوو, شارەزای هەموو شێوازەکانی خوداپەرستی و تەسەوف بوو.

**گاریگەری بن عەرەبی لە جیهانی ڕۆژئاواییدا :**

**گاریگەری بن عەرەبی تەنیا لەسەر جهانی عەرەبی و ئیسلامیدا نەبوو بە تەنیا،بەڵکە رەت بوو بۆ جیهانی رۆژئاوایش.رۆژهەلأت ناسی نیکلسون گاریگەری گەورەی بن عەرەبی لەسەر هزری ئەورووپی بەم جۆرە روونکردەوە (بن عەرەبی بلیمەتی ئیسلام لە ئەندەلوس،بە تۆێژینەوە بەپێزەکانی لە ئیلاهیات، بینینە گەورەکانی،لەجیهانی گیاندا،رێی هەموارکرد لە بەردەم لاهووتی مەسحایەتی بۆ رابوون و ڕزگار بوون لە کۆت بەندان،گاریگەری هەبوو لەسەر بووژانەوەی ئەدەبی ئەورپوپیش.گەڕانەوەی دانتی نووسیویەتی لە (کۆمیدیایی خوداوەند یی) داناو ئەدەبی بن عەرەبی نووسیویەتی،دەبینین دانتی شاگردیەتی کردووە لای بن عەرەبی.لەبەر نامەو شێوازو رێباز،بەڵکو لە وێنەو نموونە و دپەند و زاراوە و شێوازی هونەریش.(1)**

**بن عەرەبی لەناوەند،هزری سیاسیەکانیشدا سەرپەرایی سۆفیگەری کاریگەری ماوە ئەوەتا ئایەتواڵله خومەینی لە نامەکەیدا بۆ میخائیل گوربا چوف دەنووسێت (ماندووتان نەکەم،کتێبیەکانی سۆفیەکان بەتایبەتی کتێبەکانی محیەدین بن عەرەبی،زۆرن،گەر ویستتان سوود لە توێژینەوەکانی ئەم پیاوە مەزنە ببینن،ژمارەیەك لە شارەزا زیرەکەکانتان و ئەوانەی لەو جۆرە زانیار پیە شارەزان بنێرنە شاری قوم،بۆ ئەوەی دوایی ئەوەپشت بەخوداوەند لەچەند ساڵێکدا شارەزای قووڵایی پێگەکانی زانینە ناسکەکان بن،کە لەشعیر ناسکترە،لەبەر ئەوە بەم شێوەیە نەبێت ناکرێ لەو زانینە بزانرێت.1- لەنامەیەکی تایبەتیدا بەرێکەتی**

22 جمادى الاول 1409ك بەرامبەر 30-12-1988ز .    المعرفه:ص18
.

بەڵگەی پەیوەندی بن عەرەبی بە ئیسماعیلیەکان و زاراوەکانیان بەکار هێنانی زۆر لە زاراوەکانیان وەك : بن عەرەبی لە (الفتوحات المكيه) دەڵێت :

(وهذا الامام  هو الذى علم اجابة الحد،ثم رجالا سبعة يقال لهم الابدل يحفظ الله بهم الا قاليم السبعة لكل بدل اقليم،ثم تكون الانسان الذى اهو ادم في الرتبة السابعة ولما كان وجود الانسان في اسنبلة ولها من الزمان في الدلالة سبعة الاف سنة فوجود الانسان  في المرتبة السابعة،فما حمل الامانة الا من تحقق بالسبعة وكان هذا هو السابع من الابدال.).

ئیمام لە بانگەوازی ئیسماعیلیەکان هێزی ئەو شەشەی پێش خۆی کۆدەکاتەوە،ئەویش کۆتایی دەورەو پێشی دەوترێت بنجی و بنچینەیی.

1- 1-حنا فاخوري و خليل الالجريط:تاريخ الفلسفة العربية-لبنان 1963- ص310-311.

**پێگەی  بن عەرەبی**

**محێدین بن عەرەبی لە گەورە پیاوانی ئیسلامە،سۆفیگەری لەسەر بنچینەی هۆش و بەڵگە هێنانەوە دامەزراند،نزیکەی 240 کتێبی هەیە،بەناو بانگەکەیان (الفتوحات المکیە)،(فصوصی الحکم)،لەلایەنی ئەدەبیەوە پایەیەکی بەرزی هەیە.**

**محێدین لە یەکێتی بووندا ( وحدە الوجودە) ڕێبازێکی تایبەتی هەیە بە هۆیەوە،علاء الدولە السمانی (لە 736 ك مرد) دژی وەستاوە.**

**زۆربەی راو بۆ چوونی سۆفی و حەکیمەکان لە سەدەکانی دوایی لەم بۆ چوونانەوە پەیدابووینە)).بەڵکو کتێبەکانی بوون بە بنچینەی سۆفیگەری لە سەدەی هەشتەمی کۆچییەوە و تا ئێستاش.**

**هەتا مەولانا جەلالەدینی رۆمی ئاماژەی بە مەزارەکەی داوە،کە لەدیمەشق لە ساڵحیە ،نێژرا،ئەوەتا مەولانا دەڵێت :**

**في جبل صالح منجم للجوهر وبسبب**

**ذاك الجوهر نحن غرقى بحر دمشق.**

**مەبەستی مەزاری محیدین بن عەرەبی بووە, و سالح ئاماژەیە بە( صالحیە).**

**بن عەرەبی لەمەکە زۆر خەریکی نووسین بوو بە تایبەتی (الفتوحات المکیە) لە وەڵامی شاگردێکی داینا بە ناوی (بدر الحبشی)،کە لە نووسینی بووە وە لەسەر بانی کەعبەی دانا تاساڵەکی بەسەر رابرد،باران و بای مەکەی زیانی پێگەیاند،دوای ئەوە رێیدا خەڵك بیخوێنینەوە و بینووسننەوە.**

بن عەرەبی دەڵێت : هەموو ئەوەی لە کتێب و کۆڕ و دانیشتنەکانمدا دەیڵێم،لە ئامادەگی  قورئانی مەزندایە من کلیلی زانستیم پێدراوە،لە هەر زانستێك لەو زانستاندا لەو وەردەگرم،بۆ ئەوەی لە ئامادەگی  خودای تەعالا  دانەبڕێم بە موناجاتکردنی بە ئاخاوتنەکانی نەبێت،یان بە ناوەرۆکی ئاخاوتنەکانی .

دەشێ بە چوار خاڵ دەستپێبکەین جێدیدگای محێدین بوو:

یەکەم: خۆشەویستی خودایی و باڵاچوون رووەو خوداوەند .

دووەم: مرۆی تەواو (الانسان کامل).

سێیەم: تیۆری یەکێتی بوون.

چوارەم: جیهانی وەلیان.

بن عەرەبی خاوەن راڕەوێکی سەر بەخۆ بوو لەمبارەیەوە لە (دیوان ابن عربی) دا دەڵێت :

نسبونی الی بن حزم وانی

لست ممن یقول قال ابن حزم

لا ولا غیره فان مقالي

قال نص الکتاب ذالك علمي

او یقول الرسول او اجمع الخلق

علی ما اقول ذالك حکمي

زۆر لە زانایان بنەمایەکی گرنگییان هەبوو لەلێکدانەوە (تاویل)ی ئەو دیاردەو قسەو نووسینانەی بە رواڵەت (ظاهر ) لەگەڵ دەقی فەرموودە و

ئایات نەدە گونجان لە مبارەیەوە دەڵێت : یجب تاویل افعال اولیاو الله تعالی .

مامۆستا و پیرو برادەرو دڵسۆزەکانی:

نزیکترین هاوڕێکانی شێخ ئەبو محەمەد-عەبدولعەزیز کوڕی ئەبی بەکری قورەیش مەهدەوی دانیشتووی تونس بوو, محێدین نامە(روح القدس فی محاسبه النفس)ی بۆنارد, هەروەها کتێبی (الفتوحات المکیه) , لەو وەسفانەی لێی دەکات:

((وقد فزت یاأخي-جعلني الله وایاك من الفائزین-في زمانك هذا بخلال, لم اقدر انا اراها من غیرك: منها معرفتك بمرتبة العلم و اهله, وعدم تعریجك علی الکرامات و الاحوال , ومنها انقیادك للحق , وتواضعك له...)) .1

راڕەوەی بن عەرەبی لە سۆفیگەریدا :

راڕەو (مەزهەب)ی بن عەرەبی لە سۆفیگەریدا لەسەر چوارستوون (کۆڵەگە) دامەزراوە : زانین :دەکرێتە سێ بەش :

1-ئاشکرابینی (المکاشفه) : بەهۆی بوونی پەردەیەك،ناوبرێك،داپۆشەرێك لە نێوان دەروونی مرۆیی و خودای مەزن،بۆ ئەوە دەچوو کەوا گەیشتن بە ئاشکرابینیی نهێنییە خوداوەند ییەکان

1-(د.عثمان یحیی : مؤلفات ابن عربي ,تاریخها وتصنیفها .ترجمة د.احمد الطیب (دار الصابون – دار الهدایة ,القاهرة 1992)ص 135:144)

شیاوە،لە رێگەی هەوڵ و کۆششی و راهاتن بەپێی رارەوە سۆفیگەرییەکان.1

**2- دەرکەوتن (خۆدەرخستن) (التجلی) :بن عەرەبی هەمیشە بە ڕووناکی=نوور هێمای بۆ دەکات،دەرکەوتنی نورانیانەی خوداوەند یەو سیفەتەکانی و کاروباری گیانی و خوداوەند یی.**

**3-دیدەنی (المشاهدە) :ئەو کاتە ڕوودەدات کەوا پەردەکان لادران،دەروون بە نوری خوداوەند یی ڕووناك بۆوە،بەشێوەیەك تەنیا بینینیان دەمێنێت .**

**ئاکام،بن عەرەبی بەشیکردنەوەیەکی فەلسەفی ئەم بۆ چوونانە ڕاڤەدەکات و زانین بە بەخششێکی خوداوەند یی دادەنێت نەك دەردەستکردنی بەندەکان،خودای مەزن فەرموویەتی (وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ) البقرة:282.**

*1-د. منی برهان غزال الرفاعی النقشبندی:فلسفه الترقی والولا یه عند الشیخ محی الدین بن العربی،الگبعه الاولی،حزیران 2006م،الاوائل،سوریا ،دمشق.*

**دارِشتەی کۆتایی یەکێتی بوون (وحده الوجود):**

**لێکۆلەرەوان لەسەر ئەوە کۆکن کەوا لەسەر دەستی بن عەرەبی تیۆری یەکێتی بوون بە تەواوکراوی بینرا ،دارِشتەی کۆتایی پێ بەخشی.بابزانین چییەو رِۆلّی لە واقیعدا چییە.**

**، ئەوەتا محەمەد راشد سەبارەت بۆچوونی بن عەرەبی دەلّێت : زۆر جاران پێلی یەکێتی بوون لە هزری عەرەبی ئیسلامی چ لە فەلسەفە وەك بە ئاشكرایی لای فارابی،ئیبن سینا،ئبن توفەیل دەرکەوت،یان لە سۆفیگەری-وەك لەلای زۆربەی گەورە رابەرانی سۆفیگەری هەیە ،تیایدا دووپاتی بوونی ژیان لە رووی چوارچێوەی کات و شوێن،دەکەنەوە لە رێگەی دووپات کردنەوەی هەولّی بەردەوام بۆ نەمانی رامانەکی (تاملی) لە رەهادا... (1)**

**واتا ئەرکی مرۆڤ تەوەرەکەی،ئەوەیە مرۆڤ ویستی بوونی لە رێگای کاری داهێنەرانە جێبەجێ بکات،لەسەر بنەمای ئەوەی گەردوونی بچووك چاوە نوارِە-بەردەوام بگات بەگەردوونی گەورە-بە خۆپاك کردنەوە وبالاّو بەرز بردنی.تیۆری یەکایەتی،لەسەر بنچینەی هاوسەنگی لە نێوان گەردوونی گەورە و گەردوونی بچووك دامەزراندووە-بەزمانی بن عەرەبی.2**

**1-الشیخ محی الدین ابن العربی : تنزل الاملاك فی حرکات الافلاك،تحقیق نواف الجراح،دار صادر،بیروت،2003،ل10-.11**

2-محمد الراشد : اشكاليه وحده الوجود فى الفكر العربى الاسلامى،ص31

ئبن عەرەبی دەڵێت :

فانظر الى حق اليقين وعينه

في عالم الارواح و الابدان

تجد الذى عنه تكون سره

في كل مايبدو من الاعيان(1)

ئەحمەد ئەمین سەبارەت یەکێتی بوون لای ئبن عەرەبی دەنووسێت و دەڵێت :

یەکیەتی بوون لای بن عەرەبی و بن فارز بۆ ئەوە دەچێت گوایە لەجیهان دوو بوون هەیە،بەڵکو یەك بوون هەیە،ئەویش خوداوەند یە،خوداوەند جیهانە و جیهان خوداوەند یە،ڕواڵەتە جیاجیاکانی جیهان تەنیا ڕواڵەتن بۆ خوداوەند ، بوون نییە تەنیا ئەو بوونە نەبێت کە پەیوەستە بە بوونەوەران هیچی دیکە نییە هەر ئەو نەبێت.(2)

1-د.عبدالرحمان بدوى-مزاهب اسلاميه-ج2،ص.103

2-احمد امين،ظهر الاسلام-ص16..

د.حسێن مەروە (1) تێگەیشتنی بن عەرەبی لە تیۆری یەکێتی بوون واڕاڤەدەکات :

هەڵوێستی بن عەرەبی نموونانەیەتی خوداوەند ییە،واتە بن عەرەبی دان نانێت بە بوونی بابەتێکی جیهانی دەرەوە.کەچی شاگردەکەی مەلا سەدرای شیرازی بەئاشکرا دان دەنێت بە بوونی دەرەکی،بوونێکی بابەتیانە.هەرچەند دەڵێت خوداوەند یەکی راستەقینە هەیە،یان هەردوو بوون دەگێڕێتەوە بۆ یەك راستی یەك هەوەتی.واتە هەڵوێستێکی نموونایەتی و بابەتیانەیە.(2)

پیرەکانی لەسۆفیگەریدا:

لەئەندەلوسدا ,شێخ (ابی العباس الرعینی) رێبازەکەی لەسەر نەمانی ویست و ملکەچی بۆ خودا دامەزرابوو, بن عەرەبی لەم رێگایە چووە دەرگای بەندەگی, لەیوسف (الاستجی) ((التصور الصوفی للصدقه ))فێربوو, واتە وێنای سەدەقە لەسۆفیگەریدا لەو فێربوو. لە(عبدالمجید بن سلمە) شارەزا لە (تجلی) ی سۆفیگەری و وەجد ,لەهەموو تەجەلیاتەکان گەیشت ,هەروەها لە (ابی یحیی الصهناجی الچریر) فێربوو خۆڕاگر بێت بەرمابەر

1-د.حسين مروه-الزعات المادية في الفلسفه العربيه الاسلاميه-د.حيسن مروه-ج2-ص277 و ص278.

2-النزعات الماديه-ص286-287.

چەوسادنەوەی لەلایەن خەڵکەوە , (موسى بن عمران الميرتلي) فێری هاوەڵەتی کرد, چەندان سۆفی دیکەش لەئەندەلوس هاوکار بوون بۆ بنیاتنانی گیانی، لەرۆژهەلأتدا دوای ئەوەی کۆچی بۆکرد. هەرچەند تەمەنی چل ساڵان بوو, بەڵأم ئارەزووی قوڵبوونەوەی لەسۆفیگەری هانیدا بچێت بۆبەغداو قاهیرەو مەکەو دیمەشق.

سەرسام بوو بەسیستەمی (خانەقا)کان, کتێبی (روح القدس في محاسبه النفس) ی نووسی بەهۆی ختووکەی رەخنە لە سۆفیان ویادی شێخانی ئەندەلوس. لەو مۆڵەتنامەی بۆ (الملك الظاهر) پیرانی ئەندەلوس باسی کردوون سەرەرای سەدان ئاماژە لە (الفتوحات المکیه) ئەم ژینگە پڕ داهێنانە یاریدەی دابۆئەوەی بەرنامەیەکی تایبەت و رەوت و رێگایەکی تایبەت بەخۆی هەبێت, بەرنامەی تەوفیق-گونجانی سەرتاپا گربێت, پێشنیاری بەرنامەی (الکشف والشهود= رۆشنبینی و بینگەرایی) وەك رێگاچارەیەك بۆ وەڵأمی ئەوانەی نارازین.

شێخ عەبدولغەفار قوسی-خاوەنی(الوحيدفي سلوك اهل التوحيد),شێخێکی میسری بوو, لەزاری کەسانی دی دەگێرێتەوە کەوا : خزمەتکاری شێخ بن عەرەبی وتوویەتی: بن عەرەبی دەرۆیشت ,مرۆیەك جوێنی پێدەدا, ئەویش بێدەنگ بوو وەڵأمی نەدەداوە! پێم وت: گەورەم , ئەم حاڵەتە چۆن دەبینی , وتی: بەکێی دەڵێیت؟ وتم: بەتۆی دەڵێت, وتی: جوێن

بەمن نادات. وتم چۆن؟ وتی: ئەو چەندان سیفەتی خراپی لەهزردایە، جوێن بەو سیفەتە خراپانەدەدات، من ئەوسیفەتانەم تێدانییە! هاوکات سەدان رووداوی لەوچەشنەی بەسەرداهاتووە.

تەرازووی پێوەر لای بن عەرەبی سێ بوون:

- کۆڕا( الاجماع).
- ئاشکرابینی (کشف) .
- کۆششی رەها (الاجتهاد المطلق)

لێبوردەیی-بن عەرەبی دەگاتە ئەوپەڕی بەرامبەر باوەڕو بۆچوونەکانی دیکە.

دەڵێت:

لقد كنت قبل اليوم انكر صاحبي

اذ لم يكن ديني الى دينه داني

وقد صار قلبي قابلا كل صورة

فمرعى لغزلان وديرا لرهبان

وبيتا لاوثان وكعبة طائف

والواح توراة واوراق قران

ادين بدين الحب انى توجهت

ركائبه فالحب ديني و ايماني

-یەکسانی نێوان پیاو ئافرەت :

اما مذهبنا فليست العورة في المراة ايضا الا السواتين كما قال تعالى: (وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة) فسوى بين ادم و حواء في سترالسواتين وهما العورتين.(1) .(الفتوحات المكية-ج1-ص408).

-پێشنوێژی ئافرەت : (فمن الناس من اجاز امامة المراة على الاطلاق وبه اقول...) (2) (2-الفتوحات المكيه-ص447).بن عەرەبی نامەو کتێبەکانی زۆرن دەگەنە 285 دانراو لەنێوان کتێبی گەورە و بچووکدا.
کتێبی (المعرفه) ژمارە (191)ە کەلەم کتێبانە،تیایدا بن عەرەبی باسی خودا و زانین و مرۆڤ دەکات.تیایدا تیۆری یەکێتی بوون پەیڕەو دەکات لە فتوحاتدا دەڵێت :تەوەری زانینی کە تایبەتە بۆ ئەهلی خودا حەوت پرسن،ئەوەی بیانزانێت هیچ شتێکی لا دژوار نابێت،لە زانینی حەقایقدا،ئەویش 1-زانینی ناوەکانی خودای تەعالان ،2-زانینی تەجەلی (دەرکەوتن)یەکان و گوتاری حەق بەزمانی شەرع،3-زانینی تەواوی بوون (کمال الوجود)،4-زانینی مرۆڤ لەلایەنی راستیەکانەوە،5-زانینی بینەواری (کشف) خەیالی،6-زانینی دەردو دەرمانەکان،ئەم باسانەمان لە دەروون زانین لەم کتێبەدا کردووە،لەوێ لەم باسانەدا بگەڕێ ئینشائەڵلا.(1).بەم جۆرە کتێبی زانین-تیۆری زانینە لای بن عەرەبی.الفتوحات المکیە-ج1-ص34

ئەحمەد ئەمین بۆچونی حەلاج بە هەمان یەکێتی بوون لای بن عەرەبی دەزانێت .

ئەلفردفون کەریم بۆ ئەوەچوو کەوا سۆفیگەری ئیسلامی لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی (چاخی ئەبی یەزیدی بەستامی و جونەیدو حەلاج).

سروشتێکی تایبەتی هەبوو ئەویش فەلسەفەی یەکێتی بوونی تێدابوو یان زاڵبوون بەسەریدا. (1)1-أحمد أمین: ظهر الاسلام جـ2 ص78)

شایانی باسە غەزالی لە کتێبی (مشكاة الانوار) ص128-129

بەرگری لە حەلاج دەکات و زێدەگۆییەکانی تەئویل دەکات بە تیوری یەکێتی شهود بەرگری لێ دەکات، دەڵێت: أن الرحمة الالهية قد جعلت عالم الشاهدة وهو العالم الحسي علي موازنه مع عالم الملكوت وهو عالم الغيب. فما شئ فى هذا العالم ألا وهو مثال لشئ من ذلك العالم...والغرض من المشابهة بين العالمين هو ادراك ان عالم اشهادة هو مثال العالم العلوي اى عالم الملكوت و ذلك لأن السبب لان لايخلو من موازاة السبب ومحاكاته نوعاً من المحاكات علي قرب أو على بعد، ومن أطلع على كنه حقيقته انكشف له حقائق القرأن علي يسر(1)

1-(مشكاه ص128-129).

گۆشەنیگای د.محەمەد جەلال شەریف(1): تیۆری یەکێتی بوون دەشێ لە پێش بن عەرەبی دا هەبێت وەك: (( ابن سبعين و التسترى)) ، بەڵام بن عەرەبی مەزهەبی یەکێتی بوونی لە وێنەی قوتابخانەیەك دارشت و زاراوەی سۆفیانەی تەواوی بۆ دانا، لە هەموو سەرچاوەیەکی دەستی پێگەیشت خواستیەوە، وەك: قورئانی پیرۆزو حەدیسی و علیمی کەلام و فەلسەفەی رۆیاری و فەلسەفەی ئەفلاتونی نوێ و

گنۆسی مەسیحیەتی و ئاشیانەکی (رواقی)و فەلسەفەی فیلونی یەهودی ئەسکەندەری. هەروەها سوودی لە زاراوە ئیسماعیلیەیە باتینییەکان و قەرامیتییەکان و ئیخوان و فەلسەفەو سۆفیاتی ئیسلامی پێش خۆی وەرگرت)).1

،سەبارەت بە دیداری بن عەرەبی لەگەڵ بن روشد دەڵێت :رۆژێکیان لە قورتوبە چوومەلای قازی قورتوبە ئەبی وەلید محەمەد کوڕی روشد،داوای کردبوو بمبینێت،بەهۆی ئەوەی بیستبووی خودا دەرگای لە گۆشە گیریمدا لێکردوومەتەوە، بن روشد (ابن رشد) هاورێیەکی باوکم بوو،منیش لاوێك بووم هێشتا مووم لێ نەهاتبوو (واتە سمێڵ وردێنم نەهاتبوو)،پێی وتم : شتەکە چۆن دەبینن لە کەشف و فەیزی خودایی ج11(1) (2). چی دیکە نەم بینییەوە تا لە ساڵی 595ك لەشاری مەراکیش کۆچی دوایی کرد ،گوازرایەوە قورتوبە و لەوێ نێژرا.

ئەندەلوسی لەو کاتیدا لە چاخێکی تاریکی دەژیا خەلیفە (المنصور ابن عار) بریاری دا،فەلسەفەو کتێبەکانی قەدەغە بکرێت و بسوتێندرێت.

1-د.محمد جلال شریف: دراسات فی التصوف الاسلامی، دار انغمه العربیه- للگباعه وانپر – بیروت 1984)

1-الفتوحات المکیة-ج1-ص153-154

2-محي الدين بن عربي؛المعرفة،تقديم و تحقيق محمد امين ابو جوهر،التراث الصوفي،دار التكوين للطباعة و النشر والتوزيع،ديمشق.

وەخەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە نزیکی نەکەون لەو فەرمانەیدا هاتووە :

كان في سالف الدهر قوم خاضوا في بحور الاوهام (الفلاسفة الاقدمون)،فخلقوا في العالم صحفا مالها من خلاق.مسودة المعاني والاوراق،ونشا منهم في هذه السمة البيضاء شياطين انس يخادعون الله والذين امنوا...،وقف بعضهم على كتب مستطورة في الضلال،موجبة اخذ كتاب صاحبها بالشمال . ظا هرها موثق بكتاب الله،وباطنها مصرح باعراض عن لله..،فحذ روا وفقكم الله هذه الشرذمه على الايمان حذركم من السموم الساريه فى الابدان .

ومن عثر له على كتاب من كتبهم فجزاؤه النار التى يعذب اربابة،.. والله تعالى يطهر من دنس الملحدين اصقاعكم (1) .

بەم فەرمانە فەلسەفە.خوێندنەوە و نووسینی قەدەغە کراو سووتێندران،ئەوەی کاری تیا دەکرد دەربەدەر دەکران،لەوانە بن

روشد.لەهەمان کات لە رۆژهەلآت ئەبو حامدی غەزالی دژی (باتینییەکان) و فەیلەسوفان وەستاسەیر لەوە دایە سوڵتانی مەغریب عەلی کوڕی یوسف بریاریدا (کتێبی غەزالی)یش بسوتێنن،وایدانابوو فەلسەفەی تیدایە.بەڵێنی دا ئەوەی ئەم کتێبەی لا بێت دەیکوژێت.
ساڵی 594ك لە بن روشد کەسانی دیکەش خۆشی بوون و لێبوردنیا بۆ دەرچوو،پاش ساڵێك ئبن روشد کۆچی دوایی کرد.
بن عەرەبی دەنووسێت :
لەو کاتەی تەرمی بن روشد خرایە سەر وولآغ کتێب و نووسراوەکانی خرانە لایەکی دیکەی بارەکە،منیش وەستابووم،کۆمەڵێك بووین،یەکێکمان ئاوڕی لێدامەوە ووتی : بڕوانە کێ پارسەنگی ئیمام دەداتەوە لەو بارەدا ، ئەوەیان ئیمام و ئەوەیان کارەکانی !
ئبن جوبێر ووتی : کوڕم چاکت ووت،دەم خۆش،ئەم وتوو وێژەم لای خۆم نووسی وەك پەند ئامۆژگارییەك خوالێیان رازی بێت لەو کۆمەڵەیە کەسیان نەماون من نەبم لەوەدا وتوومانە :

هذا الامام وهذا اعماله
ياليت شعري هل انت اماله

1-فرح انطون-ابن رشدو فلسفته-تقديم طيب تيزيني.ص69 و 70 و 71 .

بن عەرەبی لەسەر دەمی خاچپارێزان خەڵکی هاندەدا بۆ هاوبەشیکردن.

له میسر هەندێ فتنه گێڕ ویستیان زیانی پێبگەیەنن سکالایان لێ کرد گیرا،بەلاّم دواتر خوایی گەوره لەسەر دەستی شێخ ئەبی حەسەنی بجائی رزگاری کرد،لەرێگای لێکدانەوەی قسەکان.
دوایی ئەوەی رزگاری بوو له بەند شێخ بجائی لێی پرسی: ئەوەی لاهو ووتی کەو تبێتە ناسووتەوە چۆن بەند دەکرێت (كف يحبس من حل منه اللاهوت في الناسوت ؟)
بن عەرەبی ووتی :
(ياسيدى تلك شطحات في محل سكرولا عتب على سكران) (1) .
واتە بن عەرەبی له وەلاّمدا وتی :
گەورەم ئەویان زێدەگۆییەك بوو لەکاتی سەر خۆشیدا و سەرخۆش لۆمەی ناکرێت.

الفتوحات المكيه-ج4-ص560 . .

**هەڵبژاردە لەبەرهەمەکانی بن عەرەبی**

**ئەبوبەکر محەمەد کوڕی عەلی محێدین، ناسراو بە (الشیخ الاکبر= پیری گەورە)، نوسەرو سۆفیگەرێکی مەزن بوو، پاکارانی بە (محی الدین) ناویان دەبرد.**

**بەرهەمی زۆربوو نزیکەی (150)نووسراوی ماون و چەندانی دیکەش لەناوچوون. لە شیعردا (دیوان)ێکی هەیە، لە خۆشەویستیدا (ترجمان الاشواق)ە هەیە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕدراوە[1].**

**ڕاڤەی قورئانی پیرۆزو (الفتوحات المکیە) ئینسایکلۆپیدیایەکی مەزنە لە 560فەسڵ و (فصوص الحکم) (پەندە نقێمییەکان) :**

---

[1] معجم الفلاسفه.....

**نقێمە پەندەکان**

**(فصوص الحکم) 1)**

**نقێمە پەندەکان ( فصوص الحکم)ی بن عەرەبی، سەبارەت بە نهێنییە خوداوەندییەکانە، کەوا پەیامبەران (د.خ) گەیاندیان، تیایدا بن عەرەبی لەبارەی نهێنییەکانی پێغەمباران و ئەنبیایان دەدوێت،دەشێ هەندێ زێدەگۆیی تێدابێت ،بەلاَم بەلێکدانەوەی لەبار گلەیی دەرەوێتەوە، ئەم کتێبە لە نێو کتێبەکانی محێدین بن عەرەبی،بنجی کتێبەکانی دیکەیە،دەشێ بلێین ئەوانەی دیکە،راڤەو روونکردنەوەی ئەم کتێبەن.**

**هۆکارەکانی :**

**1- نهێنیە خوداوەندییەکان باس دەکات لەمەڕ بنۆسی ناردنی پێغەمبەران.**

**2-هەرسێ راستەڤینەی تێداباس کراون : خودا،مرۆڤ،گەردوون.**

**3-شوێن و پایەی پێغەمبەرانی تیادا باسکراوە و چۆن دەکرێ سودیان لێ وەربگرێت.**

**هۆکاری دانانی ئەم کتێبەش بن عەرەبی لەپێشەکییەکەیدا دەلێت: پێغەمبەر (د.خ)م لە خەونێکی مژدە بەخشدا بینی، لەدەیەی دوایی مانگی موحەرەم سالی شەش سەدو بیست و حەوت لە شاری دیمەشق و خۆشەویست (د.خ) کتێبێکی بەدەستدا بوو پێی وتم: ئەوە کتێبی (فصوص الحکم) نقێمەپەندەکانە، وەریگرەو لەنێو خەلکد بلاَوی بکەوە سوودی لێ وەردەگرن، وتم: بیستم و ملکەچم بۆ خوداو پێغەمبەری خوداو فەرماندار لە ئێمە وەك فەرمانی پێمان کردووە)).**

دەقەکە:

إني رأيت رسول الله ( في مبشرة أريتها في العشر الآخر من محرم سنة سبع وعشرين وستمائة بمحروسة دمشق وبيده كتاب فقال لي: هذا كتاب (فصوص الحكم)) خذه واخرج به الى الناس ينتفعون به، فقلت: السمع والطاعة لله ورسوله واولي الامر منا كما أمر))1

1-(فصوصى الحكم) بن عربى، ط1، 2002م-1424ھ، دار الكتب العلميه، بيروت-لبنان ,باشراف: د.عاصم ابراهيم الكيالى.

نقێمی محەمەدی

- نقێمی یەکەم: نقێم لە وشەی محەمەد دا ( الفص المحمد (د.خ)ی)

27- فص حكمه فرديه فى كلمه محمديه

إنما كانت حكمته فرديه لأنه أكمل موجود فى هذا النوع الإنسانى، ولهذا بدئ به الأمر و ختم، فكان نبيا وءادم بين الماو والگين، پم كان بنشأته العنصريه خاتم النبيين.

وأول الأفراد الپلاپه، وما زاد على هذه الأوليه من الإفراد فإنها عنها.

فكان أدل دليل على ربه، فإنه أوتى جوامع الكلم التى هى مسميات أسماو ءادم.

1- ابن عربى (فصوص الحكم) –ط1، 2002م-1424ھ، دار الكتب العلميه، بيروت-لبنان

فأشبه الدليل فى تپليپه، والدليل دليل لنفسه.

ولما كانت حقيقته تعگى الفرديه الّولى بما هو مپلپ النشأه لژلك قال فى باب المحبه التى أصل الوجود، ((حبب إلى من دنياكم پلاپ)) بما فيه من التپليپ.

پم ژكر النساو والگيب وجعلت قره عينه فى الصلاه.

فابتدأ بالنساو وأخر الصلاه، وژلك لّن المرأه جزو من الرجل فى أصل ڤهور عينها.

ومعرفه الإنسان نفسه مقدمه على معرفته ربه، فإن معرفته بربه نتيجه عن معرفته بنفسه لژلك قال( من عرف نفسه فقد عرف ربه)).

فإن شئت قلت بمنع المعرفه فى الخبر والعجز عن الوصول فإنه سائغ فيه، وإن شئت قلت بپبوت المعرفه، فالّول أن تعرف أن نفسك لا تعرفها فلا تعرف ربك، والپانى أن تعرفا فتعرف ربك.

فكان محمد ( أوچح دليل على ربه، فإن كل جزو من العالم دليل على أصله الژى هو ربه فافهم.

وإنما حبب إليه النساو فحن إليهن لّنه من باب حنين الكل إلى جزئه، فأبان ژلك عن الّمر فى نفسه من جانب الحق فى قوله فى هژه النشأه الإنسانيه العنصريه( ونفخت فيه من روحى)( الحجر: 29).

پم وصف نفسه بشده الشوق إلى لقائه فقال للمشتاقين:( يا داود إنى أشد شوقا إليهم)) يعنى للمشتاقين إليه، وهو لقاو خاص.

فإنه  قال فى حديث الدجال إن أحدكم لن يرى ربه حتى يموت، فلا بد من الشوق لمن هذه صفته.

فشوق الحق لهؤلاء المقربين مع انه يراهم فيحب أن يروه ويأبى المقام ذلك، فأشبه قوله: ( ( (حتى نعلم) محمد: 31) مع كونه عالما فهو سبحانه وتعالى يشتاق لهذه الصفه الخاصه التى لا وجود لها إلا عند الموت.

فيبل بها شوقهم إليه كما قال تعالى فى حديث التردد وهو من هذا الباب: ( ما ترددت فى شىء أنا فاعله كترددى فى قبض عبدى المؤمن يكره الموت وأكره مساءته ولا بد له من لقائى)) فبشره بلقائه.

وما قال له ولا بد له من الموت لئلا يغمه بذكر الموت.

ولّما كان لا يلقى الحق إلا بعد الموت كما قال عليه السلام:( إن أحدكم لا يرى ربه حتى يموت)) لذلك قال تعالى: ( ولا بد له من لقائى))، فاشتياق الحق لوجود هذه النسبه.

| | |
|---|---|
| يحن الحبيب إلى رؤيتى | وإنى إليه أشد حنينا |
| وتهفو النفوس ويأبى القضا | فأشكو الأنين ويشكو الأنينا |

فلما أبان أنه نفخ فيه من روحه، فما اشتاق إلا لنفسه، ألا تراه خلقه على صورته لأنه من روحه؟

ولما كانت نشأته من هذه الأركان الأربعه المسماه فى جسده أخلاطا، حدث عن نفخه اشتعال بما فى جسده من الرطوبه، فكان روح الإنسان نارا لأجل نشأته، ولهذا ما كلّم الله موسى إلا فى صوره النار وجعل حاجته فيها، فلو كانت نشأته طبيعيه لكان روحه نورا.

وكنى عنه بالنفخ يشير إلى أن من نفس الرحمن، فإنه بهڑا النفس الڑى هو النفخه ڤهر عينه، وباستعداد المنفوخ فيه كان الاشتعال نارا لا نورا، فبگن نفس الحق فيما كان به الإنسان إنسانا.

پم اشتق له شخصا على صورته سماه امرأه، فڤهرت بصورته فحن إليها حنين الشىو إلى نفسه وحنت إليه حنين الشىو إلى وگنه.

فحبب إليه النساو، فإن الله أحب من خلقه على صورته، وأسجد له ملائكته النوريين على عڤم قدرهم ومنزلتهم وعلو شأنهم الگبيعيه، فمن هناك وقعت المناسبه.

والصوره أعڤم مناسبه وأجلها وأكملها، فإنها زوج أى شفعت وجود الحق، كما كانت المرأه شفعت بوجودها الرجل فصيّرته زوجا.

فڤهرت الپلاپه: حق و رجل و امرأه، فحن الرجل إلى ربه الڑى هو أصله حنين المرأه إليه، فحبب إليه ربه النساو كما أحب الله من هو على صورته.

فما وقع الحب إلا لمن تكون عنه، و قد كان حبه لمن تكون وهو الحق، فلهڑا قال:( حُبِّبَ) ولم يقل أحببت من نفسه لتعلق حبه بربه الڑى هو على صورته حتى فى محبته لامرأته، فإنه أحبها بحب الله إياه تخلقا إلهيا.

و لما أحب الرجل المرأه گلب الوصله أى غايه الوصله التى تكون فى المحب فلم يكن فى صوره النشأه العنصريه أعڤم وصله من النكاح، ولهڑا تعم الشهوه أجزاوه كلها ولڑلك أمر بالاغتسال منه، فعمت الگهاره كما عم الفناو فيها عند حصول الشهوه.

فإن الحق غيور على عبده أن يعتقد أنه يلتڑ بغيره، فگهره بالغسل ليرجع بالنڤر إليه فيمن فنى فيه، إڑ لا يكون إلا ڑلك.

فإژا شاهد الرجل الحق فی المرأه كان شهودا فی منفعل، وإژا شاهده فی نفسه من حیپ ڤهور المرأه عنه شاهده فی فاعل.

وإژا شاهده فی نفسه من غیر استحچار صوره ما تكون عنه كان شهوده فی منفعل عن الحق بلا واسگه.

فشهوده للحق فی المرأه أتم وأكمل، لٔنه یشاهد الحق من حیپ هو فاعل منفعل، ومن نفسه من حیپ هو منفعل خاصه.

فلهژا أحب ρ النساو لكمال شهود الحق فیهن، إژ لا یشاهد الحق مجردا عن المواد أبدا، فإن الله غنی عن العالمین.

فإژا كان الٔمر من هژا الوجه ممتنعا، و لم تكن الشهاده إلا فی ماده، فشهود الحق فی النساو أعڤم الشهود وأكمله.

وأعڤم الوصله النكاح وهو نڤیر التوجه الإلهی علی من خلقه علی صورته لیخلفه فیری فیه صورته بل نفسه فسواه وعدله ونفخ فیه من روحه الژی هو فڤاهره خلق وباگنه حق.

ئەم پەندەی لەبەر ئەوە یە یەکەم پەندە, چونکە( محمد (د.خ)) تەواوترین بوونەوەرە لەم جۆرە مرۆییە دا، هەر لەبەر ئەوەیە شتەکە بەوە دەستی پێ کردووەو و کۆتایی هەر بەوەوە هاتووە، پێغەمبەر بوو لەو کاتەیدا ئادەم لەنێوان ئاوو قوڕدا بوو، دواتر بە پەیدابوونی توخمیانەی دوا پێغەمبەرە.

یەکەمی سێ تاکەکەیە، ئەوەی لەم بەراییبونەدا زێتر بێت لە تاکەکان، ئەوا لەوانەدایە.
دروودی خوای لەسەر بێت بەڵگەترین بەڵگە بوو لەسەر پەروەردگاری خۆی، کۆکەرەوەی ئاخاوتنانی پێدراوە کە ناو نراوی ناوەکانی ئادەمە،لەسێیانە بوونیدا بەڵگەی وێڵ کرد. بەڵگەش بەڵگەی خۆیەتی.لەبەر ئەوەی راستەقینەی تاکایەتی بەرایی یە لەم رووەوە کە سێیانەیە لە پەیدابوون، لەبەر ئەوە دەرووی خۆشەویستی کە بنجی بوونە وتوویەتی:
( حبب الي من دیناکم ثلاثه)(  سێ شت لە جیهانی ئێوە لای من خۆشەویست کراوە)) بەو سێیانەییەی تێدایە.
دواتر باسی ئافرەت و بۆنی خۆش و بینایی چاوی لە نوێژدایە.
سەرەتا بە ئافرەت دەستی پێکرد، نوێژی دواخست، لەبەر ئەوەی پیاو بەشێکە لە ئافرەت لە بنجی دەرکەوتنی چاوگەکەی.
خۆناسینی مرۆڤ پێشەکییە بۆ ناسینی پەروەردگاری، ناسینی پەروەردگاری ئاکامی خۆناسینیەتی لەبەر ئەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی:
(  من عرف نفسه فقد عرف ربه)) دەتوانین بە زانین فەدەغەکەت لە هەواڵەکەدا یان لە پەککەوتەیی لە گەیشتن، ئەوەیان شیاوە تیایدا، دەشێ زانینەکە چەسپاوبێت لات.
یەکەم ئەوەیە بزانیت کەوا تۆناناسیت، کەواتە پەروەردگار ناناسیت، دووهەم خۆت دەناسیت کەواتە پەروەردگارت دەناسیت. محەمەد(د.خ)

بەرچاوترین بەڵگە بوو لەسەر پەروەردگارەکەی، هەموو پاژێك( جزء) لە جیهان بەڵگەیە لەسەر بنجەکەی کە پەروەردگاریەتی، تێبگە. ئافرەتی لا خۆشەویستکرا، ئارەزووی دەکردن، لەبەر ئەوەی لەبابەتی، سۆزی گشت بۆ بەشەکەیەتی، بەم شێوەیە مەسەلەکەی دەرخست لەخۆیدا لە لایەنی خوداوە، کە سەبارەت ئەم پەیدابوونە مرۆییە توخمییە دەڵێت
( ونفخت فيه من روحى)) ( الحجر:29).
دواتر وەسفی خۆی بەزێدە تاسەباری کرد، بۆ دیدەنی، بەتاسەبارانی خۆی وت : ( ياداود إنى اشد شوقا اليهم)) واتە تاسەباری ئەو. دیمانەیەکی تایبەتییە.
پێغەمبەر (د.خ) لە حەدیسی دەجال فەرموویەتی هیچ کەس لە ئێوە خودا نابینێت هەتا دەمرێت، کەواتە تاسەباری ئەوەبێت کە ئەم سیفەتەی هەیە. هەرچەند خودا ئەوان دەبینێت و تاسەباری ئەوان بۆ بینینی خودا بەڵام پێگەکە رێنادات.
وەك ئەوەوایە کە دەڵێت :( حتى نعلم)) ﴿محمد:31﴾ لەگەڵ ئەوەی کە دەزانێت، خودا ئەم سیفەتە تایبەتییەی تەنیا دوای مردن پەیدادەبێت. تاسەبارییان پاراوە دەکرێتەوە، بۆئەو، وەك خودای مەزن لە ئاخاوتنی رارادا هاتووە ئەویش هەر سەبارەت ئەم بابەتەیە:( ما ترددت في شيء أنا فاعله كترددي في قبض عبدي المؤمن يكره الموت وأكره مساءلته ولا بد له من لقائي)) ﴿رارا نە بوومە لەهەر شتێك کەمن کردوومە، وەك رارابوونم لەوەرگرتنەوەی گیانی بڕوادارێك کەمردنی

لاناخۆشە و من زیان پێگەیاندنیم پێ ناخۆشەو هەردەشێت بگەرێتەوەلای من﴾.لەوەدا مژدەی دیدەنی پێدا.
ئەوەی پێی نەوت، کە هەردەبێت بمرێت، بۆ ئەوەی بەباس کردنی مردن پەژارەی نەداتێ. لەبەر ئەوەی تەنیا دوای مردن بەدیداری خودا دەگات وەك پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی:"ان احدکم لایری ربە حتی یموت"، ﴿واتە کەستان خودا نابینێت تا دەمرن( واتە دوای مردن دەیبینن)﴾. لەبەر ئەوە :"ولا بد لە من لقائی" تاسەباری خودا بۆ بوونی ئەم دانەپاڵەیە.

یَحِنُ الحبیب الی رؤیتی

وإنی الیە أشد حنینا

وتهفو النفوس ویأبی القچا

فأشکو الانین ویشکوا الانینا

﴿واتە خۆشەویست تاسەباری بینینی منە و من لەو زیاتر تاسەبارم کە ئاشکرای کرد لە( روح)ی خۆی فووی تێکردووە( نفخ فیە من روحە)، تاسەبارییەکەی تەنیا بۆ خۆی بوو. نابینیت لەوێنەی خۆی دروستی کردووە لەبەر ئەوەی لە( روح)ی ئەوە؟ لەبەر ئەوەی پەیدابوونی لەم چوار ستوونەوەیە کە لەجەستەیدان و تێکەڵەکان( اخلاط) ناسراون، لە فووکردنی گڕ لەوەی لە جەستەیدا هەڵگیرسا لە( شێ)وە، گیانی مرۆڤ ئاگر بوو بۆ پەیدابوونی، لەبەر ئەمەیە موسا لەوێنەی ئاگردا لەگەڵ خودا ئاخاوت پێداویستییەکەی لەودا بوو، کەر پەیدابوونی سروشت بوایە

گیانی ڕووناکی( نور)دەبوو. بە خوازە وشەی فووکردنی بەکارهێنا، ئاماژەیە کەوا لە خودی خوداوەیە( الرحمن)، بەم نەفەسە کە فووکردنە چاوگەکەی( =عینە) پاك کردەوە، بە ئامادەگی فووتێکراو، گڕسەندنەکە ئاگربوو نەك( نور)، لەوەدا هەناسەی خودا( =نفسی الحق) تێکەوت کە بەوەوە مرۆڤ بۆتە مرۆڤ.

دواتر کەسێکی( لەخۆی) بۆ داڕشت وەك خۆی ناوی نا ئافرەت، لەوێنەی خۆی دەرکەوت، سۆزی بۆ جوولاْ، سۆزی شت بۆ خۆی، ئەویش سۆزی بۆی جوولاْ سۆزی شت بۆ نیشتمانەکەی. ئافرەتی لا خۆشەویست کراوە، خودا ئەوەی لە شێوەی خۆی دروست کرد، خۆشەویست، مەلائیکەتەکانی نوورانی کڕنووش( سوجدە)ی پێبردن، لەگەڵ مەزنی ڕێزو پایەیان و بەرزی پەیدابوونی سرووشتیان. ئالەوێدا گونجان دەرکەوت، هاوچۆنیەکەی پەیدایە. وێنە مەزنترین ڕێکهات و شکۆدارترین و تەواوترینە: لەبەر ئەوەی جووتە واتە بوونی خودی کردە جووت، دووتا، وەك چۆن ئافرەت بەبوونی خۆی، پیاوی کردە جووت و دووتا سێیەکەی دەرکەوتن: خودا پیاو ئافرەت، پیاو ئارەزوو( سۆز، تاسەباری) بۆ پەروەردگارەکەی کرد، کە بنجییەتی، وەك چۆن ئافرەت بۆ ئەو هەیەتی. پەروەردگاری ئافرەتی لا خۆشەویست کرد، بەهەمان شێوەی خودا ئەوەی لەشێوەی ئەودایە خۆشویست.

خۆشەویستی ڕوونادات تەنیا بۆ ئەوەی کە ژێدەر( عین)یەتی.

خۆشەویستی بۆ ئەوەی لەوەوەیە ڕاستە( حق).

لەبەر ئەوە وتی:( حُبب)) نەی وت( أحببت) خۆشم ویست لە خۆیڕا، تا خۆشەویستییەکەی پەیوەست بێت بە پەروەردگارەکەی کە لەشێوەی ئەوە، هەتا لە خۆش ویستنی بۆ ئافرەتەکەی، ئەوا بەخۆشەویستی پێدانی بۆ ئەولەلای خوداوە بووە، بە خولّقاندنێکی خودایی، بۆ ئەو خۆشەویستییە. کە پیاو ئافرەتی خۆش ویست داوای پێ گەیشتنی کرد واتە، ئامانجی گەیشتنی کەلە خۆشەویستی دایە، لەوێنەی پێکهێنانی توخمەکەی گەورەترین شت گەیشتنە هاوسەری( النکاح)، لەبەر ئەوە شەهوەت هەموو پاژ( جزو) ەکانی دەگرێتەوە، لەبەر ئەوە فەرمانی بە خۆشوشتن داوە لەوە، پاگژی هەمووی دەگرێتەوە، وەك چۆن نەمان تیایدا( خناو) هەمووی گرتەوە لەکاتی جووت بوون( حصول الشهوە).
خودا( غیور) بەرگری لە بەندەکەی دەکات لەوەی باوەڕی وابێت چێژ لە جگە لە خۆی دەکات. بەشوشتن پاگژی کردەوە، تاوەك ئەوانەی لەودا فەنا بوون لێبێت، هەر ئەوە دەبێت.
ئەگەر پیاو خوا لە ئافرەتدا ببینێتەوە، بینینێکە لە( بەرتاوگیری= منفعل)، گەر لەخۆیدا بینی، لەرووی دەرکەوتنی ئافرەت لەوەوە،( کارا=فاعل) دا دەیبینێت.﴿فصوصی الحکم: ل 201-204﴾

نقێمە پەندیارییەکان

نقێمی عیسایی

( الفص العیسوی)

- نقێمی پەندی پێغەمبەرانە لە وشەی عیساییدا :

عن ماء مريم او عن نفخ جبرين

في صورة البشر الموجود من طين

( لەناوی مریەم یان فووی جبریلدا

لەوێنەی مرۆی لە قوڕ دروستکراودا)

تكون الروح في ذات مطهرة

من الطبيعة تدعوها بسجينِ

( لە خودێکی پاکیزەدا گیان گروا

لە سروشتێك ناوی دەنێت بەتۆکمە)

لاجل ذلك قد طال اقامته

فيها فزاد علي ألیف بتعين

( لەبەر ئەوە، مانەوەی درێژەی کێشا

تیایدا بە دروستی لە هەزار رەتبوو)

روح من الله لا من غيره فلذا

أحيا الموات و أنشأ الطير من الطين

( گیانێك لە خواوە نەك لەکەسی دیکە بۆیە

مردووی زیندوو کردەوەو باڵندەی دروستکرد لە قوڕ)

حتى يصبح له من ربه نسب

به يؤثّر في العالي وفي الدون

( تا لە پەروەردگاریدا دانەپاڵی هەبێت

بەوە شانازی دەکات لە بالآو لە نەویدا)1

الله طهره جسما و نزهه

روحا وصيره مثلاً بتكوينِ

( خودا لەجەستەدا پاکی کردەوە و بێ خەوش

لە گیانداو لە بووندا هاوچۆن)

بزانە لە تایبەتمەندییەکانی گیانە کەوا بکەوێتە سەر هەر شتێك گیانی بە بەر دەکات و ژیانی تێدەگەڕێت.

هەر لەبەرئەوەش بوو سامیری چەنگێکی لە جێماوی پێغەمبەر کە جبرائیل( سەلامی خوای لێبێت) بوو کە گیانە.

سامیری ئەوەی دەزانی. کە زانی جبرائیلە، زانی ژیان لەو شتانەدا گەڕاوە کەپای خستووتە سەر،( فقبض قبضة) چەنگێکی هەڵگرت لە جێ پێی پێغەمبەر( لە زمانی عەرەبیدا( قبض) بە( قبظ)ش دێت واتە پڕ بە هەردوو دەستی و پەنجەکانی بەسەر گوێرەکەکەی داکرد و ئەویش وەك گوێرەکە بۆڕاندی،

1- ( فصوصی الحکم، منشورات محمد علي بيضون- دارالكتب العلمية- بيروت- لبنان- ط1، 2003م - 1424ه، ص124)

دەنگی چێڵ بۆ راندنە، گەر لە وێنەیەکی دیکەدا بوایە، ناوی دەنگەکە بۆ وێنە دەگەڕایەوە وەك دەنگی وشتر یان بەران وباعە بۆ بەرخ و دەنگ بۆ مرۆڤ یان بێژە یان ئاخاوتن. ئەو رادە ژیانەی لە شتاندایە ناو نراوە لاهوت، ناسووت ئەو شوێنەیە کە ئەو گیانەی تێدایە، ناو نراوە گیان بەوەی کردوویەتی.

لەو کاتەیدا گیانی ئەمین کە جبرائیلە شێوەی مرۆڤی وەرگرت بۆ مریەم سەلامی خوایان لێ بێت. گومانی برد مرۆڤەو دەیەوێت دەستدرێژی بکات، پەنا ی وەبەر خودا هێناو بەکۆ هەستی داوای کرد خودا رزگاری بکات بەهۆی ئەوەی دەزانێت ئەوە کاری نەشیاوە.

ئامادەگی تەواوی لەگەڵ خودادا روویدا کە گیانی مەعنەوییە، گەر لەم ساتەدا فووی تێکردبا لەم حاڵەتەدا عیسا سەلامی خوای لێ بێت. کەس خۆی بۆ نەگیرا بەهۆ ناکۆکی دروستکردنی بۆ حاڵەتی دایکی.

بەلآم ئەویش گوتی: ( إنما انا رسول ربك))

( لاهب لك غلاماً زكيا))( مريم:19)

لەم تەنگەژەیەدا خاو بۆوەو سینەی کرایەوەو لەو کاتەدا فووی تێکرد عیسا دەرچوو.

جبرائيل وشە( كلمة)ی خودا بۆ مریەم دەگوازتەوە وەك چۆن پێغەمبەر وشەی خودا بۆ نەتەوەكەی دەگوازێتەوە. كە دەڵێت:

( وكلمته القاها الى مريم و روح منه))

( النساء: 171)

شەهوەت لە مریەمدا گەڕا جەستەی عیسای دروست بوو و لە ناوێكی دروست، لە شێوەی مرۆڤ دەرچوو بۆ دایكی، بۆ ئەوەی جبرائیل لە شێوەی مرۆڤ بوو بۆ ئەوەی ئەم جۆرە پەیدابوونە لەم جۆرە مرۆڤە تەنیا دەباوا رووبدات. عیسا مردووان زیندوو دەكاتەوە چونكە گیانێكی خودا ییە( روح الهی)، زیندوو كردنەوەكە بۆ خودایەو فوو تێكردنەكە بۆ عیسا وەك چۆن فوو تێكردنەكە بۆ جبریل بوو وشەكە بۆ خودا( كلمة الله).

زیندوو كردنەوەی مردووان لە لایەن عیسا سەلامی خوای لێ بێت، زیندوو كردنەوەیەكی دروستە لەو رووەی لە فوو كردنەوەكەوەیە( نفخ) وەك چۆن ئەو لە وێنەی دایكی دەركەوت: زیندوو كردنەوەكەش واهیمەی ئەوەی لا دروست كرد كە لەوەوەیە، بەلاّم لە خوداوەیە.

**پێغەمبەرایەتی لە نقێمەکانی پەندیاریدا**

**دەسپێك**

**لایەنی فەلسەفی لە سۆفیگەریدا، لایەنێکی نوێیە لە لێکۆڵینەوە هاوچاخەکاندا ، چی رۆژهەلآتی و چی رۆژئاوایی.**

**زۆر لە لێکۆڵەران خۆیان لەو مەیدانەکشاندەوە بەهۆی زمانی سیمبولکارانەی زۆر داخراوی سۆفیگەریی فەلسەفی، بە پاساوی ئەوەی نەکەوێتە دەست کەسانێك شایانی ئەو واتا مەزنانە نەبن. ئەوەو چەندان هۆکاری دی وایدەکرد دوورکەونەوە لەو بوارە، کەچی لایەنێکی زۆر گرنگە و شایانی بایەخپێدانە. (1)**

**لەم بەشەدا باس لە دۆزینەوەی جیهانی پێغەمبەرایەتی و دەرکەوتنیان لە نقێمەکاندا( الفصوص ) دەخەینەڕوو.**

پێغەمبەرایەتی دیاردەیەکی گشتییە لەسەر ئاستی جیهان کاری لەسەر کراوەو، زۆربەی گەلان بەجۆرێك لە جۆرەکانی شێوازێکی:( وەرگرتنی سرووشیان لە خوداوەندان)) ( 2) یان هەبوو
کەواتە زۆر سروشتییە هزری ئیسلامی لەسەر بنەمای پێغەمبەرایەتی – بنیاتێك رۆبنێت- بگاتە کەشکەشانی ئاسمان. ئەویش لەسەر دوو کۆڵەگە: قورئانی پیرۆزو ژیاننامەی پێغەمبەر محەمەد کوڕی عەبدوڵلاّ( (د.خ).
لەبەرامبەر ئەمەشدا، خوانەناسان، پێغەمبەرایەتیان کردە ئامانجی ئینکارکردن!
ئەوەتا د. عبدولڕەحمان بەدەوی ئاماژە بەوە دەکات کەوا( دیاردەی خوانەناسی مەترسیدارترین دیاردەی پەرەسەندنی ژیانی گیانییە... گەر خوانەناسی یۆنانی و رۆژئاوایی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی خوداوەندیەتی دامەزراوە، ئەوا خوانەناسی عەرەبی لەسەر نەهێشتنی بیرۆکەی پێغەمبەرو پێغەمبەرایەتی و هەڵوەشاندنەوە یان دامەزراوە.... دیارە پێغەمبەران لە ژیانی ئایینی... رۆڵێکی گەورە دەگێڕن...

-1[القشيري: الرسالة القشيرية، تحقيق د.عبدالحليم محمود( دار الكتب الحديثة – القاهرة 187/1 ]
[2- د.على مبروك: النبوة من علم العقائد الى فلسفة التاريخ، محاولة في اعادة بناء العقائد( دار التنوير – بيروت 1993 ) ص56. ]

**کەواتە: ئایین و ئاییندارییی بەگشتی، لەسەر بیرۆکەی پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران دامەزراوە. ( 1 )**

**ئەوەتا خەیات( الخیاط)ی موعتەزیلی کە وەڵامی بەناوبانگترین خوانەناس بیری ئیسلامی دەداتەوە: ئیبن راوەندی( ابن الراوندی)، کتێبەکەی( الانتصار) بە لێدوانەکانی ئیبن راوەندی دەستپێدەکات سەبارەت ئینکارکردنی پەیام و پەیامبەری( 2).**

**1- د. عبالرحمن بدوي: من تاريخ الالحاد في الاسلام( سيناللنشر- القاهرة 1993 ) ص7]**

**2- الخياط: كتاب الانتصار والرد على ابن الراوندي الملحد، تحقيق د. ينبرج( الدار العربية للكتاب- بيروت 1993 ص25 ]**

**سۆفیگەری و پێغەمبەرایەتی :**

**لەسەرەتاکانی سەرهەڵدانی سۆفیگەری ئیسلامی بایەخی زۆر بە مەسەلەی پێغەمبەرایەتی نەدەدرا، ئامانجی دیکە هەبوو زیاتر گرنگی هەبوو و تەوەرە بوو.**

**یەکەم بایەخدان بە پێغەمبەرایەتی لای سۆفیان لای( حەکیمی ترمزی = الحکیم الترمزي) کە لە 320 کۆچی مردووە، لە کتێبەکەی( ختم الاولیاء)دا بایەخی بەم مەسەلەیە داوە، بۆ یەکەمجار لە مێژووی سۆفیگەریدا، باس لە( خاتم)( ختم) خاتەمی ئەولیایان دەکات وەك چۆن پێغەمبەران**

خاتەمیان هەیە، ئەم بیرۆکەیەشی بووە هۆی ئەوەی حەکیمی ترمزی لەسەر بچەوسێتەوەو ئازاری بدەن.

ئەم بیرۆکەیە قۆناخ بە قۆناخ پەرەی سەند تا لەسەر دەستی بن عەرەبی گەیشتە چلەپۆپە، بن عەرەبی تیۆرییەکی تەواوی لەبارەی پێغەبەرایەتی، پەیامی پێشکاریی( الولایە) پێشکەش کرد

هەر لەم چوار چێوەیەدا ئەبی غەیس کوڕی جەمیل( ابی الغیث بن جمیل) وتوویەتی: خضنابحراً وقف الانبیاء علی ساحله ( 1)

واتە لە دەریایەك پەڕینەوە کە پێغەمبەران لە کەناریدا وەستاون.

ئیبن جەمیل هاوچاخی بن عەرەبی بوو لە یەمەن ژیاو هەر لەوێش ساڵی 651کۆچی مرد، واتە سێزدە ساڵ دوای بن عەرەبی.

بن عەرەبی لە رێگای تیۆرییەکی هێمن و قووڵ باس لە پێغەمبەرایەتی کردووە، لەزۆر کتێباندا بە پەرتی باسی کردووە جگە لە نقێمەکان.

بەم جۆرە پێویستە شیکارانە لە دەقەکانی پەیوەست بەم بابەتە بکۆڵینەوەو وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

سروشتی پێغەمبەرایەتی بە بۆچوونی بن عەرەبی چییە؟ چی پەیوەندییەکی هەیە بە ولایەت- پێشکاری ؟ چۆن باس لە پێغەمبەران دەکات؟ ئایا بۆ تەنیا( 27) نقێم ؟ ئایا نقێمێکی نهێنی هەیە کە( 28)ەم بێت؟

لەگەڵ ناوبانگی گەورەی کتێبەکانی بن عەرەبی ، بەڵام دوو کتێب بەتایبەتی بەشی شێریان لە پەسەندکردن و بایەخ پێدان بەرکەوتووە لای توێژەرو سۆفیان .

[ 1– الصوفية و الفقهاء في اليمن، للحبشى ص32، طبقات الخواص ، للشرجي الزبيدي ، ص406 ]

**فتوحاتی مەکیه و فسووسی حیکەم**
**( الفتوحات المكيه و فصوص الحكم ).**

**کتێبی فتوحات ، ئینسایکلۆپیدیایەکی گەورەیە، 37 بەرگە 560 دەروو( باب)ی تێدایە، دەریایەکە لە زانیاری سۆفیگەری.**

**هەمیشە دەیوت ئەم کتێبە,کە بە ( مدد الهي ونفث الهامي والقاء رباني )) نووسیوە.**

**کتێبی نقێمە پەندەکان( فصوص الحكم)، سەدرەدینی قونیەوی – شاگردی بن عەرەبی- لەبارەیەوە دەڵێت: من انفس مختصرات شيخنا... وهو من خواتم منشاته و أواخر تنزلاته، ورد من منبع المقام المحمدى والمشرب الذاتي والجمع الاحدى، فجاء مشتملاً على زبدة ذوق نبينا ( 1).**

**ئەم کتێبە لە ئاڵۆزترین دەقی سۆفیەکانە، لە هەمووان چڕوپڕ سیمبول ترو پڕ ئەفسوون ترە!**

**ئەوەتا لە پێشەکیەکەدا دەڵێت:**

**فمنَ الله فاسمعوا**
**والى الله فارجعوا**
**فإذا ماسمعتم**
**ما أتيت به فعوا**

**ئەوەتا د. ئەبو العلا عفیفی لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت: کتێبی( الفصو ( لە گەورەترین دانراوەکانی بن عەرەبییە، لە هەمووان قووڵترە، لە هەمووان کاریگەرترە لە پێکهێنانی باوەڕی سۆفیگەری چاخی خۆی و نەوکانی دواتر( 1)**

**کتێبی نقێمەکان ساڵی 627 کۆچی نووسراوە، فتوحات لە دوو قۆناخدا نووسراوە، ساڵی 629 کۆچی، جاری دووەم ساڵی 636کۆچی،**

**فتوحات سەرەتا نامەیەکی سادە بوو بن عەرەبی بۆ برادەرەکەی عەبدولعەزیز مەهدەوی( عبدالعزیز المهدوی) لەکاتی کە بن عەرەبی لە ساڵی 597 کۆچی لە مەکە بوو.**

**دواتر لە دیمەشق تەواوی کردو لە 629 کۆتایی هات – واتە دوای نقێمەکان- دواتر لە چوار ساڵی نێوان 632، 636 کۆچی دووبارە نووسییەوە ( 2)**

[ 1- د. أبو العلا عفيفي: مقدمة فصوص الحكم، ص7 ]

[ 2- د.عثمان يحی: مؤلفات ابن عربي ، ص434 ]

**شایانی باسە تا ئێستا 112 جار راڤەکراوەتەوە وەك د. عثمان يحی باس دەکات( 1)**

**پەراوێزی رابردوو).**

**گرنگترین راڤەکانی – راڤەی عەبدلباقی مفتاح بەناونیشانی( مفاتیح الفصوص) بە پێی رێبازی حسابی ئەو نهێنی ژمارەکان راڤەی کردووە.**

- راڤەی سەدرەدین قونیوی .
- راڤەی داود قەیسەری( مطلع فصوص الكلم فی شرح فصوص الحكم)
- راڤەی عەبدولرەحمان جاس( نقد الفصوص فی شرح نقش الفصوص)
كتێبی نقێمەكان لە دەسپێكێكی كورت و بیست و حەوت دەروو پێكهاتووە، هەر دەروویێك نقێمێكە ، یان دورو گەوهەرێكە .
-پەندێكی نهێنی پێشان دەدات بن عەرەبی لەبارەی راستەقینەی پێغەمبەرایەتی دۆزیویەتیەوە.
هەر وشەیەك پەیوەستە بە پێغەمبەرێك نقێمەكان بەم شێویەن.
1-نقێمی پەندی خودایی لە وشەیەكی ئادەمیدا .
2-نقێمی پەندی فووكاریی لە وشەیەكی شەیئیدا .
3-نقێمی پەندی گزنگانە لە وشەیەكی نووحیدا .
4-نقێمی پەندی پیرۆزكاری لە وشەیەكی ئیدریسیدا .
5-نقێمی پەندی زاڵكاری لە وشەیەكی ئیبراهیمیدا .
6-نقێمی پەندی راستیدا لە وشەیەكی ئیسحاقیدا .
7-نقێمی پەندی بالآیی لە وشەیەكی ئیسماعیلیدا .
8-نقێمی پەندی گیانی لە وشەیەكی یەعقوبیدا .
9-نقێمی پەندی رۆشنی لە وشەیەكی یوسفیدا .
10- نقێمی پەندی تاكایەتی لە وشەیەكی هوودیدا .
11- نقێمی پەندی كردگاری لە وشەیەكی ساڵحیدا .
12- نقێمی پەندی دڵی لە وشەیەكی شوعەیبیدا .
13- نقێمی پەندی مەكی لە وشەیەكی لوتیدا .

14- نقێمی پەندی قەدەری لە وشەیەکی عەزیزیدا .

15- نقێمی پەندی پێغەمبەری لە وشەیەکی عیساییدا .

16- نقێمی پەندی میهرەبانی لە وشەیەکی سلێمانیدا.

17- نقێمی پەندی بوونەکی لە وشەیەکی داودیدا .

18- نقێمی پەندی دەروونی لە وشەیەکی یونسیدا .

19- نقێمی پەندی وندایی لە وشەیەکی ئەیبویدا .

20- نقێمی پەندی شکۆیی لە وشەیەکی یەحیایدا .

21- نقێمی پەندی بووونداری لە وشەیەکی زەکەریاییدا .

22- نقێمی پەندی هاودەنگی لە وشەیەکی ئیلیاسیدا .

23- نقێمی پەندی چاکەخوازی لە وشەیەکی لوقمانیدا .

24- نقێمی پەندی پێشەوایی لە وشەیەکی هارونیدا .

25- نقێمی پەندی بالآیی لە وشەیەکی موساییدا .

26- نقێمی پەندی خوڕاگری لە وشەیەکی خالیدیدا .

27- نقێمی پەندی تاکایەتی لە وشەیەکی محەمەدیدا .

([153]).

---

[153] محی الدین بن العربی : فصوصی الحکم،تحقیق و شرح الدکتور نواف الجراح،دار صادر،بیروت،لبنان،الگبعه الاولی 1426هـ-2005م ،ص11. .

کتێبی (الاسراء)ی بن عەرەبی کاریگەری لەسەر (کۆمیدیای خودایی ) دانتی هەبوو.

دیوانی تەرجەمانی ئەشواق (دەربڕی تاسە)((ترجمان الاشواق)) دیوانێکی غەزەلیی ناسکە , لەدووتوێیدا شیعرەکانی بن عەرەبی تێدایە سەبارەت کچێك بەناوی نیزام (النظام) کچی شێخی خۆی (مەکینەدین

[154] -امين يوسف عودة, تاويل الشعرو فلسفة عند الصوفية (ابن عربی), چ1؛ 1995 رابگه الكتاب الاردنيين ,عمان الاردن.

ئەبی شوجاع کوڕی ڕۆستەم) دڵبەندی بوو, وێنەیەك لەجوانی هاتەبەرچاو, دەریای شیعری خۆشەویستی و سوز لەزمان و دڵ و قەڵەمی بن عەرەبی هەڵڕژان, تەرجەمان, تەرجەمەیەکی راست و دروستی دڵی ئەم پیرە بوو.

سەرەرای شیعرەکان راڤەو لێکدانەوەشی بۆ شیعرەکان کردووە بەناوی (ذخائر الاعلاق), لێکدانەوەیەکی سۆفیانەیە بۆ شیعر[155] بەهۆی ئەوەی سروشتی هزری سۆفیگەری جۆرێکە لەئاشکرابینی و زانینی چێژەکی , واتە بەرنامەی لێگەڕانەکی و شیکاری, دەخرێتە لاوە, بەهۆی ئەوەی دنیای چێژ تایبەتمەندی خۆی هەیە.

---

155 –د. زکی نجیب محمود: طریقة الرمز عند ابن عربي في دیوانه, مقال ضمن (الکتاب التذکاري) محیی الدین بن عربي في الذکری المئویة لمیلاده.

## سێیەم چرای جیهانی سۆفیگەری
## جەلالەدین محەمەدی بەلخی ناسراو بە
## مەولانای رۆمی
## 604-672ك \\1207-1273 ز



باسی سێیەم

سێیەم چرای جیهانی سۆفیگەری

جەلالەدین محەمەدی بەلخی ناسراو بە

مەولانای رۆمی

604-672ك \\ 1207 -1273 ز

توێژینەوە لەژیان و بەرهەم و ئەزموونی سۆفییێکی گەورەی جیهانی سۆفیزم پیری بیرمەند وشاعیر، مەولانای سۆفی و شێری فەلسەفەو خوداوەند پەرستی جەلالەددین رۆمی، مەزنێك بوو لەسەروو زانایانی چاخی خۆی بوو،لەدنیای سۆفیگەری رۆچوو تاقوولاّیی بوونگەرایی، لەمەلەوانانی دەریای فەلسەفەو تەوحید لەهەمووانی بردۆتەوە. وێنای کەسێك ناکرێ لەگۆشت و خوێن بێت و وەك هۆنراوە و هەڵبەستەکانی ئەو بڵێتەوە، یان هیچ شاعیرێك بگاتە هێزی دەربڕینی ئەم راستیخوازە سۆفیگەرە مەزنە پێگەیشتووە.هۆنەرێکی مرۆڤایەتی تاکانەیە، کێلە رێگەیەکی بەرزی زانست وهزری شارستانی ئیسلامییە، بەکولتووره هزری و هونەرییەکەی کولتووری مرۆیی دەوڵەمەند کرد.

بەشی یەکەم:

سەرەتای تەمەن و خوێندن

جەلالەددین محەمەد کوڕی محەمەدی بەلخی و دواتر قونیەوی، ناسراو بەمەولانای ڕۆمی لەڕۆژی 6ی رەبیع ولئەوەلی 604 ك ( 30سێپتێمبەر( ئەیلوولی ) ی 1207ز) لەبەلخ لەدایك بووە[156].

نازناوی رۆمی لێنراوە لەبەرئەوەی زۆربەی ژیانی لەئەرزەرۆم ( ولاّتی ئەنادۆل ) بەسەربردووە، باوکی ناوی محمد کوڕی حسێن خەتیبی بوو، نازناوی بەهائەددین وەلەدی هەبوو. لەلایەنی باوکییەوە جەلالەددین دەچووە سەر ئەبوبەکری سدیق، لەلایەنی دایکییەوە دەچۆوە سەر خانەوادەی خەوارزم شاە کەوا فەرمانڕەوایی ئەودیو زێ ( ماوەرائەلنەهر ) ی دەکردو چەندان ناوچەی دیکەی دەکەوتنە کەوشەنی.

لەوکاتەیدا ساڵی ( 616ك ) ( 1219م ) هەڵمەتەکانی مەغۆلەکان بەسەرۆکایەتی جەنگیزخان بۆ سەر رۆژهەلاّتی ئیسلامی دەستی پێکرد واتە سەرەتای سەدەی حەوتی کۆچی ( سێزدەی زاینی ) بەبیانووی ئەوەی گوایە خەوارزمییەکان کۆمەڵە بازرگانێکی ئەوانیان کوشتووە، لەورۆژگاراندا دەسەلاّتی خەواریزمییەکان بێهێز بوو، خۆی لەبەردەم ئەم هەڵمەتە نەگرت، سوڵتان عەلائەددین محەمەد، هەلاّت لەدوورگەیەکی چۆلی دەریای قەزوین خۆی حەشاردا. ژن و دایکیان بەدیل گرتن و لەناو ماڵی میرە مەغۆلەکان خزمەتکارییان دەکرد.

---

156 –بديع الزمان فروزانفر: من بلخ الى قونيه، سيره حياه مولانا جلال الدين الرومى، ترجمه: الدكتور عيسى على العاكوب، الگبعه الاولى، ايار( مايو ) 2006م، دار الفكر بدمشق، سوريا.

باوکی جەلالەددین لەشاری بە لخ دەژیاو زانایەکی ئاینی پایەبەرز بوو، لە پەیڕەوەکانی راڕەوی (مەزهەبی) حەنەفی بوو. پلەو پایەیەکی بەرزی هەبوو بۆ یە ناونرابوو بە سوڵتانی زانایان.

لەرۆژگاری خۆیدا هەڵمەتی کردە سەر فەیلەسوفان و بیژیاران (المتکلمون). لەئاکامی هەڵمەتی سەربازی مەغۆلەکان بەهائەددین وەلەد ناچاربوو بە لخ بەجێ بهێڵێت، بەخانەوادەوە لەساڵی 609 ك کۆچ بکات، لەمبارەیەوە، زۆر قسە دەکرێت، هەیە دەڵێت لەگەڵ فەرمانداری وڵات کەوتە ناکۆکی لەلایەن (عەلائەددین محەمەد خوارزمشا) گوشاری خرایە سەرو تەنگە تاوکرا[157] بۆیە رەوی کرد، هەیە دەڵێت وڵاتی خۆی بەجێهێشت لەبەرئەوەی هەستی بەهێرشی مەغۆلەکان کرد. لەم کاتی دا جەلالەددین هێشتا تەمەنی پێنج ساڵان بوو، خانەوادەکەی لەشارێك بۆ شارێکی دیکە دەیانگواستەوە. لەنیسا پوورگەیشتنە حزوری سۆفیگەری بەناوبانگ فەریدەدین عەتار، باس وایە گوایە منداڵەکەی لەئامێز گرتووە و، دانەیەك لەهۆنراوەکانی پێشکەشکردووە بەناوی (اسرارنامە)، پێشبینی کردووە کەوا دەبێتە خاوەن پایەی بڵند لە سۆفیگەری. لەنیسا پوور ئەم بنەماڵە لە 1220ز/609 کۆچی چوون بۆ بەغداو دواتر بۆمەکە.

لەوێشەوە بۆ مەلاتییە لەتورکیاو چوار ساڵ لەوێ مانەوە، دواتر چوون بۆ لارەندە(کرمان) ی ئێستا، حەوت ساڵیش لەوێ مانەوە کەلەلارندە بوون تەمەنی 21 ساڵان بوو، لەوێ ژنی هێنا، کچی (لالاشەرەفەددین سەمەرقەندی) هێنا ودووکوڕی لێ بوو (عەلائەددین)و (بەهائەددین سوڵتان وەلەد) عەلائەددین لەئاژاوەی کوشتنی شەمسی تەبریزی کوژرا[158]، لەوێوە بەرەو قونیێ کەوتنە رێ، لەقونییێ تورکیای

---

[157] -ادوارد جرانڤيل براون: تاريخ الادب في ايران من االفردوسي الى السعدي، ترجمة د.ابراهيم امين الشواربي، مطبعة السعادة بمصر، 1373=1954م، ل654.

158 -هەمان سەرچاوەل 654-655.

ئەمرۆدا جێگیر بوون . لەوکاتیدا سوڵتان سەلجووقی بوو( عەلائەددین کەیقوباد )[159]، یەکێك بوو لەسەلجوقییەکانی ئاسیای بچووك.

چوونە بەر خوێندن:

کەبەهائەددین کۆچی دوایی کرد شوێنی باوکی گرتەوەو بوو بەموفتی و بە پێی شەریعەت رێنمایی و ئامۆژگاری دەکرد.تابورهانەددین موحەقیقی ترمزی هات لەساڵی 629ی کۆچی گەیشتە قونیە. لەوکاتیدا جەلالەددین چوو بووو بۆ لارەند، لە (ئیعتیکاف ) پەناگری دابوو لەمزگەوتی سنجاری. ترمزی نامەیەکی بۆنارد تابگەڕێتەوە بۆ قونیە. کەگەڕایەوە، بۆ ماوەی نۆساڵ وانەی سۆفیگەری لاخوێند تاساڵی 638ی کۆچی .

مەولانا لەدیمەشقدا:

مەولانا حەوت ساڵ لەدیمەشق مایەوە لەهەمان کات بن عەرەبی لەدوا قۆناغەکانی ژیانی دابوو لەوشارە.

هەیەدەڵێت بۆ یەکەمجار مەولانا شەمسی لێرەدا بینیوە هەرلەبەر ئەوەشە دووجار چووە بۆ دیمەشق لە 645و 647ی کۆچی ومنداڵەکانی ناردووە بۆ ئەویٚ بۆخوێندن .

ئەوەتا دەڵێت:

لەچیای (صالح) کانگایەك لەجەواهیر هەیە

و بەهۆی ئەم جەواهیرە

ئێمە نوقمی دەریای دیمەشقین.

---

[159] -هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل 654-655.

واتە مەبە ستی بن عەرەبی بووە کەمەزارگەی محێدین بن عەرەبی لەسالْحیەی دیمەشقە.

مەولانا کەگەیشتە دیمەشق لەفێرگەی (المقدسیە) مایەوە لەوێ (الهدایە)ی لەزانستمەندی (فیقە) خوێندووەو لەلای محێدین بن عەرەبی ئامادەبووە[160] . روایەت هەیە دەڵێت:

مەولانا کەلەگەڵ باوکی هاتبوو بۆشام سەردانی شێخ محێدین بن عەرەبی کردووەو، بن عەرەبی لەکاتی چوونە دەرەوەی مەولانا کە لەدوای باوکی رۆیشتووە وتوویەتی:

ئۆقیانووس لەدوای دەریاچە دەڕوات(( سبحان الله! محیط یمشي وراء بحیرة)).هەندێ دەڵێن تەنیا چوار ساڵ لە دیمەشق مایەوەو ئامادەی مردنی برهان الدین محقق (638کۆچی) بوو.

گەڕانەوەی مەولانا بۆ رۆم:

هەیە دەڵێ دوای حەوت ساڵ لەحەلەب و دیمەشق گەڕایەوە بۆ قونیە، سەرەتا گەیشتە قەیسەرییە، پێشوازیەکی گەرم کرا،دواتر خەریکی خەلوە بوو، بەبڕیاری بورهانەددین سێ خەلوەی لەدوای یەکی ئەنجامدا و نهێنییەکانی پێشکاری (ولایە) ی پێدرا.

نزیکەی ساڵی 629ی کۆچی گەڕایەوە بۆ رۆم بورهانەددین لەقەیسەرییە مرد، شەمسەددینی ئەسفەهانی مەولانای لەوە ئاگادارکردەوە، مەولانا

[160] -موحیدەدین محەمەد کوڕی عەلی بن عەرەبی ( 560ک=1165ز-618ک=1221ز)، محي الدین بن عربي : تفسیر القران الکریم، تحقیق: جماعة من العلماء،المجلد الاول، دار الاندلس، بیروت،الطبعة الثالثة، 1401ک-1981م.

چوو بۆ قەیسەرییە و هاتەوە قونیە. سەلاحەددین نازناوی (سید سرِدان) بوو واتە (سەروەی نهێنی زان).

**مەولانا دوای مردنی بورهان محقق:**

دوای مردنی بورهانەددین، مەولانا دەستی بەتەدریس و ئیرشاد کرد، ماوەی نزیکەی پێنج ساڵ، واتە لەساڵی 638تا 642ی کۆچی، دەستی بەوانەوتنەوەی ئاینزانی کردلەفێرگەدا. هەر رۆژەی نزیکەی 400فێرخوازی هەبوو دەهاتنە فێرگەو مەجلیسی وی.

سوڵتان وەلەد لەمبارەوە دەڵێت:

زیاتر لەدەهەزار موریدی هەبوو هەرچەند هەندێکیان لەسەرەتادا راستگۆنەبوون.[161]

[161] -بدیع الزمان...هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**بەشی دووەم:**

**دەرکەوتنی شەمسی تەبریزی:**

**شەمسەددین محمد کوڕی عەلی کوڕی مەلەکداد، خەڵکی تەبریز بوو، ریوایەت هەیە دەڵێت لەرەچەڵەکی جەلالەددینی ناسراو بە (نو موسڵمان) ی بوزرگ ئونمیدکەفەرمانڕەوای (ئەلموت) بوو لەنێوان ساڵانی 607و 618ی کۆچی.**

**شەمس کەهاتە قونیە واتە لەساڵی 642ی کۆچی لەتەمەنی شەست ساڵیدا بوو کەواتە لەدایك بوونی دەبێ لەساڵی 582ی کۆچی، لەسەرەتادا موریدی شێخ ئەبی بەکری زەنبیل باف بوو، هەمیشە لەگەڕاندابوو، لەبەرئەوە ناوی (شمس پرندە=شمس الطائر) (شەمسی فڕندە )ی لێنرابوو.[162] موریدی شێخ بەهائەددین زەکریای سوڵتان بوو(سوڵتان لەولأتی) شەمس، پێش ئەوەی بێتە قونیە لەشارو لادێکان دەگەڕا، لەحەلەب چواردە مانگ بیرکاری خوێندووە[163] بەردەوام لبادێکی رەشی دەبەردابوو، پێیان دەوت (کامیلی تەبریزی).**

---

**162 -الفرق الصوفیة –سەرچاوەی پێشوو.**

**163 - مناقب الافلاکی.**

شەمس لەگەشتەکانی کەگەیشتە بەغداو چووە دیداری شێخ ئەوحەدەدینی کرمانی، کەپیری خانەقایەکی بەغدا بوو، ئەوحەدەدین ئەبو حامد، یان حامد کرمانی، سۆفیەکی سەدەی حەوتەمی کۆچی بوو، پەیوەندی لەگەڵ محێدین بن عەرەبی هەبووەمحێدین بن عەرەبی لە (باب الثامن) دەرووی هەشتەم لەکتێبی (الفتوحات المکیە) داباسی کردووە، رارەوەکەی ئیشقی رواڵەت بوو، لەساڵی 632ی کۆچی خەلیفەی عەباسی موستەنسیر کردیە پیری خانەقا(رباط)ی مەرزەبانی. شەمس لە رارەوی کرمانی رازی نەبوو. شەمس داوای دەکرد، واز لە (قال فلان عن فلان)بێنن دەیوت: ئێوە پیاوی ئەم رۆژگارەن کوا نهێنییەکانتان کواقسەتان، دەبایەکێکتان بڵێ دڵم وای پێوتم کە بە ئیلهام لەخواوەی پێگەیشتووە.

کەگەیشتە قونیە هەر لەسەر ئەو رارەوەبوو بۆیە رێی مەولانای نەدا کتێبی بەهائەددین وەلەد بخوێنێتەوە، دەیویست رووبکاتە دڵی خۆی.

هاتنی شەمسی تەبرزیی بۆقونیەو دیداری مەولانا:

شەمس بەیانی رۆژی شەمووی (26)ی جەمادی ئاخەری ساڵی 642ی کۆچی گەیشتە قونیە لەخان دابەزی، ژورێکی بەکرێ گرت، دەرگای دادەخست، کلیلەکەی لەلەچکە دەسترێکی دەبەست و دەیخستە سەرشانی، تاوەك بازرگان بیناسن. لەژوورەکەدا تەنیا حەسیرێك و گۆسکە ئاوێکی هەبوو.

دیداری شەمس بەگێڕانەوەی ئەفلاکی:

ئەفلاکی دەڵێت ڕۆژێك لەرۆژان، مەولانا لەفێرگە، لەبازاڕی پەمۆ، سواری وڵاغێك بوو بوو، فێرخوازو زانایانی لەگەڵ دەڕۆیشتن، ناکاو شەمسی تەبریزی رووبەڕووی بوەوەوە، لەمەولانای پرسی کامیان مەزنترە: ئەبو زەید،یان پێغەمبەرمان مەزنترە؟

مەولانا وتی ئەوە چ پرسیارێکە! پێغەمبەرمان خاتەمولئەنبیایە، چ پەیوەندی بە ئەبوزەیدە؟

شەمس وتی: ئەدی نەتبیستوە ... دەڵێت: ((وما عرفناك حق معرفتك))

کەچی ئەبوزەید دەڵێت: ((سبحان ....؟))

مەولاناحەپەساو سەرسام بوو بەم پرسیارەو، دەڵێن:

لەهۆشی خۆی چوو، کەبەئاگاهاتەوە، دەستی شەمسی گرت و بردیە فێرگەکەی، چووە ژووری خۆی لەگەڵ شەمس، تا چل رۆژ لێ نەگەڕا کەس بێتە ژوورەوە.

مەولانا لەم بارەیەوە ئاماژەی بەم یەکەم دیدەنییە کردووەو دەڵێت:

لەناکاو تۆم بینی هەموو گیانم بوو بەچاو

گیانم وەك باڵندەی شێتە بێ سنوور لەکەوشەنی تۆ دەگەڕێ.

لەسەحەر دا وەك مانگی لەخولگەدا دەرکەوت لەخولگە دابەزی و لەئێمەی روانی.

هەروەها دەڵێت:

دڵ لەسەد پەردە داماڵرا

بەجووتە گیان بۆگیان دانیشتن

گەر جبریل بهاتبایە نێوانیان

ئەوایەكترووکە لەئەمان دانەبوو لەبەر ئاگری!

دیداری شەمس ئاماژە لەشیعری مەولانا بەوەش هەیە:
گەر دە مۆم لەیەك شوێنداهەریەکەیان لەوی تریان جیاوازبێت ناکرێ ڕووناکییەکانیان لەیەك جیابکەیتەوە کەزەین دەدەیتە حەقیقەتی ڕووناکیەکە. گەرسەد سێوو سەد هەرمێ بژمێری، سەد دەردەکەون، بەلاّم گەربیان گوشی دەبنە یەك.
مەولانا لەم بارەیەوە دەڵێت: تێنوو دەڵێت کوا ئاوی سازگار؟ ئاویش دەڵێت کوا ئاو خۆر؟ واتە مەولانا بەدوای پیاوانی خودا پەرست دەگەڕا، لەدڵەوە تاسەی ئەم دیدارە بوو.
مەولانا لەنووری شەمسدا ونبوو، لەیارانی دابڕا، خزم و یاوەرانی بەچاوی گومان سەیری شەمسیان دەکرد. تارادەی رك و کینە، تارادەی ئەوەی بەجادوگەریان داناو گوایە جادووی لەمەولانا کردووە. تائێستاش لەنێو کوردەواری باوە دەڵێن (وەك جەلالەدینی ڕۆمی کەوتە دەست جادووگەران).
گەشتی شەمس بۆ دیمەشق:
شەمس لەوبارە نارەحەت بوو، چوو بۆ دیمەشق. مەولانا لەوبارەیەوە وتوویەتی: لە(ڕۆژی پێنج شەم بیست و یەکی مانگی شەوال ساڵی 643ی کۆچی چووە بۆ دیمەشق،. واتە یەکەم دیدار لەنێوان مەولاناو شەمس شازدە مانگ بووە. شەمس لە26ی جماد الاخری ساڵی 642ی کۆچی هات

بۆ قونیەو چوو بۆ دیمەشق لە 21/شەوال/643ك. مەولانا نامە لەدوای نامەی بۆ دەنارد دوای ئەوەی زانی لەدیمەشقە لەنامەیەکیدا دەڵێت:

ئەی نوری نێو دڵ، وەرە

ئامانجی سۆزو خواست وەرە

دەزانی ژیانمان لەدەست تۆدایە

لەبەندە دنیا تەنگ مەکە، وەرە

ئەی سلێمان، هودهودهات

بفەرموو تاسەبارم، وەرە

چەندان نامەی پڕ جۆش و خرۆشی بە نوری مەولانا کوڕەکەی سوڵتان وەلەدی نارد بەدوایدا، شەمس پازدە مانگ لەدیمەشق مایەوە (لە 643 ڕۆیشت لە 644 هاتەوە).

گەڕانەوەی شەمس:

شەمس لەساڵی (644ك) گەڕایەوە بۆ قونیە، بەڵام باری گشتی خراپتر بوو، دەیان وت مەولانا شێت بووە، شەمس جادووگەرە.

-مەولانا لەبری تەدریس و ئامۆژگاری رووی کردە بیستن و سەما

-جلکی خۆی گۆڕی (جلکی زانایان) بڕیاری دا جلکی (هیندباری) بۆ بدوورن، کلاّوێکی لەخوریی قاوەیی لەسەرنا، جامانەیەکی گورینگ دار (شەکەر ئاوێزدار)ی لەسەرنا. ڕەبابەیەکی شەش پێگەی بۆ دروست کرا دواتر سیماعی دانا، شەوو ڕۆژ خەریکی وەجدو سیماع بوو.

لەئاکامدا گرووپێك دەڵێن کوڕێکی مەولاناشیان لەگەڵ بوو شەمسیان کوشت. بەڵام سوڵتان وەلەد دەڵێت شەمس لەبەرچاوان ون بوو.

**گەشتی مەولانا بۆ دیمەشق بەدوای شەمس**

**مەولانا چوو بۆ دیمەشق و لە شیعرەکانی رەنگی داوەتەوە کەبۆ چووە بۆ ئەم گەشتە**

**ئێمە ئاشق و سەودا سەرین لەدیمەشقدا**

**گیان بەخت دەکەین ئاشقی دیمەشقین**

**کەلەولاوە گزنگی دا**

**هەموو وشەو سەحەر و مەیخواردەی سەحەری دیمەشقین.**

**مەولانا لەدیمەشق کۆڕی سیماعی دامەزراند:**

**ئای چەند بەدواتدا دەگەڕێم لە**

**دەرگایەك بۆ دەرگایەك و**

**لەگۆشەیەك بۆ گۆشەیەك**

**ناچار لەدواکایە گەڕایەوە بۆ قونیە، دیسان خەریکی ئیرشادو ئامۆژگاری بوو، سیماعی لەقونیە دامەزراندجارێکی دیکە ئیشقی شەمس سەری هەڵدایەوە دیسان چووەوە بۆ دیمەشق. ئەوەشیان چوارەم جار بوو دەچوو بۆ دیمەشق. بەڵام ئەمجارە بەنائومێدی گەیشت.**

**ئەم گەشتانەی لەنێوان 645 و 647ی کۆچی دابوون لەوماوەیەدا (صلاح الدین) لەتەك مەولانا بوو ئەویش لە657ی کۆچی مرد.**

تاكە بەرهەمی دراوەتە پالْ شەمس بەناوی (مقالات)كە (119) لاپەڕەیە لەكتێبخانەی قونیەدایە، لەسەدەی حەوتەمی كۆچی نووسراوە،(المقالات) لەلایەن شەمس نەنووسراوە، بەڵكو لەلایەن كەسانی دیكە رووداوەكان باسكراوە.

پەروەردەو رێبەری:

مەولانا كەنائومێد بوو، گەڕایەوە بۆ قونیە، بنیاتی پەروەردەو ئیرشادی لەسەر بنچینەیەكی دیكە دامەزراند. ئەم قۆناغی شڵەژانە گەشتێك بوو بۆ تیشكی واتاو راستی.

لەساڵی 647ی كۆچییەوە تاكۆچی دوایی لە (672كۆچی) مەولانا خودا ناسی بلاْودەكردەوە. خۆی كاری ئیرشادی پێ نەدەكرا بەسەلاحەددینی سپارد، پلەی شێخ و ئیمامی پێ بەخشی.

شێخ سەلاحەددین زەركوبی قونیەوی:

سەلاحەددین فەرەیدون ماغنیان خەڵكی قونیە بوو، سەرەتا موریدی بورهانەددین محقق بوو. جارێكیان لەنوێژی هەینی مەولانای بینی باسی عیرفان دەكات جەزبەگرتی و دڵكێشی مەولانا بوو هاواری كردو بەسەری كۆتەوە كەوتە سەرپێی مەولانا ماچی كرد. بوو بە موریدی مەولانا، لەم قۆناغەدا بایەخی بەسەلاحەددین داو كردی بەشێخ و خەلیفەی خۆی و فەرمانی بەیارانی دا ملكەچی بن.سەلاحەددین زەرنگر بوو زانیاری ئایینی نەبوو بۆ نمونە دەیوت (قولف) لەبری(قفل) وای لێهات هەڕەشەی كوشتن لەویش بكەن تادەگاتە ئەو رادەی لەكتێبی (فیە مافیە) هاتووە

باسی موریدێك دەكات بەناوی (كوڕی چاوەش)كە موریدی سەلاحەددین بوو، لەحەسوودی دژایەتی دەكرد. هەتا فەرمانی بە سوڵتان وەلەد كرد ملكەچی بێت. تا ئەورادەی چەندان غەزەلی بەناوی وی داناوە، لەكۆتایی غەزەلەكە ناوی وی دەهات، نزیكەی (71) غەزەلی بەناوی ئەو داناوە. فاتیمە كچی سەلاحەددین درا بەبەهائەددین كوڕی مەولانا كەناسراوە بە (سوڵتان وەلەد) لەیەكەم رۆژ چەندان غەزەلی بۆ دانان. ئەم رووداوانە لەنێوان سالأنی 647ی ك و 657ی ك روویاندا.

مردنی شێخ سەلاحەددین:

بۆ دەساڵ سەلاحەددین لەخزمەت مەولانا دابوو، لەناكاو نەخۆش كەوت و بەو نەخۆشیە كۆچی دوایی كرد لەناشتنی سەلاحەددین، مەولانا هاوبەشی كرد بەشێوەیەكی سەرنج راكێش:

سەری خۆی كۆت كردبوو هاواری دەكرد، سیماعی بۆ كردو دەخولایەوە لەتەك بەهاء وەلەد نێژرا لەمانگی موحەرەمی ساڵی 657ی كۆچی نێژرا. مەولانا دەڵێت:

ئەی ئەو كەسەی لەكۆچی تۆ زەوی و ئاسمان گریان

دڵ پڕ لەخوێن بوو هۆش و گیان گریا

بەكۆچی دوایی سەلاحەددین دیسان گڕوتینی هەڵسایەوە، ئەمجارە ئاڕاستەی حوسامەددین حەسەن چەلەبی دەكات .

حوسامەددین حەسەن چەلەبی:

حوسامەددین حەسەن کوڕی محمد کوڕی حەسەن، مەولانا ناوی ناوە(مفتاح خزائن العرش) واتە کلیلی گەنجینەکانی عەرش و ئەمینی گەنجینەی عەرش  و بایەزیدی وەقت و جونەیدی زەمانی، لە بنجدا خەڵکی ورمێیە، خانەوادەکەی هاتبوونە قونیە، حوسامەددین لەم شارە لەدایك ببوو لەساڵی 622ی کۆچی، ناوی چەلەبی لەشیعرەکانی مەولانا بەوە ناسراوە . حوسامەددین نەوجەوان بوو باوکی مرد، ئەویش هەموو گرووپەکەی کەبە (رەند) (فتوە) ناسرابوون کۆکردەوەو هاتن بۆ لای مەولانا و ملکەچی فرمانەکانی بوون دوای کۆچی دوایی سەلاحەددین حوسامەددین کەوتە بەر دیدی مەولانا و کردیە پێشەنگی یارانی. هەرچی پارەو دیاری هەبوو هەموو دەنارد بۆ حوسامەددین چەلەبی، تا ئەو رادە متووی بوو بێ ئەو دڵتەنگ دەبوو ئەوەشیان لەمەسنەوی رەنگی داوەتەوە لەپێشەکی بەشی چوارەم دەڵێت:

ئەی رووناکی حەق حوسامەددین، تۆ

لەمەسنەوی مانگ پڕ نوورتری بەنووری خۆت

ویستت بەرزە، بەرتکای

دڵکێشی دەکەیت تاخوداوەند  دەزانێت

لەبەرئەوەی تۆ سەرەتای مەسنەوی

گەرستایشت بکات تۆ لەو زیاددەکەیت

لەبەرئەوەی تۆ وات دەوێت، خوداوەند

وای دەوێت، چونکە حەق ویستی موتلەقیان بەجێ دێنێت.

لەپێشەکی بەشی پێنجەمدا دەڵێت:

ئەی رووناکی حەق، ئەی حوسامەددینی مەزن

ئەی مامۆستای مامۆستایانی سەفا!

لەدواکایە حوسامەددین بوو بە شێخی خانەقای زیائەددین وەزیرو سەرجەم موریدانی مەولانا ملکەچی ئەوبوون.

سەرەتای دانانی مەسنەوی:

بەرهەمی ئەم پەیوەندیەی نێوان مەولاناو حوسامەددین دانانی مەسنەوییە، ومەزنترین بەرهەمی سۆفیگەرییە،موریدەکانی مەولانا خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکانی شێخ فەریدەدینی عەتار و سەنائی غەزنەوی بوون، کەچی مەولانا غەزەلیاتی بەرزی هەبوو و حووسامەددین بەدەرفەتی زانی بەمەولانای وت کتێبێك دابنێت وەك (الهی نامە) ی سەنائی (حدیقە الحقیقە)یان(منگق الگیر)، یەکسەر مەولانا لە جامانەکەی کاغەزێکی دەرهێنا هەژدە بەیتی یەکەم هۆنراوەی مەسنەوی تێدابوو (نامەی نەی)

بشنواز نی، چون حکایت میکند

ازجدایی ها شکایت میکند

تادەگاتە:

(پس سخن کوتاه باید، والسلام).

بەم شێوەیە دەریای ئەندێشەی مەولانا بەهۆش هاتەوە، خەریکی دانانی مەسنەوی بوو بەشەو حوسامەددین دادەنیشت لەگەڵ مەولانا، مەولانا مەسنەوی دادەناو حوسامەددینیش دەینووسی، دواتر بەدەنگی بەرز بۆی دەخوێندەوە، هەندێ شەو تابەیانی لەنووسین نەدەکەوت. مەسنەوی

**لەسەر وەزنی (فاعلاتن) شەش جار دووبارە دەبێتەوە، لەهەر بەیتێکدا،بەلاَم لەکۆتایی هەرنیوە بەیتێکدا (نون) هەڵدەگیرێت واتە دەبێتە (فاعلات).[164]**

**کەبەشی یەکەم تەواو بوو خێزانی حوسامەددین کۆچی دوایی کرد، شڵەژا مەولاناش ئەو رووداوە کاری تێکرد نووسینی مەسنەوی دوو ساڵ وەستا تادووبارە خۆی داوای کرد بەردەوام بن لەنووسینی مەسنەوی .**

**بەشی دووەم لەساڵی 662ی کۆچی دەستی پێکرد لەبەشی دووەمی مەسنەوی ئاماژەی بەو مێژووە داوە. دەبێ بەشی یەکەم لەنێوان دووساڵی 657-660ی کۆچی بووبێت.**

**لەساڵی 662ی کۆچی تابەشی شەشەم تەواو بوو لەو پازدە ساڵەی دوایی مەولانا هێمن بوو تاکۆچی دوایی کرد.**

---

[164] -ادوارد جرانڤیل –تاریخ الادب–سەرچاوەی پێشوو،ل655.

**کۆچی دوایی مەولانا:**

**مەولانا ناکاو تووشی تایەکی بەگوڕهات، هەموو پزیشکان هەوڵیاندا بێ سوود بوو لەکۆتاییدا لە ڕۆژی یەك شەم پێنجی مانگی جەمادی ئاخەری ساڵی 672ی کۆچی بەرامبەر 17ی دیسێمبەری 1273ی زایینی، لەشەست و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. لەو مەزارگەیەدا نێژراوە کەلەقونیەدایە. لەسەر مەرقەدەکەی ئەم بەیتە شیعرە هەیە:**

**بعد از وفات تربت مادرزمینی مجوی**

**در سینهای مردم عارف مزار ماست**

**واتە: ئەی ئەو کەسەی بەدوای مەزارگەکەمان دەگەڕێت کاروان بەکاروان.گۆڕی ئێمە لەسینەی پیاوە عارف وحەقناسەکاندایە.**

**لەرێورەسمی ناشتنی سەرجەم قونیە بەموسڵمان و جوولەکەو مەسیحی گەورەو بچووکەوە ئامادەبوون.**

**شێخ سەدرەدین نوێژی لەسەرکردو چل ڕۆژ پرسەی بۆداندرا، دواتر گومبەتێکی مەزنیان لەسەر قەبرەکەی دروست کرد ناونرا (گومبەتی سەوز)، هەمیشە مەسنەوی خوێنێك لای قەبری مەولانا ئامادەبوو. بەم جۆرە لە (باغی سوڵتان)و (ئیرەم باخچە) سەری نایەوە.**

**وشەی مەولەوی :**

**وشەی مەولەوی، لەوشەی (مولاناء روم) پەیدابووە کە گۆڕاوە بۆ مەولەوی.**

**کۆنترین بەڵگەی وشەی مەولەوی تێدابێت ئەم بەیتەی خوارەوەی شاە قاسم انوار (لە 835ی کۆچی مردووە) دەڵێت :**

**جان معنی قاسم ار خواهی بخوان**

**مثنوی معنوی مولوی**

**واتەی ئەی قاسم گەر گیانی مەعنەویت دەوێت، مەسنەوی مەولانا بخوێنە.**

**وشەی مەولەوی بوو بەنازناوی رێبازێکی سۆفیگەری ئەمڕۆ زیاتر رووێکی گەشتیاری هەیە. سوڵتانی عوسمانی کەهاتە سەر تەخت شمشێرەکەی ئەویان بۆ سوڵتانەکانیان دەبەست. ئەتاتورك لەساڵی 1926 نەیهێشت ناچار چوون بۆ حەلەب.**

وەرگێرانی بەرهەمەکانی رۆمی بۆ زمانی ئینگلیزی:
جەلالەددینی رۆمی لەنێو شاعیرە فارسی زمانەکان لەهەموان زیاتر ئاوڕی لێ دراوەتەوە بۆ وەرگێرانی بەرهەمەکانی. سەرەرای (نامەی نەی) کەلەلایەن (ئی.ھ. پالمرE.H.Palmer) کراوەتە ئینگلیزی, دەفتەری یەکەمی مەسنەوی کراوەتە ئینگلیزی لەلالایەن (سیر جیمس ردهاوس Sir James Redhouse) لەلایەن (تروبنر Trudher) لەکۆمەڵەی رۆژهەلاتیدا بلاوکراوەتەوە (Messrs Trudherو Oriental series )هاوکات هەڵبژاردە شیعرەکانی بەپەخشان وەرگێردراوە لەلایەن (ئی .ھ.هوینفلدE.H.Whinfiad) رۆژهەلاتناسی ئینگلیزی بەناوبانگ نیکلسون بایەخی بەجەلالەددینی رۆمی داوەو کتێبە بەناوبانگەکەی ((مەسنەوی)) وەرگێڕاوە و بۆ ماوەی سی ساڵ خەریکی بووە مستر نیکلسون R.A.nicholsonلەکامبریدج ساڵی 1898 هەڵبژاردە لە هۆنراوەی دیوانی شەمسی تەبریزی کردە ئینگلیزی.
لەبارەی شیعرەکانەوە رۆژهەلاتناسی ئەڵمانی پرۆفیسۆر (ئەناماری شیمل 1922-2003ز)دەڵێت: ((شیعرەکانی لەپۆپەی وەجدو شادی و چێژدان، هۆنراوەکان پڕن لەمۆسیقاو جوانی و داهێنان، هەرچەند خۆکارانەن))
لەساڵی 1995 هۆنەری ئەمەریکی کارمان بارکس کتێبە بەناوبانگەکەی ((رۆمی دانسقە))The Essential Rumi ئەو پڕووشکە بوو وایکرد ئەمەریکا بایەخ بەرۆمی شاعیری فارسی زان بدات. وەك چەندان سەرچاوە ئاماژەی پێدەدەن، فرۆشتنی دیوانەکانی جەلالەددین رۆمی بگاتە ئاستێك زیاتر بێت لە فرۆشتنی دیوانی شاعیرانی دیکەی ئەمریکا.

ڕۆمی بووەتە پردی نێوان ئەمەریکا و ئیسلام. شاعیری ئەلمانی هانز ماینکی دەڵێت: شیعری ڕۆمی(( تاکە هیوایە لەو ڕۆژگارە تاریکەی تیایدا دەژین)) .

لەرۆژهەلأتدا محمد ئیقبالی شاعیر بایەخی پێداوە، د.محمد عەبدولسەلام کەمافی کتێبی مەسنەوی وەرگێڕا بەلێکۆڵینەوەیەکی گەورەوە.

عەبدولرەحمانی جامی (1416-1492) سەبارەت مەولانا دەڵێت: ((پێغەمبەر نەبوو بەلأم کتێبی بۆ هاتبوو)).

نیکلسون دەقەکە بنچینەکەی بلأوکردەوە سەرەرای پێشەکی و تێبینی.

**R.A.Nicholsen-from the Drani shass-i- Tebriz, can bridge 1898**

لەپێشەکی ئەم وەرگێڕانەیدا ئاماژەبەوەدەکات کەوا پەیوەندی هەیە لەنێوان (سۆفیە موسڵمانەکان) و(ئەفلاتوونیەتی نوێ) لەئەسکەندەریە. و(ژو النون المصری) بەگەوی پەیوەندی دادەنێت بۆئەم کارە. واتە ئەڵقەی پەیوەندی سۆفیگەریە بە فێرگەی فەلسەفە لەئەسکەندەریە.[165]

---

[165] -ادوارد جرانڤيل براون: تاريخ الادب في ايران من الفردوس الى السعدي, ترجمة: د.ابراهيم امين الشواربي, مطبعة السعادة بمصر-1373ك-1954م.

**بەشی سێیەم:**

**سۆفیگەری لای جەلالەددینی بەلخی ناسراو بەرۆمی :**

**سەنائی، دەڵێت : برایەکەم گەر لێم بپرسێ نیشانەکانی ڕێگای سۆفیگەری چین بەئاشکرا پێت دەڵێم سۆفیگەری راستەقینە تەنیا بەدوو ڕێگا دەبێت:**

1- **پابەندبوون بەشەرع و گەڕان بەدوای واتای شاراوەوناخ وناوەوەی، شەریعەت پەیوەستە بەزاهیرو وکاری پەرستش کەچی راستی پەیوەستە بەدیدگای ناوەوەیی مەزنی خوداوەند ... شەریعەت خەڵك هاندەدات بۆ پەرستن، کەچی راستی هانت دەدات بۆ بیرکردنەوە لێی، شەریعەت بۆ ملکەچی بوو نەك بۆ بەجێهێنانی فرمانەکان، کەچی راستی وادەکات تێی بگەین.**

**رۆمی خۆی لەمەسنەویدا ئەو پەیوەستییەی سەلماندووە، پەیوەندی نێوان شەریعەت و حەقیقەت، وتویەتی: (( شەرع وەك چرایەکە ڕێگا رووناك دەکاتەوە، گەر چرات پێنەبێت ناتوانیت بەرێدا بڕۆیت، کەلە ڕێگادا دەڕۆیت لەم گەشتەت ڕێرەوە (تەریقەتە) کە دەگەیتە ئامانج واتە گەیشتوویتە راستی))**

**کەواتە: ڕێرەو (تەریقەت) ڕێچکەیەکی تەسك، ژمارە یەکی کەم لەسەری دەڕۆن کەدەیانەوێت پلەو پایەیان بەرزبێت، وەك مرۆڤی کامل-تەواو)) بەگشتی، بەهۆی ئەوەی تاکەکەس سروشت و پەروەردەو کەسایەتی جیاوازیان هەیە، توانای گیانیان جیاوازە،**

دەتوانین بڵێین بەژمارەی ئەو کەسانەی ئەم ڕێبازە دەگرن راڕەو هەن (ترقیە).

هەنگاونان لەراڕەودا:

جەلالەددین رۆمی دەڵێت سەرەتای رێگا، پێویستی بەگۆڕینی پێزانین، زانین هەیە، پێویستی بەپرسین هەیە. گەڕان بەدوای دەوڵەمەند کردنی ئەزموونی گیانی سۆفی، بەرز بوونەوەی گیان بەرەو خوداوەند ، ئەوەتا لەم بارەوە دەڵێت: ((لەوترویکەی هاتیتە ئەم دنیایە پەیژەیەکت بۆ داندراوە بۆ رزگاربوون، تۆنەبوویت بە رووەك، دواتر بوویت بەئاژەڵ، چۆن دەتوانیت ئەوە فەرامۆش بکەیت.

دواتر بوویت بەمرۆڤی بەهرەمەند وهۆشمەند و باوەڕدار. بڕوانە ئەم جەستەیەی لەخۆڵ دروستکراوە چ تەواویەکی هەیە کەلەمەرجی مرۆڤ بوون رەت دەبێت بێ گومان لەم جیهانە نامێنێت لەئاسمان دادەبێت لەرارەوی مەولەوی بۆ ماوەی سێ ساڵ نۆکار لەمەشق دادەبێت، گەر هەموو داواکاریی شێخی جێبەجێکرد دەبێتە ئەندام. نۆکار ساڵی یەکەم خزمەتی خەڵك دەکات، ساڵی دووەم خزمەتی حەق، ساڵی سێیەم چاودێری دڵ. لەخزمەتکردنی خەڵکدا شکستی خودە واتە دەبێ خەڵك لەخۆی باشتر بزانێت، بە ئەرکی خۆی بزانێت کە خزمەتیان بکات. لەخزمەتکردنی حەقدا دەبێت واز لەهەموو خواست و داوایەکی خۆی بهێنێت لەم ژیانەدا یان لەداهاتوو واتە خوداوەند بپەرستێت لەبەرخۆش ویستنی خوداوەند .

چاودێری دڵ کردن، ئەو کاتە دەبێت کە هزرو بیری کۆکاتەوە، لەهەموو شتێك وازبێنێت تەنیا لەدڵدا لەدوان دابێت لەگەڵ خوداوەند .

هەڵمەتەکانی فەراموش نەهێڵێت. لەو کاتەدا دەتوانێت پۆشاکی سۆفی بوون بپۆشێت.

ئەزموونی رێگا:

لەماوەی ئەم ئەزموونەدا، قۆناغ بەقۆناغ، دەبێت خاوەن: خاکەرایی، خۆشەویستی، دڵسۆزی بێت. سەرچاوەی ئەوەش لەوەدایە تاکایەتی خوداوەند ی لەبەرچاو بێت گەر خاکەرایی واتای شکست هێنانی شتێك بێت لەرووی دەروون، ئەوا خۆشەویستی گیانی وادەکات یەکەتی لەگەڵ خەڵك دروست بکات. دڵسۆزی یان راستگۆیی پۆپەی دوونەریتی دیکەن.

دڵسۆزی واتە شت وەك خۆی، لە راستەقینەدا داببینی .ئەم بەهایانەش وەك حاڵ وایە گۆڕاندان، لەهاتن و چووندان، بەڵام پێگەکان جێگیرو چەسپاون حاڵ بەخشراون، پێگە دەردەست کراوە. بەم جۆرە بەچەندان حاڵدا دەروات تادەگاتە پێگەی ئیحسان.

زیکری خوداوەند :

نزیکی لەخوداوەند بەرنامەی سەرەکی سۆفیگەرییە، بەنزایەك پێکدێت بێ وەستان و بەردەوام، جگە لەنوێژ، رۆمی لەمەسنەوی دەڵێت: (( مورید پێویستە لەخەڵوەتدا زیکری خودا بکات تاهەموو بوونی دەبێتە نوێژ، زیکر تەوەرەی سەرەکی سۆفیانەیە، نزا لەئەسڵدا

زیكری خوداوەند یە، خوداوەند  دەفەرموێت : ((فاذكروني اذكركم)) هەروەها ((الا بذكر الله تطمئن القلوب)) بەپێی پلەی مورید زیكری بۆ دیاری دەكرێت، دەشێ تاكەكەس بێت یان بەكۆمەڵ، دەروێشەكان لەدەورەی شێخەكەیان دادەنیشن، دەست بە قورئانی پیرۆزخوێندن دەكەن، دواتر هەندێ هۆنراوەی سۆفیگەری، نای لێدەدرێت، ناوە جوانەكانی خوداوەند  دێنن، هەندێ لەسۆفیەكان حاڵ دەیانگرێت دەست بە سەما یان سەماع دەكەن، لێرەدا مۆسیقا رۆڵێكی گرنگ دەبینێت لەگەیشتنە ئەو حاڵەدا.

خۆشەویستی و كۆتایی رێگا:

لەسۆفیاتیدا هەموو شتێك لەسەر خۆشەویستی دامەزراوە، رۆمی دەڵێت: خۆشەویستی ئەو گڕەیە كە دادەگیرسێت هەموو شتێك دەسووتێنێت،عەتار دەڵێت : خۆشەویستی سێ رێگای هەیە : ئاگر، فرمێسك، خوێن. خۆشەویستی گیانی گەردوونە، هۆی خۆشەویستی تاسەی مرۆڤە بۆ گەڕانەوە بۆ بنج و سەرچاوەی بوونی.

مۆسیقاو سەماو خولانەوەی ئەستێران وجووڵەی ئەتۆم، بەرزبوونەوە لەسەر پەیژە بوون، لەبێگانەوە بەرەو رووەكی، و لەئەزەلییەوە بەرەو مرۆیی و پەری ودواتر، هەمووی سەرچاوەكەی خۆشەویستییە، خۆشەویستی رێگای دۆزینەوەی نهێنییەكانە. گیان، كەلەكاكڵی راستەقینەی خۆی دوورخرایەوە ئارەزووی گەیشتنیەتی بەسەرچاوەكەی، تادەگاتە پلەیەك ئاشق و مەعشوق دەبنە یەك، رۆمی

دەڵێت: ((خۆشەویستی هات،کەوتە لەرەگەکانم لەخوێنم، لەناوی بردم، پڕ ئیشقی دڵخوازی کردم، دڵخواز تێکەڵ بەهەموو خانەکانی جەستەم بووە. لەمندا تەنیا ناو ماوە، هەموو شتێکی دیکە ئەوەئەو. رارەوی خۆشەویستی لەسۆفیاتیدا، سۆفی دەگاتە پلەی مرۆڤی تەواو یان مرۆڤی گەردوونی، کە دڵی گەردوونە، واتە دەتوانێت ئەو گەنجینە شاراوەیە بدۆزێتەوە لەخۆیدا کە لە دەرەوە بەدوای دەگەڕێت.

بەرنامەی پەروەردەکردن:

بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە (گەیشتن بە رۆشنی=کشف) کەتاکە زانینی راستەقینەیە، بەرنامەی هەیە بۆ گەیشتن ویارمەتی دانی بۆ لەدایك بوونی ((گیانی شاراوە لەدەروونی ناوەوەی)) ئەوەشیان جەلالەددین ناوی نا ((مرۆڤی بچکۆڵە، یان هەژار، یان گیانی بالاّ، کەلەراستیدا زۆر قووڵە.

بیستن /سیماع:

نەریتێکی ئاینییە، ئەوکەسە تووشی حاڵەتێك دەکات، بتوانێت ئەو بانگەوازە ئەزەلییە ببیستێت بانگەوزای ئەلەست.

سیمبولکاری:

لەم ئاستەدا دەبێت ئاسانکاری بۆ مورید بکرێت، لای جەلالەددین:
دەروونەکان لەئاستی جیاوازن بەپێی یادەوەریان —بۆ ئەو رۆژەی
سەرجەم بوونەوەران لەجیهانی گیاندا یەك بون-سەمای ئاسمانی
پەیوەستە بەم یادەوەرییە،
رۆمی دەڵێت: (( گیانت کە گیانی من بەتەواوی دەناسێت،
هەردووکیان یەکدیان لەیادەو بیریان دەکەوێتەوە کەلەرابردوو یەك
گیان بوونە، ئەو دەروونەی لەدنیادا (تسبح الله) لەوە تێدەگات، لەبەر
ئەوەی  لەبوونی یەکەمیدا وایکردووە بەم کارەی، دەروونەکانی
دیکەش واداری رۆژی بەیەك گەیشتنی یەکەم دەکات. لەم بارەیەوە
خوێندنی قورئان، هێزێکی گیانی بە سۆفی دەدات، رۆمی دەڵێت:
((مەسنەویم دانەناوە لەبەری بکەیت و بیلێیتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە
بیخەیتە ژێر پێت بۆ ئەوەی بتوانیت بۆ بالاً بچیت بفڕیت)).
مەسنەوی پەیژەی بالاًچوونە بەرەو راستی.
رۆمی دەڵێت:
(( راستی(حەقیقەت) باسی خۆی کردووە بە زاهیرو باتین، دنیا
ئەفراند وەك زاهیرو باتین، لەرێگای ناوەوەمان لەحەق دەگەین،
رواڵەتیش بەزاهیر)).
سۆفی بۆ گەیشتنە دەرکەوتنی(تەجەلی) خوای تەعالا بەهۆی ئەوەی
پێویستی چاوی پاکی پێویستە، ئەوچاوەی گەردوون وەك کتێبێکی
راستی بالاً. تەنیا ئەو دڵەی بەکۆشش جۆشی دراوە دەتوانێت سیفەتی
خوداوەند یی تێدا ببینرێت.

**رۆمی دەڵێت: دڵم وەك ئاسمان سافە، لەئاوێنەی ئاودا، تیشکی مانگ تەکدەداتەوە. کاریگەری گوناه لەدڵدا، وەك ژەنگ وایە لەسەر کانزا هەوڵ و کۆشش وەك مشت وماڵ (صقل) کردنەوەی وایە، دڵی پاك و ساف لەخۆشەویستی دنیا و خۆشییەکانی، دەتوانێت خوداوەند وە بیر خۆی بێنێتەوە. بەم جۆرە بوون دوورایيەکی دیکەی هەیە،ئامانجێکی بنچینەیی دیکە دەداتە ژیان، وئەویش ئارەزوو (حنین)ی گەڕانەوە بۆ حاڵەتی گیانی یەکەم و گەیشتن بە زانینی راستەقینە و گشتی.سۆفیگەری گەر رێگەیەکی خۆیەکی بێت بۆ تەواوکردنی رەوتی گیان و پاك کردنەوەی لەهەمان کات بایەخدانە بەجوانی بەرجەستەیە: لەفەرموودەدا: خوداوەند جوانە، هەموو ئەوەی جوانە خۆشی دەوێت)) ئیبن عەرەبی دەڵێت: گەر خوداوەند وێنەی جوانی خۆش بوێت، لەبەر ئەوەی رەنگدانەوەی جوانی ئەوە، هەروەك چۆن بوون دەداتەوە.**

رێبازی مەولەوی لە **بیستن**

**لەدوای مردنی کوڕە گەورەی رۆمی. سوڵتان وەلەد ئەم سەمایەی داهێنا کەناسراوە بەسەمای (بیستن) یان(سماع) .**

**-قونیە تەکیەی سەرەکی تێدابوو، -لەشوێنەکانی دیکە تەکیە هەبوو سوڵتان و و میرەکان تەکیەیان دروست دەکرد. لەسەدەی دەی هیجریەوە، لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی سێیەم گەیشتە چلە پۆپە.**

ئەندامانی جیاوازیان لەنێوان ئایینەکان نەدەکرد، بەکۆمەڵ دەچوون بۆ لادێکان بۆ یارمەتی دانی هەژاران و کۆڕی بیستەنی (سماع) گێڕان.
لەسەدەی دەی هیجری کەوتە ژێر دەستی ئەولیاکان کە سەربە سوڵتان بوون.
لەسەدەی هەژدەم مەولەوی بەشێك بوو لە دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانی.
لەساڵی 1925 ئەتاتورك هەموو رێبازەکانی سەر کوت کرد، دواتر مەولەوییەکان چوون بۆ حەلەب لەتورکیاش زۆربەی تەکیەکان کرانە مۆزەخانە.
رێبازی مەولەوی لە پانتاییەکی گەورە بلأوبۆوە.لەگەڵ ئەوەیشدا شاعیری مەسنەوی بەناوبانگ پەیدا دەبوون  وەك:
-ئیبراهیم بەگ، سوڵتانی دیوانی، ئەرزی و دیدی، شێخ غالب... هتد
-لەتەك ئەوەدا مۆسیقای مەولەوی بلاّوبۆوە.
-مۆسیقای بیستەنی (سەماع) کاریکردە سەر نیگارو وێنەش .
سەماع یان سەمای گەردوونی دەروێشە خولاوەکان، کەلە بەناوبانگ ترین رێبازی مەولەوی بوو. ئەوەشیان تەڤسێکە هێماو سیمبولکاری تێدایە:
-جلی سپی (کراسی سپی) کەسەماکار لەبەری دەکات هێمایە بۆ (کفن)
-پاڵتۆیە رەشەکەش نیشانەی گۆڕە
-رایەخە سوورەکە هێمای رەنگی رۆژ (خۆرە) لەئاوابووندا.
-سێ خول دەورەی مەیدانەکە نیشانەیە بۆ سێ قۆناغ لەنزیك بوونەوە لەخوداوەند

:1- ڕێگای زانست،2- ڕێگای دیدگا، 3- ڕێگای گەیشتن (وصال).

-کەوتنی پاڵتۆرە ڕەشەکان نیشانەی ڕزگار بوونە، پاك بوونەوەیە لەجیهان.

-تەپڵەکان، دەهۆڵەکان، دەنگی کەرەنایە لەقیامەت.

-خولی سەماکاران دابەشی سەر دوونیووە بازنە دەکرێ، یەکێکیان هێمای کەوانەی داکشانە ودواکەوتنی گیانە بۆ مادیات، ئەوەی دیکە هێمای هەڵکشانی گیانە بۆ هەڵکێشان بەرزبوونەوە، واتە کەوانەکە هێمایە بۆ بەرزبوونەوەی گیان بۆ ئاسمان.

-خولانەوەی شێخ لەناوەندی بازنە هێمایە بۆ خۆر و تیشکەکانی خولانەوەی دەروێشەکان لەدەوری گۆڕەپانەکە هێمایە بۆ یاسای گەردوونی و، هێمایە بۆ خولانەوەی هەسارەکان لەدەورەی خۆر و ناوەندەکەی .

**- مەسنەوی :**

تایبەتمەندییەکانی مەسنەوی:

**شیعرەکانی تایبەتمەندی ئەدەبی سۆفیگەری تێدایە، هەموو پێکهاتەو توخمە ئەدەبیەکانی تێدایە سەرەڕای بەگوڕ هەڵرژانی سۆز، یان جۆشی سۆزو دەروون لەشیعردا دەربڕین، بەڵام جۆری ئەندێشەکاری و ڕەسەنایەتی شیعرەکانی، قووڵایی هەست و ڕەسەنی هزرو ڕاستگۆیی تێدا بەرجەستە بووە.لەتەك ئەوەشدا فرەوانی لەزانست و وێنەی شیعری شکۆدارو مەزن و جوانی و داهێنان لەدەربڕیندا.**

**شیعر هۆنەرێکە لەچینی یەکەم دەربڕینی بەهێزە، ئەندێشەی لەبن نایە، داهێنەرە لەوێنە نواندن، یەك واتە بەچەندان وێنە دەخاتە ڕوو، توانای لەیەك هەڵێنجانی واتاو بەردەوامبوونە، دەربڕینی هزری پەیوەست بەیەك، بەتوانا لەهەڵبژاردنی بێژەو وشەو لەزمان و کۆنتڕۆڵکردنی وشە مەسنەوی چڵە پۆپەی توانای شیعری ڕۆمی دەخاتە ڕوو. مەسنەوی لەشەش بەرگی گەورەدا نوسیویەتی (25649) بەیتی شیعری تێدایە، بۆ زۆرزمانی جیهانی ئەمرۆ وەرگێڕدراوە وەك: ئینگلیزی، تورکی فەڕەنسی عەرەبی....هتد. خۆی بەفارسی دایناوە. کتێبێکە لای سۆفیەکان پایەیەکی گەورەی هەیە.**

**شاعیریەتی جەلالەددین ڕۆمی لەمەسنەویدا دەگاتە چڵەپۆپە، مەسنەوی لەرووێکدا ڕافەو لێکدانەوەی قورئانی پیرۆزو شەریعەتە، بەئامانجی**

پەروەردەکردنی موریدانی. رۆشنبیرییەکی گەورەی تیادا نواندووە، هزرو بیری مرۆڤدۆستانەی مەزنی تێدایە. لەم بەرهەمەدا هونەری چیرۆك گێڕانەوەی تێدا بەکارهێناوە لەبزاڤ و پێشڤەچوون و گفتوگۆی کەسایەتییەکان( کارەکتەرەکان) کەمتر نییە لەچیرۆکی هاوچاخ .

1- چیرۆك /هونەری چیرۆك گێڕانەوە.
2- کەسایەتی ودیالۆگ.
3- بابەتی سەرەکی چیرۆکێکی سیمبولییە سەبارەت بە ((بولبول و گوڵ))

ئەوەشیان هێما و سیمبولێکی باوە لەئەدەبی رۆژهەلأتدا، بولبول هێمایە بۆ ئاشقی جگەر سووتاو وگوڵیش هێمایە بۆ دڵخوازو مەعشوقی بالأ، یان خوداوەند . ئەو بنەما هزریە لەسۆفیگەرییە مەزنەی بەرجەستە دەکرد کەدەڵێ : ((ژیان لەخۆشەویستییەوەیە)) . جەلالەددین دەیوت و حوسامەددین دەینووسی و بەدەنگی بەرز دەیوتەوە. تیایدا بەردەوام بوو تا لەساڵی 672ی کۆچی /1273ز کۆچی دوایی کرد.

- وشەی مەسنەوی واتەی (دوو واتایی) (مزدوج) (دووبەیت) دەگەیەنێت، پشت بەیەکێتی سەروا دەبەستێت  لەنێوان هەردوو نیوە بەیتدا، هەربەیتێك سەروای تایبەتی خۆی هەیە، بەم جۆرە لەکۆت و یەك سەروایی رزگار دەبێت، ئەم فرە سەرواییە وای کردووە هۆنەر لەشیعری فارسیدا بتوانێت داستانی گەورە لەسەر کێشی عەرەبی دابێنێت، تادوورترین مەدای بیەوێت بڕوات . ئەم

کتێبە شەش بەرگەو نزیکەی 25000بەیتی لەخۆ گرتووە,
ناوەکەی پەیوەستە بەسەرواکان  وشە ناوێکی شێوەییە.ئێرانیەکان
زۆر رێز لەم کتێبە دەگرن. جەلالەددین لەپێشەکی مەسنەویدا
بەعەرەبی دەنووسێت :

- (( هذا الكتاب المثنوى، وهو اصول اصول الدين وفي كشف
اسرار الوصول واليقين، وهو فقه الله اكبر، وشرع الله الازهر،
وبرهان الله الاظهر، مثل نوره كمشكاة فيها مصابح ... وهوجنان
الجنان. ذو العيون و الاغصان ... الابرار فيه ياكلون ويشربون،
والاحرار فيه يفرحون ويطربون، وهو كنيل مصر شراب
للصابرين، وحسن على ال فرعون والكافرين))
- واتە : ئەمە کتێبی مەسنەوییە، بنجی بنجی بنجەکانی ئاینەو
لەنهێنەکانی گەیشتن و دڵ ئارامی (یقین)، دانشگەرایی خوداوەند
ی گەورەیە شەرعی خوداوەند ی هەرە گەشاوە، بەڵگەی خوداوەند
هەرە بەرچاوە، رووناکی وەك رووناکی چراە کەلە شوشە   دابێت،
دەدرەوشێتەوە لەدرەوشانەوەی بەیانیان زیاترە... باخچەکانی
بەهەشتە، پڕ کانی و چڵ... مرۆچاکەکان تیایدا دەخۆن و
دەخۆنەوە، ئازادان تیایدا خۆشی بەسەر دەدەن و خۆشحاڵ دەبن
وەك نیلی مصرە شەرابێك بۆ خۆراگران، بۆ بنەماڵەی فیرعەون و
کافران زوخاوە.

مەسنەوی دەقێکی نەمری ئەدەبیە، دەگاتە ئاستی دەقە نەسریە
جیهانییەکان, شیعر تیایدا  دەگاتە ئاستی جیهانی و دەگمەنی,

بابەتەکەی باسی لەبوون ومرۆڤ و ژیان دەکات.مەسنەوی سەبارەت بەچەندان چیرۆك و بەسەرهاتە وەك وئاماژەو رەمز بەکارهاتوون، بۆ مەبەستی دوور و قووڵی فەلسەفی یان بەئامرازی فێرکردن و پەروەردە کردن. کەرووداوێك، چیرۆکێك باسی دەکات دەگەڕێتەوە ئەم پەندە لەم چیرۆکە وەردەگرێت، ئایەتی قورئانی پیرۆزدێنێتەوە راڤەی دەکات، یان فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لەبارەی هەمان مەبەست بۆ راو بیر دەربڕین لەبارەی مەسەلەیەك بەم شێوەیە تادەگاتە کۆتایی شایانی باسە جەلالەددین لەمەسنەویدا 1281 بابەتی باس کردووە . لەتەك ئەوەی مەسنەوی پاشماکێکی هونەری مەزنە، سەرچاوەیەکە بۆ ئاگاداربوون لەبەها مرۆییەکان، ئاگادارییەکان کەلەم شارستانیەدا دروست بووە. لەتەك ئەوەشدا گیانی پڕ لەهەستی راستەقینەو رەسەنی شاعیر دەردەکات، پڕ سۆزی، هۆشی و ئاوەزی مامۆستاو دەروون پاکی پێشان دەدات، کەدەتوانێت دەروون پاکی بداتە کەسانی دیکەو خۆشی و بەختەوەریان پێ ببەخشێت لەگەڵ خۆیان بەرەو ئاسۆی هێمنی و دامان بەرێت، بەرەو هزری بالآیی بەکاردێت، یارمەت بدات بەرەو ئامانجی بالآ تر لەو ئامانجە ماددیانەی مرۆڤ لەم ژیانە بۆی ماندوون .

مەسنەوی

بەشاکاری (نەی نامە) دەست پێدەکات

(نەی نامە)

((بشنوا ازنی، چون حکایت میکند

واز جدائی ها شکایت میکند))

لەنەی ببیستە باس لەچی دەکات

سکاڵای دەردی جودایی دەکات

((کزنیستان تامرا ببریدە اند

درنفیرم مردو زن نالیدەاند))

هەر لەنەیستان منیان دابڕاند

لەهەنیسکم ژن وپیاو ناڵاندیاند

(( سینە خواهم شرحەشرحە از فراق

تابگویم شرح درد اشتیاق))

سینەیلەت لەت لەجوداییم دەوێ

بۆی بکەم راڤەی دەردی خوازیاری

((هرکسی کاو دورماند از اصل خویش

باز جوید روزگار وصل خویش))

هەرکەسێ لەبنج دوورکەوێتەوە

هەمدیسان رۆژێ پێیدەگاتەوە

(( من بەهر جمعیتی نالان شدم

جفت بدحالان وخوش حالان شدم))

لەگەڵ هەمووان من بووم دەمناڵان

دەمکرد هامشۆی بەدو خۆشکاران

(( هرکسی از ڤن خود, شد یار من

از درون من نجست اسرارمن ))

هەر کەسێ وایزانی ئەو یاری منە

پەی نەبرد بەنهێنی دەروونی منە

(( سر من از نالەم دورنیست

لیك چشم وگوش را ان نورنیست))

نهێنیم لەناڵەم دوور نییە

بەڵام ئەو نورە لەچاووگوێدا نییە

((تن زجان و, وجان  ز تن مستور نیست

لیك کس رادید جان دستور نیست))

تەن لەگیان و گیان لەتەن هیچ ون نییە

کەچی کەس مۆڵەتی بینینی نییە

(( اتش است این بانگ نای و, نیست, باد

هرکە این اتش ندارد, نیست باد

ئاگرە ئەم بانگی نەیە نەوەك با

ئەوەی ئەم ئاگرەی نییە ئەوە با

**اتش عشق است کاندر نی فتاد**

**جوشش عشق است کاندر می فتاد))**

**ئاگری ئیشقه  لەنەی بەربووه**

**جوششی ئیشقه مەی گرتۆتەوه**

**نی حریف هرکه از یاری برید**

**پردەهایش پردەهای مادرید))**

**نەی هاودەمی ئەوه کەله یار دابڕی**

**به پەردەکانی پەردەکانی مەی بڕی**

**((همچو نی زهری وتریاقی که دید؟**

**همچو نی دمساز ومشتاقی کەدید؟))**

**وەك نەی ژەهرو دەرمان کواهەیه**

**چۆن نەی هاودەم وتاسەبارکێ هەیه**

**((نی حدیپ راه پرخون میکند**

**قصه های عشق مجنون میکند))**

**نەی ڕێی پڕ خوێن باس دەکات**

**کۆچیڕۆکی ئیشقی مەجنون باس دەکات**

**(( محرم این هوش، جز بی هوش نیست**

**مر  زبان را مشتری، جز گوش نیست))**

**تەنیا بێهۆشه بۆ ئەم هۆشه رازداری**

**بۆ زمان تەنیا هەر گوێیه کڕیاری**

**(( در غم ماروزها بیگا ه شد**

